# ویل دیورانت

# مێژووی شارستانێتی

بەرگی یەکەمی
چاپی کوردی




وەرگێرانی:

ئازاد بەرزنجی
نەبەز کەمال نوری
دانا ئەحمەد مستەفا



سەرچاوەی سەرەکیی ئەم وەرگێڕانە:

ول ديورانت ، قصة الحضارة

ترجمة: د . زكي نجيب محمود

محمد بدران

مكتبة الأسرة ٢٠٠١

شركة نهضة مصر للطباعة والنشر

---


ناوی کتێب: مێژووی شارستانێتی

نووسینی: ویلّ دیورانت

بابەت: لێکۆڵینەوەی مێژوویی

وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجیو نەبەز کەمال نوری و دانا ئەحمەد مستەفا

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق

تیراژ: ٤٠٠٠ دانە

نرخ: ٢٥٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ١٠٢٤ ی ٢٠٠٦

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

کوردستان -سلێمانی

www.sardam.info

ویلّ دیورانت

# مێژووی شارستانێتی

-بەرگی یەکەمی چاپی کوردی-

وەرگێڕانی

ئازاد بەرزنجی

نەبەز کەمال نوری

دانا ئەحمەد مستەفا

سلێمانی ٢٠٠٧

## پێشەکیی چاپی کوردی

ڕەنگە دەست بردن بۆ کتێبی سەرگوزشتەی ژیاری، دانراوە پڕ بەپیاخەکەی ویلٚ دیورانت کەبەیەکێك لەگرنگترین دانراوەکانی سەدەی بیستەم دەژمێردرێت، جەربەزەییەکی زۆری بوێت، تەنها لەبەر قەبارەی کتێبەکە تا کەلەچاپە عەرەبییەکەیدا خۆی دەدات لەنزیکەی (١٨٠٠٠) لاپەڕە، بەڵی هەژدە هەزار لاپەڕە.. بەڵکو لەبەر بایەخی مێژوویی‌و فەلسەفیی کتێبەکە کەکەم کەس جورئەتی ئەوە دەکات خۆی بداتە بەر بەرپرسیارێتیی دەست لێدانی، بەتایبەت کەگومان لەوەدا نییە لەکارێکی وەهادا هەڵەو کەموکورتی ڕەنگە بەلێشاو ڕووبدات‌و ئەوەش وەرگێر فڕێ بداتە بەر نەفرەتی خوێنەری تامەزرۆی مەعریفە..

بەڵام ئەی چارە چییە؟!.. خۆ ئەمە کتێبێکی ئاسایی نییە سووچێکی کتێبخانەی پێ برازێندرێتەوەو بوون‌و نەبوونی لە کتێبخانەی کوردیدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبێت، ئەمە دانراوێکە بەدرێژایی نیو سەدەی ڕابردوو وەگێڕدراوەتەوە سەر هەموو زمانەکانی دنیا (بێجگە لەکوردی)و وەك یەکێك لەگرنگترین سەرچاوەکانی مێژوو و فەلسەفەی مێژوو سەیرو مامەڵەی دەکرێت، بگرە بۆ هەندێك زمان چەند جارێك وەرگێڕدراوەتەوە لەبری تەنها جارێك‌و دەرفەتی ئەوە دراوەتە خوێنەر سوودی تەواوی لێ وەربگرێت..

دەگەڕێینەوەو دەڵێین ئەم کارە هەروا ئاسان نییەو بەرپرسیارێتییەکی گەورەیە، بەتایبەت ئەگەر بزانین کاری وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ هەندێك زمان بەتیمی زەبەلاح کراوەو تیمی وەرگێڕانەکە پسپۆڕی هەمەلایەنەی لەخۆگرتووە بۆ ئەوەی بتوانرێت هەموو لایەنەکانی دابپۆشرێت.. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە کە ماوەیەك لەمقۆمقۆی ئەوەدابووین چۆن خوێنەری کورد بەپێچەوانەی خوێنەرانی هەموو دنیاوە لەم دانراوە پڕبایەخە بێبەشە، لەئاکامی ئەو مقۆمقۆو قسەو باسانەی خۆمان گەیشتینە بڕیاری ئەوەی ئەم سەرکێشییە بکەین‌و وەك سەرەتا پێشەکی دانراوەکە وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی‌و بیکەینە دەروازەیەك بۆ وەرگێڕانی هەموو کتێبەکە، بەهیوای ئەوەی سەرلەبەر لەماوەی ٢ تا ٣ساڵدا بەتەواوی بیخەینە بەردەمی خوێنەری کورد..

پێشەکی داوای لێبوردنیش لەخوێنەری بەڕێز دەکەین کەبەحەتمی ئەم کارە بەبێ کەموکورتی تێناپەڕێت، بەتایبەت کە ڕەنگە ناچاربین هەندێك پەلە لەوەرگێڕانەکەدا بکەین لەبەر (حساباتی تەمەن‌و زەمەن) کەزۆر کاریان بەنیوەناچڵی لەخاوەنەکانیان تێکداوە، بێجگە لەوەی پشتمان بەدەقی وەرگێڕدراوە عەرەبیەکەی کتێبەکە بەستوە.

بۆ ناساندنی بەشەکانی کتێبەکەو باس‌و بابەتەکانی خوێنەر دەتوانێت سوود لەپێشەکیی چاپە عەرەبییەکەی وەربگرێت کەئەویشمان وەرگێڕاوەتە سەر کوردی‌و لەدوای پێشەکی نووسەرەکەوە هاتووە.. بەڵام پێشوەخت ئاگاداری دەکەینەوە لەوەی ئەو ناساندنە برێك کۆنەو هی کاتێکە کەهێشتا هەموو دانراوەکە وەرنەگێڕدراوە بۆ سەر زمانی عەرەبی‌و پاش تەواوبوونی کاری وەرگێڕانەکە دەستکاریی نەکراوەتەوە.. ئێمەش لەبەر هەمان ئەو حساباتەی پێشتر ئاماژەمان پێدان ناتوانین بەڵێنی هیچ بدەین‌و بەشەکانی چاپی کوردی لەئێستاوە پۆلێن بکەین‌و بناسێنین‌و ئەو کارە بۆ دوای تەواوبوونی سەرلەبەری وەرگێڕانەکە واز لێدەهێنین، بەئومێدین هیچ نەبێت بتوانین سووچێکی کتێبخانەی کوردی پڕبکەینەوە دەرگاش والایە بۆ هەر کەسێك بتوانێت لەپاشەڕۆژدا باشتر ئەم کارە بکات‌و جارێکر تر بەشێوەیەکی تەواوترو ڕێکوپێکترو ئەگەر بکرێت ڕاستەوخۆ لەزمانی نووسەر خۆیەوە ئەم سەرگوزەشتەیەی ژیارمان بۆ بگێڕێتەوە.

دەمانەوێ سەرنجی خوێنەریش بۆ ئەوە ڕابکێشین کە لە زۆربەی شوێندا وشەی "ژیار"مان لە بری "حضارة"ی عەرەبی‌و "شارستانێتی" یشمان لەبری "مدنیة" بەکارهێناوە، گەرچی بەم پێیە دەبووایە ناونیشانی کتێبەکەشمان بکردبایە بە "مێژووی ژیار"، بەڵام لەبەرئەوەی تا ئێستا وشەی "ژیار" بەلای خوێنەرانەوە کەمێك نامۆیە، بۆیە لەسەر بەرگەکە "شارستانێتی"مان دانا.

بەر لەوەش کە خوێنەر دەست بکات بەخوێندنەوەی ئەم بەرهەمە باشتر وەهایە وەك تێبینییەك ئاگاداری ئەوە بێت کە پەراوێزو سەرچاوەکانی ئەم بەشە لەگەڵ خۆیدا نین، بەڵکو هەموو دوو بەشێك پێکەوە دەبنە بەرگێك‌و بەیەك لیست پەراوێزو سەرچاوەکانیان دەکەوێتە کۆتایی بەرگەکەوە.

ئازاد بەرزنجی | دانا ئەحمەد مستەفا | ئەبەز کەمال نوری

## پێشەکیی نووسەر

لەم کتێبەدا هەوڵی ئەوەم داوە بەشێکی ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنم کەبەجێگەیاندنی کۆڵێك دڵم خۆش دەكات، ئەرکێك بیست ساڵ بەر لەئێستا وەك سەرشێتیەك خستوومەتە ئەستۆی خۆم، ئەویش ئەوەیە کەمێژوویەك بۆ ژیار بنووسمەوە، لەمەشدا ویستوومە جێگا بۆ زۆرترینی هەواڵ لەکەمترین لاپەڕەدا بکەمەوە، بەجۆرێك کەبتوانم لەسەرگوزەشتەکەمدا شوێندەستی بلیمەتان‌و شوێندەستی ئەوانە باس بکەم کەکاریگەرییان بەسەر کەلەپووری کەلتووری مرۆڤایەتییەوە هەبووەو لەپەنای چیرۆکەکەمدا جێگایەك بهێڵمەوە بۆ تێڕوانین‌و شیکارییەکانی خۆم‌و بۆ وەسفی خەسڵەتەکان‌و ئەو گەشەکردنانەی لەدەرئەنجامی داهێنان کەوتوونەتەوەو بۆ جۆرەکانی سیستمە ئابوورییەکان، هەروەها بۆ ئەزموونەکانی جۆرەکانی فەرمانڕەوایی‌و بۆ ئەو هیوایانەی بیروباوەڕی ئایینییان پێوە هەڵواسراوەو ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر خووڕەوشتی خەڵك‌و بەسەر بایەخەکانیاندا هاتوون‌و، بۆ شاکارە ئەدەبییەکان‌و گەشەی زانست‌و دانستە بەرهەمهاتوەکانی فەلسەفەو شتە جوانەکانی هونەر.. پێویستیشم بەوە نییە کەسێك بێت ئەوەم بخاتەوە یاد کەئەمەی دەیڵێم جۆرێکە لەشێتی، یان بەوەی ئەوەم یاد بخاتەوە تەنها بیرکردنەوە لەپرۆژەیەکی لەم چەشنە لەخۆباییبوونی زیاد لەپێویستی مرۆڤ دەردەخات.. چونکە بەڕوونی ئەوەم خستۆتە پێش چاو کەتاکە ئەقڵێك‌و تەنها تەمەنێك بەشی ئەوە ناکەن ئەم ئەرکە بەتەواوی بەئەنجام بگەیەندرێت، لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، خەونەکانم ئەوەیان پێ گوتووم کەوێڕای ئەو هەڵە زۆرانەی لەپرۆژەیەکی وەهادا خۆیان لێ لانادرێ، ڕەنگە کەمێك کەڵکی هەر هەبێت بۆ ئەو کەسانەی ئارەزووی فەلسەفییان وایان لێ دەكات هەوڵ بدەن هەموو شتەکان بەسەر یەکەوە لەیەك جەستەدا ببینن، دواتریش بتوانن دوای

وردەکارییەکان بکەون لەشوێنی خۆیاندا، بەڵام لەچوارچێوەی هەمان وێنەی یەکانگیردا، بەوەش بەیەکانگیری هەموو شتەکان ببینن‌و بتوانن لەڕێی سەردەمی گەشە مێژووییەکەوە لێی بگەن، هەروەها لەجێی خۆیشیدا لەڕێی زانیارییەکانیانەوە تێی بروانن.

زۆر لەمێژبوو هەستم بەوە کردبوو کەشێوازی ئاسایی ئێمە لەنووسینەوەی مێژوودا بەش بەشکراوە بۆ سەر چەند بەشێکی تەواو لەیەکتری دابڕاو، هەر بەشێك تاوتوێی یەك لایەنی ژیان دەکات، مێژوویەك ئابوورییەو مێژوویەك سیاسی‌و مێژوویەك ئایینی‌و مێژوویەك بۆ فەلسەفەو مێژوویەك بۆ ئەدەب‌و مێژوویەك بۆ زانیاری‌و مێژوویەك بۆ مۆسیقاو مێژوویەك بۆ هونەر، هەستم بەوە دەکرد ئەم شێوازە زوڵمێکی تێدایە دەرهەق بەو یەکانگیرییەی لەژیانی مرۆڤایەتیدا هەیەو هەستم بەوەش دەکرد کەچۆن ئەم لایەنانە بەجیاجیا نوسراونەتەوە پێویستە بەسەریەکیشەوە جارێکی تر بنوسرێنەوە، هەروەك پێویستە چۆن شیکارییانە دەنوسرێنەوە بەپێی زنجیرەی مێژووییش هەر بنوسرێنەوە، ئامانجی زانستی نووسینەوەی مێژووش لەشێوەی هەرەباڵایدا لەهەر سەردەمێکدا دەبێ بریتی بێت لەوێناکردنی کۆمەڵی پێکهێنەرەکانی کەلتووری نەتەوە بەتێهەڵکێشی، بەدامەزراوەکانییەوەو بەسەرکێشییەکانییەوەو بەشێوازەکانی ژیانییەوە، بەڵام کەڵەکەبوونی مەعریفە هەروەك زانستی لەتکرد بەهەمان شێوەش مێژووی بۆ سەدان بەشی جیاوازو سەربەخۆ لەتکرد.. زانا داناکانیش ئەوەیان بەپێویست نەزانی هەمووی لەیەك تابلۆدا وێنابکەن، چ لەو جیهانە مەتریاڵەداو چ لەڕابردووی زیندووی مرۆڤایەتیدا، ئەوەش لەبەرئەوەی تا ئەو پرۆژەیەی مرۆڤ دەیخاتە سەرشانی خۆی زەبەلاحتر بێت ئەگەری هەڵە زیاتر دەبێت‌و هەر پیاوێکیش، جا ئەو پیاوە هەر چییەك بێت، ئەگەر تەنانەت خودی خۆی بفرۆشێت بۆ ئەوەی وێنەیەکی ئاوێتە بخولقێنێت هەموو شتەکان پێکەوە گردبکاتەوە ، سەرەنجام هەر پەژارە بۆ خۆی دەچنێتەوە، لەبەر ئەو هەزاران تیرەی

خەڵکانی پسپۆڕ تێی دەگرن‌و بەبێ گوێدانە ئەو هەوڵەی داوێتێ لەهەموو لایەکەوە دەیپێکن، (فەتاح حۆتنب) بەر لەپێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا گوتوویەتی: "بڕوانە چۆن لەئەنجومەندا بەرەورووی بەرهەڵستیی پسپۆڕەکان دەبێتەوە، گەمژەییە ئەگەر بتەوێت دەم لەهەموو بوارەکانی مەعریفە بکوتیت"، مێژوویەك کەبۆ هەموو ژیار بنوسرێتەوە لەجورئەتدا هاوتاو هاوشێوەی هەموو هەوڵە فەلسەفییەکانە بەسەریەکەوە، چونکە ئەوە تابلۆیەکمان نیشان دەدات مایەی گاڵتەجاڕییە، وێنەی بەشێك گشتێك لێکدەداتەوە کەخۆی بەشێکێتی، ئەو سەرکێشییەش پاڵ هیچ پایەیەکی ژیرانەی نییە، بەهەمان شێوەی فەلسەفە، سەرکێشییەکیشە لەباشترین حاڵەتیدا گەمژەییەکی جەربەزانەیە.. بەڵام باهیوا بەوە بخوازین کەهیچ نەبێت هێندەی فەلسەفە ناکامی هەبێت، کەئەمیان (فەلسەفە) هەمیشە دەتوانێت توێژێك لەسەرکێشان بەلای خۆیدا رابکێشێت‌و لەگەڵ خۆیدا بیانباتە فووڵاییە کوشندەکەیەوە.

پلانی ئەم زنجیرەیەش ئەوەیە سەرگوزەشتەی ژیار لەپێنج بەشی جیاجیادا بگێڕینەوە:

١ـ "کەلەپووری ڕۆژهەڵاتمان"، کەبریتییە لەمێژووی میسرو ڕۆژهەڵاتی نزیك تاکاتی مردنی ئەسکەندەر، هەروەها مێژووی هیندو چین‌و ژاپۆن هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆ، لەپێشیشدا پێشەکییەکمان دەبێت لەمەڕ سروشتی ئەو توخمانەی ژیاری پێکدەهێنن.

٢ـ کەلەپووری کلاسیکیمان کەبریتییە لەمێژووی ژیاری لەگریك‌و ڕۆماو ژیاری ڕۆژهەڵاتی نزیك لەو دەمەدا کەلەژێر رکێفی گریك‌و ڕۆماندا بوو.

٣ـ کەلەپووری ناوەڕاستمان، لێرەدا ئەورووپای کاسۆلیك‌و دەرەبەگ‌و ژیار بیزەنتییەکان‌و کەلتووری ئیسلامی‌و کەلتووری موسایی لەئاسیاو ئەفەریقاو ئیسپانیاو ڕێنیسانسی ئیتالیا دەگێڕینەوە.

٤. کەلەپووری ئەوروپاییمان، ئەمیش بریتییە لەمێژووی کەلتووری وڵاتانی ئەوروپایی لەچاکسازیی برۆتستانتییەوە تادەگاتە شۆڕشی فەڕەنسا.

٥. کەلەپووری نوێمان، بریتییە لەمێژووی داهێنانو سیاسەتو زانیاریو فەلسەفەو ئایینو ئەخلاقو ئەدەبو هونەر لەئەوروپادا لەمردنی ناپلیۆنەوە تارۆژگاری ئەمڕۆمان.

چیرۆکەکەمان لەرۆژهەڵاتەوە دەست پێدەکات، هەر لەبەرئەوە نا کەئاسیا شانۆی کۆنترین ژیارییە کەئێمە ناسیومانە، بەڵکو لەبەرئەوەش کە ئەو ژیارییانە چوارچێوەو بناغەی کەلتووری گریکیو رۆمانی پێکدێنن، ئەو کەلتوورەی سێر هێنری مین هەتا سەر، بەهەڵە، پێی وابوو تاکە سەرچاوەی ئەقڵی مۆدێرنن، هەر کەزانیشمان چەند داهێنان لەهەرە داهێنانە پێویستەکانمانو چەند لەسیستمی ئابووریو سیاسیمانو چەند لەوەی لەئەدەبو هونەرو لەفەلسەفەو ئاییندا هەمانە بەرەچەڵەك دەگەڕێنەوە بۆ میسرو رۆژهەڵات، لەم چرکەساتە مێژووییەشدا کەباڵادەستی ئەوروپا بەخێراییەکی زۆرەوە کەوتۆتە لێژیو، کەئاسیا لەبووژانەوەدایەو بووژنەوەکەی ژیانی بەبەردا دەکاتەوە، کەسەرلەبەری جووڵانەوە لەسەدەی بیستەمدا وەك ململانێیەکی سەرتاپاگیری نێوان رۆژهەڵاتو رۆژاوا خۆی دەنوێنێت، لەم چرکەساتەدا دەبینین ئەو دەمارگیرییە ناوچەییەی باڵی گرتووە بەسەر نووسینەوەی کلاسیکییانەی ئێمەدا بۆ مێژوو، کەوای کردووە گێڕانەوەی مێژوو لەگریکەوە دەست پێ بکاتو هەموو ئاسیا لەدێڕێکدا کورت بکرێتەوە، ئەمە تەنها هەڵەیەکی زانستی نییە، بەڵکو شکستێکی گەورەیە لەوێناکردنی واقیعداو کەموکورتییەکی ئاشکرایە لەئەقڵی ئێمەدا، پاشەڕۆژ رووبکردۆتە ئەوبەری زەریای ئارام، بۆیە دەبێت ئەقڵ لەوێ درێژە بەهەنگاوەکانی خۆی بداتەوە.

بەڵام ئەقڵێکی رۆژاوایی چۆن دەتوانێ لەرۆژهەڵات بگات؟ ئەو هەشت ساڵەی لەتوێژینەوەو گەشتکردندا بەسەرم بردوون تەنها ئەو راستییەیان بۆ روون کردوومەتەوە کەئەگەر سەرلەبەری تەمەنێك بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی تەرخان

بکرێت هێشتا بەشی ئەوە ناکات خوێندکارێکی ڕۆژاوایی بۆ تاوێك خۆی ئامێتەی ڕۆحی وردی ڕۆژهەڵاتو کەلەپووره تەلیسماوییەکەی بکات، هەر بەشێكو هەر پەرەگرافێکی ئەم کتێبە دەبێتە مایەی خراپ حاڵی بوون یان گاڵتەجاڕیی خوێنەر ئەگەر ئەو خوێنەرە نیشتمانپەرست بێت یان ئەگەر خاوەنی دەروونێکی ئاڵۆز بێت، چونکە ئەو جوولەکەیەی وابەستەی ئایینەکەی خۆیەتی پێویستی بەهەموو ئەو شتانە هەیە کەلەبارەیەوە باس دەکرێن، پێویستی بەدان بەخۆداگرتنە دێرینەکەی هەیە، تابتوانێت لەو لاپەڕانە ببورێت کەلەبارەی یەهوداوە نوسراون، ئەو هندۆسەش کە لەودیوی سروشت راماوە گریانی بۆ ئەو چەند چرنوکە دێت کەلەفەلسەفەی هیندیمان گرتووە، کەسێکی دانای چینی یان ژاپۆنیش پڕ بەدەم پێکەنینی بەم هەڵبژاردە کورتانە دێت کە لەسامانی پڕ لەئەدەبو فیکری ڕۆژهەڵاتی دووڕمان وەرگرتووەو بەنیوەناچڵیش وەرمان گرتوون، خۆ مامۆستا هاری ولفسۆن لەزانکۆی هارڤاردەوە هەندێك هەڵەی بەشی پێنجەمی ڕاستکردۆتەوە کەتایبەتە بەدەوڵەتی یەهوداوە، هەروەها دکتۆر ئەناندا کۆما راسنوامی لەپەیمانگای هونەرەجوانەکانی بۆستنەوە بەو بەشەدا چۆتەوە کەتایبەتە بەهیندو تەواو خۆی پێوە ماندووکردووە، بەڵام بێگومان ئەو بەرپرس نییە لەو سەرەنجامانەی من پێیان گەیشتووم، یان لەو هەڵانەی هێشتا وەك خۆیان ماونەتەوە، مامۆستا هـ.هـ.جۆن-ی ڕۆژهەڵاتناسی بلیمەتی زانکۆی واشنگتۆنیش بەهاوکاری لەگەڵ ئەبتۆن کلۆز کەوەك دەردەکەوێت کارەکانی لەڕۆژهەڵات هەرگیز تەواو نابن، پێکەوە هەڵە زەقەکانی ئەو بەشانەیان ڕاستکردەوە کەتایبەتن بەچینو ژاپۆن، هەروەك مستەر جۆرج سۆکۆلسکی لەو لاپەڕانەدا بەکارم هاتووە کەلەمەڕ کاروباری ڕۆژگاری ئەمڕۆی ڕۆژهەڵاتی دوورەوە نوسراون بەهۆی ئەو شارەزاییەوە کەلەبارەی ئەو وڵاتانەوە هەیەتیو ڕاستەوخۆ لەخۆیانەوە زانیارییەکانی وەرگرتووە، ئەگەر خوێنەرانیش بایی ئەوەندە ڕوویان لەم کتێبە کرد کەناچارمان بکەن چاپی دووهەمی لێ چاپ بکەینەوە، ئەوە دەرفەتەکە

دەقۆزینەوەو هەموو ڕاستکردنەو دەستکاریکردنەکان لەو چاپەدا جێ دەکەینەوە کەرەخنگرو پسپۆڕو خوێنەران پێشنیاریان کردوون، بەڵام ئەم دانەرەی تەواو ماندوو بووە لەگەڵ تای تنگ-دا هاوڕایە کە لەسەدەی سیانزدەدا کتێبی (مێژووی نووسینی چینی)ی بڵاوکردەوەو تیایدا دەڵێت: "ئەگەر بەدوای کەماڵدا وێڵ بوومایە هەرگیزاو هەرگیز نوسینەوەی ئەم کتێبەم تەواو نەدەکرد".

لەحاڵێکیشدا ئەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆمان کەخەڵك زیاتر گوێیانی تیا بەکاردێنن، لێناگەڕێ کتێبگەلێکی پڕبایەخ بڵاوببنەوە تایبەت بەو بابەتە دوورانەی تەنها جێی بایەخی ئەو کەسانەن کەخۆیان بەهاوڵاتیی جیهانی دەزانن، لەم حاڵەتەدا دەشێت ئەڵقەکانی تری ئەم زنجیرەیە لەبەر پێداویستییەکانی ژیانی ئابووری خاوتر بکەونە بەر دید، بەڵام ئەگەر خەڵك پێشوازی لەم سەرکێشییەم بکەن کەویستوومە لەمیانەیدا هەموو توخمە جیاجیان لەکەشتییەکدا خڕبکەمەوە، بەشێوەیەکی وەها کەبتوانم دواتر بەبێ دابڕان خۆم بۆ ئەم پرۆژەیە تەرخان بکەم، ئەوە بەشی دووهەم لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٠دا ئامادە دەبێت‌و بەشەکانی دوای ئەویش تائەوەندەی تەندروستیم یارمەتیم بدات بەرودواو بەتێکڕای هەر پێنج ساڵ بەشێك، دەردەکەون، هیچ شتێکیش هێندەی ئەوە خۆشحاڵم ناکات کەهەموو هەوڵم بۆ ئەم کارە تەرخان بکەم‌و سەرقاڵی تری ئەدەبیم نەبێت، بۆ ئەوەی کات بەهانامەوە بێت‌و هەتا بارودۆخ یارمەتیم بدات بەدەم ئەم کارەوە بڕۆم، بەئومێدی ئەوەی ژمارەیەکی باش لەهاوچەرخەکانی خۆم پیر ببن‌و ئەم بەشانەش کەمێك یاریدەی ڕۆڵەکانمان بدەن لەتێگەیشتنی ئەو گەنجینە سامانە بێشومارەی لەباووباپیرانیانەوە بۆیان دەمێنێتەوەو لێی بەهرەمەند بن.

ویل دیورانت

مارسی ١٩٣٥

## وتەیەك لەبارەی زنجیرەی سەرگوزەشتەی ژیارەوە

سەرگوزەشتەی ژیار ئینسایکلۆپیدیایەکە لەکایەی فەلسەفەی مێژوودا، دانەرەکەی دەیان ساڵ ئامادەکاریی بۆ کرد، لەپێناویدا دەیان کتێبی خوێندەوەو زیاتر لەجارێك جیهانی لەرۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژاوا تەی کرد، وەك بەڵگەی ئەو هەوڵەش کەدانەر بۆ ئامادەکاریی خەرجی کردووە خوێنەر ئەوەندەی بەسە سەیری ئەو لیستی سەرچاوە گشتیو تایبەتییانە بکات کە لەکۆتایی هەر بەشێکدا دامانناوە، سەرەتا بەنیاز بوو ئەم زنجیرەیە لەپێنج بەرگ پێك بێت، بەڵام لێکۆڵینەوەکەی لقو پۆی زیاتری لێ بۆوەو کەرەستەکەی زۆرتر بوونو کردی بەحەوت بەرگ، کێ دەزانێت، رەنگە لەو ژمارەیەش تێپەڕ بکات کەدواجار مەزەندەی کردووە.

لەو حەوت بەرگەش تائێستا شەش بەرگی زەبەلاحیان کەهەندێکیان (وەك بەرگی یەکەمو بەرگی چوارەم) لەهەزار لاپەڕە زیاترن بەزمانی ئینگلیزی دەرچوون.

بەرگی یەکەم لەبناغەکانی ژیارو سەرچاوەکانی دەکۆڵێتەوە، دواتر دەچێتە سەر باسی ژیارەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو رۆژهەڵاتی نزیك، ئەم بەرگەش لەپێنج بەشی زەبەلاحدا بەزمانی عەرەبی بڵاو بۆتەوە.

بەشی یەکەم تایبەتە بەبناغەکانی ژیارو پێگەیشتنی.

بەشی دووەم تایبەت بەژیاری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەمیسرەوە هەتا ئێران.

بەشی سێهەم تایبەتە بەژیاری هیندو دراوسێکانی لەسەرەتای مێژوویانەوە تارۆژگاری ئەمڕۆ.

بەشی چوارەم تایبەتە بەژیاری چین لەدێرینترین چاخەوە تارۆژی ئەمڕۆ.

بەشی پێنجەم تایبەتە بەژیاری ژاپۆن لەسەرەتاکانییەوە هەتا دەگاتە چاخی نوێ.

بەرگی دوەمیش تایبەتە بەژیاری گریك‌و بەزمانی عەرەبی کراوەتە سێ بەش:

بەشی یەکەم: ژیاری گریك دەگێڕێتەوە لەکۆنترین سەردەمەوە هەتا دەگاتە سەردەمی خەباتی وڵاتی گریك لەپێناوی ئازادی‌و سەربەخۆییدا.

بەشی دوەم: باسی ژیار گریك دەکات لەچاخی زێڕینی خۆیدا، بەو ململانێیەوە کەئەو کاتانە لەنێوان فەلسەفەو ئایین لەگۆڕێ بوو، بەسەرکەوتنی گریکیش کۆتایی دێت، هەروەها چیرۆکی فەلسەفەی گریکی دەگێڕێتەوە.

بەشی سێهەم: باسی بڵاوبوونەوەی ژیاری گریك دەکات لەرۆژهەڵاتداو بەداگیرکردنی وڵاتی گریك کۆتایی دێت لەلایەن رۆماوە.

بەرگی سێهەمیش -سیزارو مەسیح- چیرۆکی ژیار ڕۆمان دەگێڕێتەوە لەسەرهەڵدانییەوە هەتا سەردەمی کۆستانتین، بەزمانی عەرەبیش کراوەتە سێ بەشی گەورە.

بەشی یەکەم: چیرۆکی ژیار گریك دەگێڕێتەوە لەسەرەتای مێژووی رۆماوە هەتا سەردەمی ئەکتافیان، چەند بابەتێکی تێدایە سەبارەت بەخەبات لەپێناوی دیموکراسی‌و جەنگەکانی هانیپاڵ‌و فەلسەفەی (رواقی)و ئەدەبی سەردەمی شۆڕش.

بەشی دوەم: لەچاخی زێڕینی رۆماوە دەست پێدەکات‌و چەند بابەتێکی تێدایە سەبارەت بەسیستمی ئابووریی ڕۆمانەکان، هەروەها لەبارەی زانیاری‌و هونەرەکانی ڕۆمانەکان‌و لەبارەی یاسای ڕۆمانی‌و پاشا فەیلەسووفەکان‌و لەبارەی ژیان‌و فیکری سەدەی دوەمی زایینی.

بەشی سێهەم: چیرۆکی ژیار ڕۆمان دەگێڕێتەوە لەهەرێمەکانی سەر بەرۆما لەئەوروپاو ئەفەریقا، باسی هۆشیاریی وڵاتی گریك دەکات لەکاتی دەسەڵاتی

ڕۆمانەکاندا، هەروەها گوزەرانی جووەکان لەسایەی ئیمپراتۆرییەتەکەداو سەردەمی لاویی مەسیحییەتو گەشەی کڵێساو هەرەسی ئیمپراتۆرییەتەکەو سەرکەوتنی مەسیحییەت.

بەرگی چوارەم: چاخی باوەڕ لەژیاریی سەدەکانی ناوەڕاستداو بەشەش بەشی گەورە دەرچوە.

بەشی یەکەم: بەبڵاوبوونەوەی مەسیحییەت دەست پێدەکات لەناو هەرێمەکانی وڵاتی ڕۆماندا، باسیش لەلەشکرکێشیی بەربەرییەکانو سەرهەڵدانی دەوڵەتەکانی ئەوروپاو پاساکانی گۆستنیانو ژیاری بیزەنتی دەکات، بەباسی ژیاری فارسیش کۆتایی دێت تادەگاتە داگیرکاریی عەرەبی.

بەشی دوەم: تایبەتە بەژیاری ئیسلامی، بەپاکییەکی تەواویشەوە باس لەژیانی پێغەمبەر (د.خ)و قورئانو ئاینی ئیسلامو لایەنە باشەکانیان دەکات، باسی ژیاری ئیسلامیش دەکات لەئاسیاو ئەفەریقاو ئەندەلوسو چاکەی موسڵمانان بەسەر جیهانەوە، چەند بابەتێکی سەرنجڕاکێشیش لەم بەشەدایە لەسەر زانیارییەکانی موسڵمانانو ئەدەبو فەلسەفەو سۆفیگەراییانو ناوی گەلێك زاناو ئەدیبو فەیلەسووفو سۆفیی تێدا هاتووە، کتێبەکە ستایشێکی بێوێنەی سەروەرییەکانی موسڵمانان دەکات.

بەشی سێهەم: باسی ژیاری جوولەکەو جیهانی بیزەنتییەکان دەکات لەچاخەکانی ناوەڕاستداو ئەو ململانێیەی لەنێوان ئاینزا جیاجیاکانی مەسیحیدا هەبووە، هەروەها دەرەبەگیو سوارچاکی، بابەتێکی بەچێژیشی لەخۆگرتووە لەسەر دادگاکانی ئاشقان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا.

بەشی چوارەم: بەباسی جەنگەکانی خاچپەرستان دەست پێدەکات، دواتر دەچێتە سەر باسی شۆڕشی پیشەسازی لەجیهانداو رابوونی ئەوروپا لەتاریکایی چاخەکانی ناوەڕاستداو ئامادەباشی ئیتاڵیا بۆ پێشوازیکردن لەسەردەمی ڕێنیسانس.

بەشی پێنجەم: باسی کڵێسای کاسۆلیکیو دادگاکانی پشکنینو کارە دزێوەکانی دەکات، هەروەها باسی سەرهەڵدانو گەشەکردنی کەهەنووتو ئەدەبو ئەخلاقیاتی جیهانی مەسیحیو بووژانەوەی هونەرو گەشەی هونەری فوتیو شاپەیکەرە فوتییەکانی ئەوروپاو باسی مۆسیقای چاخەکانی ناوەڕاست دەکات.

بەشی شەشەم: چیرۆکی تەشەنەکردنی زانیاریو مەعریفەو ئەدەب دەگێڕێتەوە لەدوا ڕۆژگارەکانی چاخەکانی ناوەڕاستدا، بەباسی دانتیو گاڵتەجاڕیی پیرۆزو سەرچاوەکانی تەواو دەبێت، پوختەیەکی تێروتەسەلی ئەو داستانەش لەخۆ دەگرێت.

بەرگی پێنجەمیش تایبەتە بەچاخی ڕێنیسانس لەئیتاڵیاو لەچوار بەشی گەورە پێکدێ، (بەڵام ئەم بەشانە لەکاتی نووسینەوەی ئەم پێشەکییەدا هێشتا وەرنەگێڕدرابوونە سەر زمانی عەرەبی.).

# باسی یەکەم
# فاکتەرەکانی ژیار

## پێناسە — فاکتەرە جیۆلۆجیو جیۆگرافیو ئابووریو رەگەزییو دەروونییەکانو هۆکارەکانی نەمانی ژیارەکان

ژیار بریتییە لەسیستمێکی کۆمەڵایەتی کەیارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ فرەکردنی بەرهەمە کەلتورییەکانی، لەچوار توخمی سەرەکیش پێکدێ: داهاتە ئابوورییەکان، سیستمە سیاسییەکان، نەریتە ئەخلاقییەکانو بەدواداچوونی زانیاریو هونەرەکان، ئەو کاتەش دەست پێدەکات کە بێ سەرەوبەرەییو دڵەڕاوکێ کۆتاییان دێت، چونکە هەر کاتێك مرۆڤ لەترس بەدوور بوو، پاڵنەرەکانی ڕوو لەپێشەوەکردنو فاکتەرەکانی داهێنانو بیناکردن لەناخیدا ئازاد دەبن، دوای ئەوە خودی فریودەرەکانی سروشت دەیجووڵێنن بۆ بەرەوپێشەوە چوون لەپێناوی تێگەیشتنی تەواو لەژیانو لەگەشەی ژیان.

ژیار بەستراوەتەوە بەکۆمەڵێك فاکتەرەوە کەئەوان هەنگاوەکانی خێراتر دەکەن یان تەگەرە دەخەنە سەر ڕێگەکەی، لەسەرووی هەموو ئەو فاکتەرانەشەوە فاکتەرە جیۆلۆجییەکانن، ئەوەش لەبەرئەوەی قۆناغێکی ژیاری دەکەوێتە نێوان دوو سەردەمی بەستەڵەکەوە، چونکە تەوژمی بەستەڵەك لەهەر کاتێکدا بێت سەرلەنوێ پەلاماری زەوی دەداتەوەو دایدەپۆشێتەوە، بەشێوەیەك کە سەرلەبەری دامەزراوەکانی مرۆڤ بەچەندین چینی کەڵەکەبووی بەفرو تاشەبەرد دادەپۆشێت، ژیانیش لەقوژبنێکی بەرتەسکی ئەم زەوییەدا بەگیردێنێت، هەروەها

دێوی بومەلەرزەش کەئێمە بەبێئاگای ئەو شارەکانمان بینا دەکەین ڕەنگە بەناستەمێك هەردوو شانی بجوولێنێت‌و بەوە بێباکانە لووشمان بدات[١].

دووەم فاکتەر فاکتەری جیۆگرافییە، چونکە گەرمی هەرێمەکانی سەر پشتێنەی زەوی‌و پێویستی خاکی ئەو هەرێمانە بە ژمارەیەك مشەخۆری بێکۆتایی، فاکتەری دروستبوونی ژیار فەراهەم ناکات، ئەوەتا ئەو تەمبەڵی‌و نەخۆشییە زۆرانەی بەو هەرێمانەدا بڵاو دەبنەوەو ئەو گەشە خێراو دواتر لەناوچوونە خێرایەش کەلەبارەیانەوە دەیزانین، وادەکەن خەڵکەکەی خۆیان بە کەمالیاتەوە خەریك نەکەن کەئەو شتە کەمالیاتە پایەو بناغەی ژیارن، بەڵکو هەموو هەوڵێکیان بۆ تێرکردنی سکیان‌و زاووزێ دەخەنەگەڕ، بەشێوەیەك ئیدی مرۆڤ لەوێ هیچ توانایەکی پێ نامێنێت کەلەگۆڕەپانی هونەرو بیرکردنەوەدا بیخاتەگەڕ، هەروەها باران بارینیش فاکتەرێکی ژیانە، بگرە لەوانەیە لەتیشکی خۆر گرنگتر بێت بۆ ژیان، کەئاسمانیش هەر ڕۆژەی ئارەزووی بەجۆرێك بێت‌و هۆکاری ئەو هەڵگێڕو داگێڕەیشی نەزانرێ، کەواتە وشکەساڵی ڕەنگە گەلێك هەرێمی لەناوبردبێت کەڕۆژێك لەڕۆژان ئاوەدانی‌و دەسەڵاتیان بەخۆیانەوە بینیوە، وەك نەینەواو بابل، یان ڕەنگە هەنگاوەکانی بەهێزبوون‌و دەوڵەمەندبوونی گەلێك شاری خێراتر کردبێت کەوەك دەردەکەوێت دوورە ڕێگای گواستنەوەی هاتوچۆش بوون، وەك شارەکانی بەریتانیای مەزن یان کەنداوی پیۆگێت، جا ئەگەر خۆڵی هەرێمەکە پڕ لەخۆراك‌و کانزا بێت‌و ئەگەر ڕووبارەکانی ڕێگەیەکی خۆشی بۆ فەراهەم بکەن بۆ ئاڵوگۆڕی کاڵا لەگەڵ خەڵکی ترداو ئەگەر کەنارەکانی پڕ بن لەپێگەی شیاو بۆ دروستکردنی بەندەری سروشتی بۆ کەشتیگەلە بازرگانییەکەی‌و لەسەرووی هەموو ئەوانەشەوە ئەگەر نەتەوەکە شوێنێکی لەسەر ڕێگای سەرەکی بازرگانیدا گرتبوو وەك ئاتین‌و قرتاجنەو فلۆرەنساو ڤینیسیا، ئەو کاتە فاکتەرە جیۆگرافییەکان کەمەحاڵە

بتوانن ژیار دروست بکەن، بەڵام دەتوانن بەرِوویدا پێبکەنن‌و رِێگەی گەشەسەندنی بۆ خۆشتر بکەن[1].

فاکتەرە ئابوورییەکان لەوانیش گرنگترن، دەشێت گەل دامەزراوەی کۆمەڵایەتی رێکوپێکی هەبێت، پاسایەکی ئەخلاقی بەرزیشی هەبێت، بگرە رِەنگە هونەرە زۆر بچوکەکانیشی لەگەشەدابن، وەك حاڵەتی هیندییەکانی ئەمریکا، بەڵام ئەگەر هەر لەقۆناغی راووشکاری سەرەتاییدا مایەوەو بۆ مانەوەی پشتی تەنها بەو نێچیرانە بەست کەرِەنگەو ئەگەرو سابەڵکو رِێی لێیان بکەوێت!! ئەوە مەحاڵە لەهەمەجییەتەوە بپەرِێتەوە بەرەو ژیارێکی تەواو، رِەنگە هۆزێکی بیابان نشینی وەك بیابان نشینەکانی وڵاتی عەرەب بگەنە ئاستێکی دانسقەی زیرەکی‌و لێهاتوویی، رِەنگیشە بگەنە باڵاترین حاڵەتەکانی ئەخلاق وەك ئازایەتی‌و بەخشندەیی‌و بەئەمەکی، بەڵام ئەو ئازایەتییە ئەگەر لانی کەمی رۆشنبیریی پێویستی لەگەڵدا نەبوو، ئەگەر فرەجۆریی سەرچاوەکانی بژێوییشی لەگەڵدا نەبوو، ئەوە لەمەترسیەکانی راووشکارو لەپێداویستییەکانی بازرگانیکردندا هەمووی خەرج دەکات‌و هیچی لێ نامێنێتەوە بۆ پێداویستییەکانی بەژیار بوون‌و ئارایشتکاری‌و جوانکاری‌و هونەرو خۆشرابواردنی ئەو ژیارە. یەکەمین شێوەش کە کەلتووری تێدا دەرکەوت کشتوکاڵ بوو، چونکە مرۆڤ هیچ بۆشایی‌و پاساوێك بۆ بەژیاریبوونی خۆی نابینێت ئەگەر لەجێگایەك ئارام نەگرێت‌و خۆڵی ئەو جێگایە نەکاتە کشتوکاڵ‌و خۆراکی پێویستیشی تێدا عەمبار نەکات بۆ ئەو رۆژگارەی رِەنگە سەرچاوەیەکی تێدا نەمێنێتەوە بۆ بەدەستهێنانی خۆراك[2].

لەم بازنە بەرتەسکەی ئاسوودەییدا -مەبەستم هەبوونی سەرچاوەیەکی دڵنیای ئاوو خۆراك- دەبینین مرۆڤ خانوو و پەرستگاو خوێندنگا بۆ خۆی دادەمەزرێنێت‌و ئامێرگەلێك دادەهێنێت کەلەبەرهەمهێنانی یاریدەی بدەن‌و سەگ‌و گوێدرێژو بەراز ماڵی دەکات، لەدواجاریشدا خودی خۆی کۆنترۆڵ دەکات‌و

فێری ئەوە دەبێت چۆن بەسیستەمو بەبەردەوامی کار بکاتو ماوەیەکی زۆرتر درێژە بەژیانی بداتو توانایشی زیاتر دەبێت بۆ گواستنەوەی دەستپاکانەی کەلەپووری مرۆڤایەتی لەبوارەکانی زانیاریو ئیتیکدا بۆ نەوەکانی پاش خۆی[٤].

هەروەك چۆن ژیار بەستراوەتەوە بەخودی شارنشینییەوە، کەلتووریش بەستراوەتەوە بەکشتوکاڵەوە، ژیاریش لەڕوویەکییەوە بریتییە لەمامەڵەی نەرم، مامەڵەی نەرمیش ئەو جۆرە ڕەفتارە جوانکراوەیە کە بەبۆچوونی خەڵکانی شار (ئەوانەی خۆیان دانستی ژیاریان گەڵاڵەکردووە) تەنها خەسڵەتی شارە، چونکە هەموو بەرهەمەکانی لادێ–ڕاست بێت یان درۆ- لەشاردا کۆدەبێتەوە، هەر لەسامانەوە بۆ دەرکەوتووترین ئەقڵەکان، هەروەها داهێنانەکانیش ڕۆڵی خۆیان هەیە لەزیاترکردنی ئامرازەکانی پشوودانو کات بەسەربردنو دەستبەتاڵی، هەر لەشاریشدا بازرگانەکان بەیەك دەگەنو کاڵاکانیانو بیروبۆچوونەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکەن، ئەوەتا لێرە کە ڕێگە بازرگانییەکان پێك دەگەن ئەقڵەکان لەیەك موتوربە دەبن، بلیمەتی دەردەکەوێتو هێزی ئەو بلیمەتییە بۆ داهێنانو ئەفراندن دەوروژێت، هەر لەشاریشدا واز لەکۆمەڵێك خەڵك دەهێندرێتو داوای ئەوەیان لێناکرێت کەرەستەی مادی دروست بکەن، بۆیە دەبینیت بەبەرهەمی زانستیو فەلسەفیو ئەدەبیو هونەرییەوە خەریکن، بەڵێ ژیار لەکەپری جوتیارێکەوە دەست پێدەکات، بەڵام لەشاردا نەبێت گەشە ناکات[٥].

ژیاریش پەیوەست نییە بەتەنها رەگەزێکی مرۆڤەوە، ڕەنگە لەهەر کیشوەرێکدا بێت دەربکەوێت، ڕەنگیشە لەهەر رەگەزێکی مرۆڤدا سەرهەڵدات، ژیار ڕەنگە لەپەکین یان لەدەلهی، لەمەمفیس یان لەبابل، لەرافنا یان لەندەن، لەپیرۆ یان لەیۆکتان هەڵسێتە سەرپێ، ئەوە رەگەزێکی مەزنی مرۆڤ نیە کە ژیار دەخولقێنێت، بەڵکو ژیاری مەزنە نەتەوە دەخولقێنێت، لەبەرئەوەی بارودۆخی جیۆگرافیو ئابووری کایە کەلتوورییەکە دروست دەکات، کەلتووریش ئەو شێوازە دەخولقێنێت کەدەبێتە قەوارە بۆ نەتەوەکە. ژیاری بەریتانی ئینگلیز دروستی

نەکردووە، بەڵکو ئەو خۆی زادەی ئەو ژیارەیە، کەدەبینیت ئەو بۆ هەر شوێنێك بچێت ژیارەکەی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت. ئەو کاتێك لە(تومبەکتۆ) پۆشاکی تایبەتی ژەمی ئێوارە دەپۆشێت مانای وا نییە لەوێ سەرلەنوێ ژیارەکەی خۆی دروست دەکاتەوە، بەڵکو مانای ئەوەیە کەتەنانەت لەشوێنە هەرەدوورەکانیشدا ژێردەستەیی خۆی بۆ ئەو شارستانییەتە دەردەخات. ئەگەر رەگەزێکی تری مرۆڤیش بەهەمان بارودۆخی ماددیدا تێپەڕ ببێت هەمان دەرەنجام دەدات بەدەستەوە، ئەوەتا ژاپۆنی سەدەی بیستەم هەمان مێژووی ئینگلتەرای سەدەی نۆزدەهەم دووبارە دەکاتەوە. کەواتە ژیار تەنها بەیەك واتا بەستراوەتەوە بەرەگەزەوە، ئەویش ئەوەیە کەهەمیشە دوای قۆناغێك لەئاوێتەبوونی هێور هێوری نێوان توخمە جیاجیاکان دێتەئاراوە، ئەو ئاوێتەبوونەی پەیتا پەیتا گەلێکی نیمچە تێکهەڵچووی لێدەکەوێتەوە[٦].

ئەم فاکتەرە ماددیو بایۆلۆژیانەش تەنها مەرجێکن بۆ سەرهەڵدانی ژیار، بەڵام بەخۆیان ژیار پێك ناهێننو لەهیچەوە نایخوڵقێنن، بەڵکو دەبێت فاکتەرە دەروونییە وردەکانیشیان بخرێتەسەر. گومان لەوەدا نییە کەدەبێت سیستمێکی سیاسی باڵ بەسەر خەڵکەکەدا بکێشێت، جا هەرچەندە ئەو سیستمە هێندە لاواز بێت هەتا ئەوەندەی تەواو لەرادەی بێ سەرەوبەرەییش نزیك بێتەوە، وەك حاڵەتی فلۆرەنساو رۆمای رۆژگاری رێنیسانس، دواتریش زۆر پێویستە خەڵك وردە وردە هەست بەوە بکەن کە پێویست ناکات لەهەر وەرچەرخانێکی ژیانیاندا پێشبینیی مەرگ یان سەرانە (باج) بکەن، هەروەها زۆر پێویستە یەکێتییەکی زمان تاڕادەیەکی وەها هەبێت کەببێتە ئامرازێکی بیروراگۆڕینەوەی خەڵك، پێویستە یاسایەکی ئەخلاقیش هەبێت کەئەو خەڵکە پێکەوە گرێ بداتەوە، جا لەرێگەی کڵێساوە بێت یان خێزان یان قوتابخانە، بۆ ئەوەی لەگەمەی ژیاندا پرەنسیپێك هەبێت یاریزانەکان رەچاوی بکەنو تەنانەت ئەوانە کەپێشێلیشی دەکەن دانی پێدابنێن[٧]. بەمە رەفتاری خەڵك کەمێك رێك دەخرێتو ئامانجێكو

جوولێنەرێکیش بۆخۆیان دیاری دەکەن. ڕەنگە ئەوەش هەر پێویست بێت کەبڕێك ڕێکەوتن لەنێوان خەڵکەکەدا هەبێت لەبارەی بیروباوەڕە سەرەکییەکان‌و وردە بڕوایەك بەهێزی پشتی سروشتەوەو بەوەش کە دەکرێ بە نموونەیەکی باڵا، چونکە ئەوە ئیتیك لەو قۆناغەوە دەگوازێتەوە کەتیایدا جۆرێك هاوسەنگی لەنێوان قازانج‌و زیانی کارکردن رادەگیرێت بەرەو قۆناغی ئەمەك بۆ خودی کار، هەروەك ژیانیشمان شەرەفمەندانەترو تەڕوبڕتر دەکات ئەگەرچی ماوەکەی زۆر کەمیش بێت‌و هەر خێرا مەرگ لێمانی بڕفێنێت. دواجاریش پەروەردەکردن زۆر پێویستە، مەبەستم ئەو ڕێگەیەیە کەچەندە سەرەتایی بێت بەکار دەهێندرێت بۆ گواستنەوەی کەلتوور لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر، چونکە دەبێت کەلەپوورو ڕۆحی هۆزو خێڵ بەجێ بهێڵین بۆ نەوەی تازەدەرکەوتوو، سوودو مەعریفەو ئیتیك‌و نەریت‌و زانیاری‌و هونەرەکانی هۆزیان بۆ بەجێ بهێڵین، ئیتر ئەو بەجێ هێشتنە لەڕێی لاساییکردنەوە بێت یان فێرکردن یان پێ لەبەرکردن، فێرکەرەکەش بەخێوکەر بێت یان باوك یان دایك یان مامۆستا یان قەشە، چونکە ئەو کەلەپوورە هیچ نییە جگە لەو ئامرازە بنەڕەتییەی ئەو پێگەیشتوانە لەقۆناغی ئاژەڵییەوە دەگوازێتەوە بۆ قۆناغی مرۆیی[٨].

خۆ ئەگەر ئەو فاکتەرانە نەبن -بگرە ڕەنگە ئەگەر یەکێکیان نەبێت- ئەوە لەوانەیە بنچینەکانی ژیار لەق ببن، چونکە هەڵگەڕانەوەیەکی جیۆلۆجی ترسناك، یان گۆڕانێکی توند لەکەشدا، یان پەتایەك کەکۆنترۆڵ نەکرێت وەك ئەو پەتایەی لەسەردەمی (ئەنتوانەکان)دا نیوەی دانیشتوانی ئیمپراتۆرییەتی رۆمی لەناوبرد، یان (مەرگی رەش) کەیەکێکە لەفاکتەرەکانی کۆتایی هاتنی سەردەمی دەرەبەگی، یان نەمانی بڕشتی زەوی، یان خراپ بوونی کشتوکاڵ بەهۆی زۆربوونی شارە گەورەکان بەبەراورد لەگەڵ دێهات، بەشێوەیەك خەڵك وەهایان لێ بێت لەژەمە خۆراکیاندا پشت بەو هەناردانە ببەستن کەبەبچڕبچڕی لەوڵاتانی ترەوە پێیان دەگات، یان لەبن هاتنی سامانە سروشتییەکانی

سووتەمەنیو کەرەستەی خاو، یان گۆڕانێکی وەها لەڕێگە بازرگانییەکاندا کە گەلێکی دیاریکراو لە ڕێگەی سەرەکیی بازرگانیی جیهانی دووربکەوێتەوە، یان گەندەڵبوونێکی لەقڵیو ئیتیکی بەهۆی ژیانی ناو شارە گەورەکان بەهەموو ئەو شتە شەکەتکەرو فریودەرو ئەو هەموو ئامرازانەی پەیوەندیکردن کەلەو شارانەدا هەن، یان بەهۆی لێك هەڵوەشانی ئەو بنەما کلاسیکییانەی سیستمی کۆمەلایەتییان راگرتبوو و نەبوونی بنەماگەلێکی تر کە جێگەیان بگرنەوە، یان لاوازبوونو نەمانی هێزی وەچەخستنەوە بەهۆی بێ سەرەوبەرەیی سێکسییەوە یان بەهۆی بلاوبوونەوەی فەلسەفەی ئەبیقۆریی رەشبینەوە یان هەر فەلسەفەیەکی تر کەهانی خەڵك بدات بۆ قێزەونکردنی هەوڵوکۆشش، یان لاوازیی سەرکردایەتی بەهۆی بێ تواناییەك کەیەخەی کەسە لێهاتووەکان دەگرێت یان بەهۆی کەمیی ڕێژەیی ئەو خانەوادانەی دەیانتوانی سەرلەبەری کەلەپووری هزری کۆمەڵەکە بەبێ کەموکورتی بگوازنەوە بۆ نەوەی داهاتوو، یان گردبوونی شێتگیرانەی سامان لەبازنەیەکی تەسکی وەهادا پاڵ بەخەڵکەوە بنێت بۆ شەڕی چینایەتیو شۆڕشی وێرانکارانەو ئیفلاسی ماددی. ئەمانە هەندێکن لەو فاکتەرانەی دەبنە هۆکاری لەناوچوونی ژیار، چونکە ژیار شتێك نییە بەفوڕی لەگەڵ ئینساندا گیرابێتەوە، نەخێر، شتێکیش نییە ڕێگەی لەناوچوون نەزانێت، بەڵکو شتێکە هەر نەوەیەك سەرلەنوێ لەنەوەکانی بەر لەخۆیەوە وەری دەگرێتەوە، جا ئەگەر پشێوییەکی ترسناك کەوتە فاکتەرە ئابوورییەکانییەوە یان کەوتە ڕێگاکانی گواستنەوەیەوە لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر ئەوە ڕەنگە ببێتە فاکتەرێك بۆ لە ناوچوونی. مرۆڤ بەیەك شت لەئاژەڵ جودا دەکرێتەوە ئەویش پەروەردەکردنە، مەبەستیشمان ئەو ئامرازەیە کەژیاری پێ دەگوازرێتەوە لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر[9].

ژیارە جیاجیاکان وەك چەند نەوەیەکی مرۆڤایەتی وەهان، چونکە هەروەك چۆن نەوە بەرودواکان بەهۆی هەبوونی خێزانەوەو دوای ئەوەش بەهۆی

نووسینەوە کەمیراتی باوانی پێ دەگوازرێتەوە بۆ رۆڵەکانیان، پێکەوە دەبەسترێنەوە، بەهەمان شێوەش چاپەمەنیو بازرگانیو هەموو شێوازەکانی تری پەیوەندی بەستنی نێوان خەڵك، ڕەنگە پەیوەندیی نێوان ژیارە جیاجیاکان تۆکمە بکەنو بەوەش هەر توخمێکی بەهاداری ژیاریەکەمان بۆ کەلتوورەکانی داهاتوو هەڵدەگرنو دەپارێزن، جا با بەر لەوەی مەرگ بەخەمان بگرێت کەلەپوورەکەمان کۆ بکەینەوەو بیدەینە دەستی رۆڵەکانمان"[1].

# باسی دووهەم

# توخمە ئابوورییەکانی ژیار

کەسی "هەمەجی" ئەگەر بەیەکێك لەمانا گرنگەکانی ژیار لێکی بدەینەوە ئەویش هەر شارستێنە، چونکە ئەویش مەبەستێتی کەلەپووری هۆزەکەی بگوازێتەوە بۆ رۆڵەکانی، کەلەپووری هۆزیش هیچ نییە بێجگە لەکۆمەڵێك سیستم‌و نەریتی ئابووری‌و سیاسی‌و ئەقڵی‌و ئیتیکی کەلەکاتی هەوڵی تایبەتی خۆیدا بۆ درێژەدان بەژیانی لەم سەر زەوییەداو بۆ چێژ بینین لەو ژیانە، جوانکاریی تێداکردوون، خۆ کارێکی مەحاڵیشە لەمبارەیەوە خۆمان وابەستەی سنوورەکانی زانیاری بکەین، چونکە کاتێك خەڵکێکی تر ناودەنێین (هەمەج) یان (کێوی) ئەوە بەو دەستەواژانە گوزارشت لەڕاستیەکی بابەتی (مەوزووعی) ناکەین، بەڵکو تەنهاو تەنها گوزارشت لەخۆویستییەکی لەرادەبەر دەکەین‌و لەدڵ گوشرانێك‌و دڵتەنگییەکی خۆمان کەشێوازێکی ڕەفتار لەخەڵکانێکدا بەدی دەکەین لەو شێوازە ناچێت کەخۆمان لەسەری راهاتووین. گومان لەوەدا نییە کە ئێمە لەبەهای ئەو گەلە نەزانانە کەم دەکەینەوە کە دەتوانن زۆر شتمان لەبارەی بەخشندەیی‌و ڕەفتاری جوانەوە فێر بکەن، ئەگەر بێین‌و بناغەو پایەکانی ژیار بژمێرین دەبینین گەلە زۆر کۆنەکان سەرلەبەری ئەو پایەو بناغانەیان دارێژاوەو بەهەمووی گەیشتووین مەگەر تەنها یەك شت نەبێت، هیچیشیان بۆ ئێمە نەهێشتۆتەوە بیخەینە سەر ئەو پایەو بناغانە بێجگە لەجوانکردنیان، مەگەر هونەری نووسینی لێ دەربکەین، کێ دەشزانێ، ڕەنگە ئەوانیش ڕۆژێك لەڕۆژان شارستێن بووبن‌و دواتر ئەو ژیاریەیان لەخۆیان تەکاندبێت لەبەرئەوەی زۆری ماندوو کردوون، بۆیە کاتێك دەستەواژەی ئەشێوەی (هەمەج)و (کێوی) وەك ئامازە

بۆ ئەو باووباپیرانە پێشینانەی خۆمان بەکاردەهێنین کە لەمرۆدا هاوچەرخی خۆمانن، دەبێت زۆر وریابین. ئێمە وامان بەباش زانی وشەی (سەرەتایی) بۆ هەموو ئەو هێزانە بەکار بهێنین کەزۆر گوێ بەپەدەگ خستن نادەن، یان زۆر گوێی نادەنێ، بەجۆرێك کەخۆراك بۆ ڕۆژگاری بێ برشتی خۆیان عەمبار ناکەن و، کەنووسینیان نییە یان کەمەو، لەبەرامبەردا وشەی (شارستێن) بۆ ئەو نەتەوانە بەکار دەهێنین کەدەتوانن بنووسن و لەڕۆژانی بەبرشتیاندا ئازووقە بۆ ڕۆژگاری بێ برشتی دەخەن".

## بابەتی یەکەم

## لە ڕاووشکارەوە بەرەو کێڵان

## کورتبینی گەلانی سەرەتایی - پەدەگ خستن - ڕاور ڕاوەماسی - ئاژەڵداری - هاوەڵی - ئاژەڵ - کشتوکاڵ -خۆراك - چێشت لێنان - خواردنی گۆشتی مرۆڤ

سیستمی خواردنی سێ ژەمە لەڕۆژێکدا سیستمێکی کۆمەڵایەتیی زۆر پێشکەوتووە، هەرچی نەتەوە هەمەجییەکانن ئەوە یان بەجارێك ئەوەندە دەخۆن خۆیان دەناوسێنن یان ماوەیەکی زۆر هیچ ناخۆن، ئەوەتا دەبینیت لەلای کێویترین هۆزەکانی هیندییە ئەمریکاییەکان هەر کەسێك خواردن بشارێتەوە بێ غیرەتەو زەوقی نییە، هەروەها دەشبینیت خەڵکە ڕەسەنەکەی ئوسترالیا هیچ کامێکیان ناتوانن هیچ کارێك بکەن ئەگەر پاداشتی ئەو کارەیان دەستبەجێ و دوای ئەنجامدانی کارەکە ڕاستەوخۆ نەگاتە دەستیان، هەر تاکێکی هۆزەکانی (هۆتنتۆت)یش بۆ خۆی ئاغایەکەو لەبۆشاییدا دەژی، ژیان لای هۆزی (بووشمەن)یش لەئەفەریقا یان داوەتێکی چەورە یان برسێتییە. ئەم کورتبینییە لەڕاستیدا وەك زۆر شێوازی تری ژیان و گوزەرانی هەمەجەکان داناییەکی بێدەنگی

تێدایە، چونکە ئەو کاتەی مرۆڤ دەست دەکات بەبیرکردنەوە لەڕۆژی دواتری، هەر ئەو کاتە بەهەشتەکەی عەدن (جنە عدن) بەجێ دەهێڵێتو ڕوودەکاتە شیوی خەمو پەژارەو ڕەنگ زەردی دایدەگرێ، لەوێوە ئیتر بەرچاوبرسێتی تەنگی پێ هەڵدەچنێتو خاوەنداری دەست پێدەکاتو ئەو مرۆ بەختەوەرە لێی جیا دەبێتەوە کەمرۆڤی سەرەتایی دەیناسێت، کە"هیچ بیرکردنەوەیەکی نییە". نیگرۆکانی ئەمەریکا ئەمرۆ ئەو قۆناغی گواستنەوەیە بەرجەستە دەکەن، (بیری) لەرێبەرێکی خۆی پرسی کەپیاوێکی ئەسکیمۆ بوو گوتی "بیر لەچ دەکەیتەوە؟"، لەوەڵامدا گوتی "هیچ شتێك نییە بیری لێ بکەمەوە، چونکە بەشی خۆم گۆشتم پێیە"، لەبەرئەوەی ئەو پەڕی دانایی لەوەدا هەیە کە مرۆڤ هەتا ناچار نەبێت بیر نەکاتەوە، ئەم بۆچوونە پاڵپشتێکی بەهێزی هەیە"[١٢].

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ژیانەی کەبێ پەژارە بەسەردەبرا بەشی خۆی ناڕەحەتیشی هەر هەبوو، ئەوانەش کە بەزیندوویی ئەو قۆناغەیان تێپەڕاند کەڵکێکی باشیان لێ چنییەوەو دواتر لەململانێیاندا لەپێناوی مانەوەدا یارمەتیدەریان بوو. ئەو سەگەی ئێسکێکی کرد بەژێر گڵەوە کەپێی نەخوراو، ئەو سمۆرەیەی بادەمێکی هەڵگرت بۆ ژەمە خواردنی ڕۆژێکی داهاتووی‌و، ئەو مێشەنگەی شانەکەی پڕ لەهەنگوین کردو، ئەو مێرووولەیەی خۆراکێکی زۆری کەڵەکەبووی عەمبار کرد بۆ ڕۆژێکی باراناوی، ئەوانە هەموویان یەکەم بنەچەی ژیار بوون، ئەوانەو هاوشێوەکانیان لەبوونەوەرە پێشکەوتوەکان، باووباپیرانی ئێمەیان فێرکرد ئەوەی ئەمرۆ لێیان زیادە عەمباری بکەن بۆ سبەینێیان، یان لەپاش هاوینی پڕ پیتو بەرەکەت خۆیان بۆ زستان ئامادە بکەن.

جا بڕوانە ئەوە چ کارامەییەك بووە ئەو باووباپیرانەمان هەیانبووە کە لەدەشتو دەرو ئاودا دەگەڕان بۆ ئەو خۆراکەی وەك بناغەیەکی ڕاوەستانی کۆمەڵگە ساویلکەکانیان وەها بوو؟ ئەوان بەدەستی ڕووت دەکەوتنە وێزەی ئەو شتانەی بەدەرەوەبوون‌و چەندی بۆیان بخورایە لێیان دەکردەوە، دەبینیت لاسایی

کەڵبەو چڕنووکی ئاژەڵیشیان دەگردەوە یان هەر ئەوانیان بەکار دەهێنا، هەر لەعاج و ئێسک و بەردیش ئامرازەکانی خۆیان دروست دەکرد، تۆڕو داوو تەڵەشیان لەریش و ژێی ئاژەڵان دەچنی، بێشومار ئامرازیان بۆ خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ڕاوکردنی نێچیرەکانی خۆیان چ لەدەشت‌ودەر یان لەناو ئاودا. خەڵکی بۆڵینیزیا تۆڕێکیان هەبوو درێژییەکەی ۱۰۰۰ پێ دەبوو، دەبوو سەد کەس پێکەوە بەکاری بهێنین، بەو جۆرە شتانە شێوازەکانی ئازووقەخستن لەپاڵ سیستمە سیاسییەکاندا گەشەی کرد، هەر ئەو یەکگرتنەی خەڵك بۆ بەدەستهێنانی خۆراك یاریدەدەری هاتنەئارای دەوڵەت بوو. بڕوانە ماسیگری هۆزی سلنگێت کلاوێکی لەشێوەی کەللەی گوێرەکەی ئاوی دەکردە سەری، دوایی لەنێو بەردەلانێکدا خۆی دەشاردەوەو لەشێوەی دەنگی ئەو جۆرە نەهەنگە دەیقیژاندو بەوەش گوێرەکە دەرياییەکان دەهاتن بەرەولای، ئەوسا بە ڕم دەکەوتە وێزەیان. ئەو کارەش بەهیچ جۆرێك ویژدانی بێزار نەدەکرد، چونکە بەشێوەیەك ڕوویدەدا کەلەگەڵ بارودۆخی شەڕە سەرەتاییەکاندا دەگونجا، خووی چەندین هۆزی تریش بەو جۆرە بوو کەمادەی بێهۆشکەریان دەهاویشتە بەر ئاوەکە هەتا دواتر بەئاسانی ماسییە گێژەکەیان بۆ بگیرێت. بۆ نموونە خەڵکی تاهیتی شلەیەکی بێهۆشکەریان دەهاویشتە ناو ئاوەکەوە کەلەجۆرە بادامێکی تایبەتی یان جۆرێکی تایبەتی لەهەر ڕووەکێکی تر دروست دەکرا، بەوەش ماسییەکان گێژ دەبوون و بەبێ گوێدانە ئەو مەترسییەی ڕووی تێدەکردن سەر ئاو دەکەوتن و ماسیگرەکەش چەندی بویستایە دەیگرت. ئوستراڵییە ڕەسەنەکانیش بەژێرەمەلە دەچوونە ناو ئاوەکەوەو لەڕێی قامیشێکەوە هەناسەیان دەدا، بەوەش هەلیان بۆ دەرەخسا قاچی ئەو قازە بگرن کەبەسەر ئاوەکەوە مەلەی دەکرد، ئەوسا قازەکەیان بەکێش دەکرد بۆ ناو قووڵایی ئاوەکەو هەتا گیانی تێدا بمایە دەستیان لێ بەرنەدەدا، کوڕانی هۆزی تاراهیومارا-ش بەوە مەلیان ڕاو دەکرد کەناوکە بادامیان دەخستە سەر کۆمەڵێك داوی بەهێزو

بەو داوانە دەیانبەستەوە کەنیوەیان لەزەوی دەچەقاند، بەوە مەلەکە ناوگە بادامەکەی دەخواردو ئەمانیش مەلەکەیان دەخوارد[13].

ڕاوکردن لەلای زۆربەی هەرەزۆری ئێمە لەئەمڕۆدا تەنها کات بەسەربردنە، ئەمە -ئەوەندەی من بزانم- چێژەکەی لەو یادەوەرییە نارۆشنانەدایە کەلەقووڵایی خوێنماندایەو دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارە کۆنەی راو تیایدا لای راوچیش‌و لای نێچیریش پەیوەندیی بەمان‌و نەمانەوە هەبوو، لەبەرئەوەی ڕاوکردن بەتەنها ڕێگەیەك نەبوو بۆ بەدەستهێنانی ژەمەخواردن، بەڵکو جەنگێکیش بوو لەپێناوی ئاسوودەیی‌و خۆزاڵکردن، جەنگێك بوو ئەگەر بەراوردی بکەیت بەهەموو ئەو جەنگانەی مێژوو باسیان دەکات، دەبینیت هەموویان لەچاو ئەودا تەنها ژاوەژاوێکی سادەن. تائێستاش مرۆڤ لەنێو دارستاندایەو لەپێناوی مانەوەی خۆیدا دەجەنگێت، چونکە ئەگەرچی ئاژەڵ لەو دارستانەدا بەویستی خۆی پەلاماری نادات تەنها مەگەر برسێتییەکی زۆر یان ترسێکی زۆری بوون بەنێچیر ناچاری بکات‌و ڕێگەی تری لەبەردەمدا نەبێت، بەڵام لەدارستاندا خۆراك بەشی هەمووان ناکات، هەندێك جاریش تەنها جەنگاوەر یان ئەو کەسەی ئاژەڵێکی جەنگاوەر بۆ خۆی بەکار دەهێنێت خۆراکی چنگ دەکەوێت. ئەوەتا مۆزەخانەکانمان پاشماوەکانی ئەو جەنگە فورسەی نێوان مرۆڤ‌و جۆرەکانی تری ئاژەڵ دەخەنە بەرچاومان، ئەوەتا چەقۆو تێلاو ڕم‌و تاشەبەردو تۆڕی ڕاوکردن‌و تەڵەو داوو تیرو ئەو کەرەستانەمان نیشان دەدەن کەمرۆڤی سەرەتایی لەرێیانەوە باڵادەستیی خۆی بەسەر زەویدا سەپاندوە، هەر ئەوانەشن ڕێگەیان بۆ نەوەیەك خۆش کردووە چاکەی ئەو مرۆڤە سەرەتاییانەی لەبەرچاو نییە، نەوەیەك ژیانی خۆی بەدوور لەمەترسییەکانی هەموو ئاژەڵان بەسەر دەبات، تەنها مەترسیی مرۆڤ خۆی لێ دەرچێت. هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ، پاش هەموو ئەو جەنگانەی ڕوویانداوە، ژیان کەسە بێتواناکان لەخۆی دوور دەخاتەوەو بەتواناکان دەهێڵێتەوە، بڕوانە چەند جۆر بوونەوەری زیندوو هێشتا لەسەر زەویدان‌و لەکۆششی خۆیان نەکەوتوون، زۆر جار

ئەوە ڕوودەدات کەئەگەر کەسێك بەپیاسە بەنێو دارستانێکدا تێپەڕێت تووشی سەرسوڕمانێکی زۆر ببێت بەهۆی ئەو هەموو زمانە جیاجیایەی لەوێ گوێی لێ دەبێت، یان ئەو هەموو جۆرانەی مێروو و خشۆك و گۆشتخۆرو مەل کە لەوێ هەن. مرۆڤ لەو کاتەدا وا هەست بەخۆی دەکات بەزۆر خۆی هەڵقورتاندبێتە ناو ئەو دیمەنە پڕ لەزیندەوەرەو، هەست دەکات سەرچاوەیەکی مەترسییەو هەموو ئاژەڵەکان لێی دەسڵەمنەوەو هەموویان لەرادەبەدەر رقیان لێی دەبێتەوە[٤].

کێ دەزانێت! ڕەنگە ڕۆژێك بەسەر جیهاندا بێت ئەم جۆرە چوارپێیانەو ئەو مێرووانەی ئەمڕۆ پێت وایە داوای بەزەیی لەمرۆڤ دەکەن و ئەو میکرۆبە وردانەی نازانین چییان لەدەست دێ بیکەن، ڕەنگە ڕۆژێك بەسەر جیهاندا بێت هەموو ئەو جۆرانە پێکەوە مرۆڤو هەر شتێك دروستکراوی دەستی مرۆڤە لووش بدەن، بەوەش هەسارەی زەوی لەم ئاژەڵە دووپێیە پاك بکەنەوە کەبێ راوەستان دەگەڕێت و شت دەدزێت و شت زەوت دەکات، هەروەها هەموو ئەو چەکە دەستکردە سەیرانەشی لەگەڵدا لووش بدەن و هەموو ئەو قاچانەش کەبەبێ گوێدانە هیچ شتێك بەرپێی خۆیان دەشێلن!

راوو ماسیگرتن دوو قۆناغی گەشەی ئابووری نەبوون، بەڵکو دوو ڕووی ئەو چالاکییانەن کەلەچارەیان نوسراوە لەبالاترین شکلی کۆمەڵگای ژیارنیشدا بمێننەوە. ڕۆژێك لەرۆژان ئەو دوو چالاکییە سەنتەری ژیان بوون، ئەمڕۆش بوونەتە دوو بناغەی شاردراوەی ئەو ژیانە، چونکە هەرچیمان هەیە لەئەدەب و فەلسەفەو هونەرو سرووتی پەرستن لەپشت ئەو راوچییانەوە خۆیان مەلاسداوە. هەر رێك دەڵێی ئەمڕۆ راوەکانمان لەرێی کەسانێکی ترەوە ئەنجام دەدەین کەئەوانمان کردۆتە جێگری خۆمان، لەبەرئەوەی خۆمان پێویستیمان بەجەربەزەییەکی زۆر هەیە تابتوانین نێچیرەکانمان بەئاشکراو بەبەرچاوانەوە بکوژین، بەڵام یادەوەرییەکانی ئەو راوە کۆنە تائێستاش جارجارە لەگەڵمان دەدەنەوە، لەو کاتەدا کەسەرقاڵی راونانی شتێکی بێتواناین یان ئەو شتەی

لەدەستمان هەڵدێ شاگەشکەمان دەکات. بگرە ئەو یادەوەرییانە لەیارییەکانی منداڵەکانماندا خۆیانمان نیشان دەدەنەوە، تەنانەت ئەو وشەیەی ئەمڕۆ بۆ یاریکردن بەکاری دەهێنین هەمان ئەو وشەیەیە کەبەمانای ڕاو دێت، کەواتە دواشتێك لەشیکارماندا بۆ ژیار پێی بگەین ئەوەیە ئەو ژیارە لەسەر پایەی خۆ ئامادەکردنی مرۆڤ بۆ خواردن ڕاوەستاوە، جا ئەگەر مەزنی هونەر لەکاتدرائیایەکدا یان لەتەلاری کاپیتۆلدا بەدی بکەیت، یان ئەگەر مۆزەخانەیەکی هونەری یان ئاهەنگێکی مۆسیقا ببینیت، یان ئەگەر ڕێت لەکتێبخانە یان زانکۆیەك بکەوێت، ئەوە باش بزانە کەهەموو ئەوانە ڕوخساری تەلارێکن کەلەپشتییەوە لاکە بەجێماوەکانی جەنگ حەشاردراون[٥].

مرۆڤ کاتێك ڕاوی کردە ئامرازێك بۆ گوزەرانی خۆی بەوە داهێنانێکی دانەهێنا، ئەگەر هەموو تواناکانی لەڕاودا قەتیس بکردایە ئەوکاتە تەنها بریتی دەبوو لەئاژەڵێکی گۆشتخۆرو دەخرایە لیستی گۆشتخۆرەکان، بەڵام مرۆڤایەتییەکەی ئەو کاتە دەستی پێکرد کەژیانی لەقۆناغی ڕاوەوە گەشەی کردو پێی نایە قۆناغێکی ئاسوودەترو نەبڕاوەو بەردەوامترەوە، مەبەستم ئاژەڵدارییە کە پێویستیی بەچەندین خەسڵەتی زۆر مەترسیدار هەبوو، چونکە پێویستی بەماڵیکردنی ئاژەڵ‌و بەخێوکردنی مەڕوماڵات‌و بەکارهێنانی شیرەکەیان هەبوو. ئێمە نازانین چۆن‌و کەی ماڵیکردنی ئاژەڵ دەستی پێکردووە، ڕەنگە ئەوە ئەو کاتە بووبێت کەڕاوچییەکان بەچکەکانی ئاژەڵە کوژراوەکەیان لەگۆڕەپانی ڕاوکردنەکە بەزیندوویی دەهێشتەوە، ئەو کاتەی دەیانبینی ئەو بێچوانە بێ دەسەڵات‌و بەستەزمان بوون، لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرنەوە بۆ شوێنی گوزەرانیان هەتا منداڵەکانیان گەمەیان پێ بکەن، مرۆڤ تاماوەیەك ئەو ئاژەڵەی ڕاوی بکردایە بەو جۆرە دەیخوارد، بەڵام پاش ماوەیەك کردیە ئامرازێکی باربەر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەکۆمەڵگا مرۆییەکەی خۆیدا وەك یەکێك لەخۆیان مامەڵەی لەگەڵ دەکرد، ئەو ئاژەڵە هاوەڵ بوو، خاوەن بەش بوو لەکارداو لەشوێنی نیشتەجێشدا،

دوای ئەوە سەردەمێك هات مرۆڤ گەیشتە ئەو ڕاستییەی کەزاووزێ لەنێوان جۆرە جیاجیاکاندا کارێکی مەحاڵە، بۆیە ئاژەڵەکانی خستە ژێر چاودێریی خۆیەوە، دواتر توانی لەهەر جووتێکی نێرومێ کەدەیگرتن رانێکی تەواو بۆ خۆی دروست بکات، هەروەها ژنیشی لەئەرکی درێژخایەنی شیردانی منداڵ حەواندەوە، بەوەی پاش تەمەنێکی دیاریکراو ئیدی شیری ئاژەڵی دەدایە منداڵەکانی، بەوەش ڕێژەی مردنی منداڵان کەمتر بۆوەو مرۆڤ سەرچاوەیەکی نوێی مسۆگەری بۆ خۆراك چنگ کەوت، ئەمە بووە هۆی زۆرتربوونی خەڵك‌و سەقامگیرترو بەردەوامتر بوونی ژیانیان، زاڵبوونی ئەم بوونەوەرە نوێگەرە بەهەیبەتەش، مەبەستم مرۆڤە، بەسەر زەویدا قالٌتر بۆوە.

هەر لەو کاتەدا ژن لەسەرجەم ئەشکەوتەکاندا بەرپێوە بوو بەرەو گەورەترین دۆرزینەوەی ئابووری، ئەویش ئەوەبوو بزانێت ئاخۆ خۆڵی ئەم زەوییە چ خۆراکێك دەتوانێت دەربدات بۆی، ئەو کاتەی پیاو سەرقاڵی راوی خۆی بوو ئەم خاکی چواردەوری دەوار یان کەپرەکەی ئەمدیواودیو دەکرد هەتا ئەو خۆراکەی لەسەر زەوی ڕێی لێدەکەوت بیپێچێتەوە، لەئوسترالیا خوو وەها بوو ئەگەر پیاو بچوایە بۆ راوو دوابکەوتایە ژنەکە دەکەوتە هەڵدانەوەی زەوی‌و گەڕان بەدوای هەر رەگێکدا بۆ خواردن دەست بدات، هەروەها بەروبووم‌و بادەمی دارەکانی لێدەکردەوە، هەنگوین‌و قارچك‌و دانەوێڵەو گەنم‌و جۆی کۆدەکردەوە کەسروشت بەرهەمی دەهێنان، هەتا ئێستاش هەندێك هۆزی ئوسترالیا ئەو دانەوێڵانە کۆدەکەنەوە کەسروشت بەرهەمیان دەهێنێت‌و هیچ هەوڵێك نادەن بۆ ئەوەی خۆیان تۆوی دانەوێڵە بووەشێنن‌و بدوورنەوە.

هەروەها هیندییەکانی شیوی ڕووباری ساکرامنتۆ هەر لەو قۆناغەدا ماونەتەوەو هەرگیز بەجێیان نەهێشتوە، بەمەش لەئێستاوە هەتا دنیادنیایە دەرفەتمان نابێت ڕۆژێك لەرۆژان ئەوە بزانین ئاخۆ کەی مرۆڤ پەی بەنەرکی دانەوێڵە بردوەو وەهای لێهاتووە لەبری کۆکردنەوەی دەست بکات بەوەشاندنی

لەزەویدا، ئەم سەرەتایانە ئەو نهێنییانەی مێژوون کەهەر لەڕێی بیروڕاو مەزەندەوە دەکرێ بەدەوریاندا بسووڕێینەوە، بەڵام مەحاڵە بگەینە ڕاستیی تەواوی حاشاهەڵنەگر لەبارەیانەوە، ڕەنگە شتەکە وەها بووبێت کەکاتێك مرۆڤ کەوتۆتە کۆکردنەوەی ئەو دانەوێڵانەی لەسروشتدا هەبوون، لەڕێی گەڕانەوەیدا لەشوێنی دانەوێڵەکەوە بۆ شوێنی گوزەرانەکەی خۆی، چەند دەنکێکی لێ کەوتبێت‌و دواجار ئەو لێکەوتنە ڕێگەی نیشان دابێت بەرەو ئەو نهێنییە مەزنەی لەگەشەی ڕووەکدا هەیە. ئەوەتا خەڵکانی هۆزی (گوانگ) بنەتۆویان لەزەویدا فڕێ دەداو لێی دەگەڕان خۆی بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە، بەڵام خەڵکی بۆرنیۆ کەبەنێو کێڵگەکاندا ڕەت دەبوون دەنکە تۆویان دەخستە ئەو چاڵانەی خۆیان بەداری نووکتیژ هەڵیان دەکەندن، ئەو دارە سادەترین ئامرازی کشتوکاڵ بوو مرۆڤ ناسیبێتی. بەر لەپەنجا ساڵ پێش ئێستا گەڕیدەکان لەوڵاتی مەدەغەشقەر ئەوەیان بینیبوو چۆن ژنان نووکی ئەو دارانەیان تیژ کردووەو وەك سەرباز بەیەك ڕیز ڕاوەستاون، دواتر ئیشارەتێکیان بۆ کراوەو بەدارەکانی دەستیان کەوتوونەتە چاڵکردنی زەوییەکەو هەڵگێڕانەوەی خۆڵەکەی‌و شاردنەوەی دەنکەتۆوەکەو دواتر خاکەکەیان سەرلەنوێ بەقاچ تەختکردۆتەوە، دواییش چوونەتە پێشەوە تاگەیشتوونەتە هێڵێکی تری کێڵگەکە.

قۆناغی دوای ئەوە لەگەشەی کشتوکاڵ‌و ئامرازەکانی کشتوکاڵیدا ئەو قۆناغەیە کەتیایدا پاچ بۆ کێڵانی زەوی بەکارهێنراوە، ئەوەش کاتێك مرۆڤ ئێسکێکی بەستۆتەوە بەسەری دارێکی قیتەوەو دارێکی تری تەختیشی لێ بەستوە کەبۆ ئەوە بەکاربێت بەقاچ پاڵی پێوە بنرێ، کاتێك کۆنکۆستادۆرس گەیشتە مەکسیك بینی ئەزەتیکەکان (گەلی ئەزەتیك) لەپاچ زیاتر بەهیچ ئامرازێك ئاشنا نین بۆ هەڵدانەوەی یان کێڵانی زەوی، دواتر کەئاژەڵ ماڵی کراو کانگا نەرم کرا، ئامرازی قورستر هاتەئاراوە، ئیدی پاچەکە گەورەتر بوو هەتا بوو بەگاسن‌و وای لێهات لەلێدانی پاچ زەوییەکە قووڵتر هەڵبداتەوەو بەوەش بەپیتی شاردراوەی زەوی

ئاشکرابوو، بەجۆرێك كەسەرگوزەشتەی مرۆڤ بەتەواوی گۆڕا، چەندین جۆری نوێی ڕووەکی چاند کەپێشتر خۆیان نەدەدا بەدەستەوە، هەروەها جۆری نوێی ڕووەکی هێنایە ئاراوەو ئەو جۆرانەی باشتر کرد کەپێشتر دەیڕواندن[٢٦].

دواجار مرۆڤ لەسروشتەوە فێری هونەری یەدەگخستن بوو بۆ پاشەڕۆژو فێری تێڕامان بوو لەئاکامەکانی کارەکانو هەروەها بیرۆکەی کاتیشی وەرگرت. کاتێك مرۆڤ بینی مەلە دارکونکەرەکان بادام لەتوێی داردا دەشارنەوەو بینی مێشەنگ هەنگوین لەشانەکاندا دەشارنەوە، زانی -ڕەنگیشە ئەم زانینەی پاش هەزاران ساڵی هەمەجییەتێك بوبێت کەتیایدا هیچ مانایەکی بۆ یەدەگخستن نەزانیووە- چۆن خۆراك بۆ پاشەڕۆژ عەمبار بکات، هەندێك ڕێگەشی زانی بۆ چۆنێتیی هەڵگرتنی گۆشت، بەوەی گەرمی دەکردەوەو خوێی دەکردو دوایی ساردی دەکردەوە، لەهەموو ئەوانەش باشتر کەلەمیانەی گەشەیدا پێی گەیشت ئەوەبوو کە زانی چۆن چاڵەگەنمی وەها دروست بکات گەنمەکەی لەباران‌و تەڕوتووشی‌و مێرووو و دزو چەتە بپارێزێت، هەر لەو چاڵانەدا بەشی شەش مانگ خۆراکیشی بۆ وشکەساڵی دەشاردەوە. بەم جۆرە پێی بەپێی ڕۆژگار ئەوە ئاشکرا بوو لەلای مرۆڤ کە کشتوکاڵ ڕەنگە سەرچاوەیەکی باشترو بەردەوامتریش بێت بۆ خۆراك لە ڕاووشکار، هەر ئەوەندەی لەو ڕاستییەش دڵنیابوو، مرۆڤ یەکێك لەو سێ هەنگاوە بنەڕەتییەی نا بەرەو پێش کەلەدۆخی ئاژەڵییەوە دەیخەنە دۆخی مرۆیی، ئەو سێ هەنگاوەش بریتین لەقسەکردن‌و کشتوکاڵکردن‌و نووسین.

ئێمە ناتوانین وەهای بێنینە بەر چاومان مرۆڤ بەیەك باز لەقۆناغی ڕاوکردنەوە چووبێتە ناو قۆناغی کێڵانی زەوییەوە، ئەوەتا زۆر هۆزی هیندییە ئەمریکاییەکان لەو قۆناغی گواستنەوەیەدا چەقیان بەستووەو لێی ڕەت نابن، لای ئەوان ڕاو بەیەکجاری بۆتە پیشەی پیاوان‌و زەوی کێڵانیش پیشەی ژنان، نەخێر، هەر ئەوەندەش بەس نییە بڵێیت ئەو گۆڕانکارییە بەچەند هەنگاوێکی پەیتا پەیتا ڕوویداوە، بەڵکو لەوە زیاتر دەبێت بڵێیت ئەو گۆڕانکارییە هێشتا

نەگەیشتۆتە تەواوبوون، هەروەك دەگرێت مرۆڤ لەرێی كێڵانی زەوییەوە تەنها شێوازێكی نوێی خستۆتە پاڵ شێوازە كۆنەكەی خۆراك عەمباركردن، پاشان لەڕاستیدا بەدرێژایی قۆناغەكانی مێژوو مرۆڤ زیاتر هەر خۆراكەكەی قۆناغی یەكەمی لەخۆراكی قۆناغی دووهەم لەلا باشتر بووە، دەتوانین مرۆڤی یەكەم بهێنینە بەرچاوی خۆمان چۆن خەریكی تاقیكردنەوەی هەموو جۆرەكانی ئەو خۆراكە بووە كە ناخی زەوی بۆی فڕێداوەتە دەرێ، بەڕادەیەك ئەندێشەیەكی زۆری تووش بووە لەپێناوی ئەوەدا جۆرێك لەو جۆرانە بدۆزێتەوە بتوانێت بەبێ ترس لەئاكامەكانی بیخوات، دواتر تاقیكردنەوە لەدوای تاقیكردنەوە خەریكی تێكەڵكردنی ئەو هەموو جۆرانەی خۆراك بووە جارێك لەگەڵ میوەجاتو جارێك لەگەڵ بەروبوومی درەختی ترو جارێك لەگەڵ گۆشتو ماسی كەپێشتر تاقیی كردبوونەوە، بەڵام لەمیانەی هەموو ئەو تاقیكردنەوانەدا هەرگیز تامەزرۆی هیچ شتێك نەبووە هێندەی تامەزرۆیی بۆ خواردنی نێچیرە راوكراوەكان. ئەوەتا ئێستاش دەبینیت گەلە سەرەتاییەكان تاڕادەی دڕندەیی ئارەزووی خواردنی گۆشت دەكەن، باخواردنی سەرەكیشیان لەڕاستیدا دانەوێڵەو سەوزەو ماست بێت، هەر ئەوەندەی ئاژەڵێكی مردارەوەبوویان تووش بێتو بزانن ئەوەندە نییە گیانی دەرچووە بەنەوسنییەكی بێوێنەوە پەلاماری دەدەن، زۆر جاریش واز لەلێنانی دەهێنن بۆ ئەوەی كات بەفیڕۆ نەدەن، هەر بەكاڵی دەكەونە خواردنی نێچیرەكەیان، تا ئەوەندەی دانە بەهێزەكانیشیان یارمەتییان بدات پەلە دەكەن لەلەتوپەتكردنو لووشدانی، ئیدی هێندە نابات ئێسقانێكی كەڵەكەبووی لێ دەهێڵنەوە. زۆرمان بیستووە لەسەر چەندین هۆز كە هەفتەیەكی تەواو لەسەر لاكی نەهەنگێك لەوەڕیون كەدەریا فڕێی داوەتە سەر كەنارەكانی. ئەگەرچی خەڵكی فویجی-یش هونەری چێشت لێنان بەباشی دەزانن، بەڵام بەكاڵی زیاتر حەز لەگۆشت دەكەن، ئەگەر ماسییەكیش بگرن لەپشت لوتەكانییەوە هەڵی دەدڕنو بەبێ هیچ ئامادەكردنو خۆشكردنێكی دەكەونە خواردنی هەر لەتەوقی سەرییەوە هەتا پەڕی

گلکی. گومانکردن لەبەردەوامبوون‌و وشك نەکردنی سەرچاوەکانی خۆراك وای لەو گەلە سەرەتاییانە کردووە هەرچییان تووش بوو بیخۆن، ماسی‌و سەگی ئاوی‌و بۆقی دەریاو بۆقی وشکانی‌و مشکی بچووك‌و گەورەو جالجالۆکەو کرم‌و دووپشك‌و کێچ‌و مێروو و کوللەو قومقومۆکەو بزنمژەو هەموو جۆرەکانی مارو سەگ‌و ئەسپ‌و رەگی درەخت‌و ئەسپێ‌و زالوو و چەند جۆرێکی خشۆك‌و مەل‌و...، لەهەموو ئەو جۆرانە جۆرێك نییە کەلەلای هۆزێکی سەرەتایی دیاریکراو نەبووبێتە خواردنێکی بەتام، لەناو ئەو هۆزانەدا هەیانە لەراوکردنی مێروولەدا بەناوبانگن‌و وەستایەتی تێدا دەکەن، هەیانە مێروو لەبەر خۆردا وشك دەکەنەوەو عەمباری دەکەن بۆ داوەتێکی چەور، هۆزی تر هەن ئەسپێ لەسەری یەکتری دەردەهێنن‌و دەیخۆن‌و زۆر چێژیشی لێ دەبینن، ئەگەر لەشوێنێکیش ببینن ئەسپێیەکی زۆر خڕ بوونەتەوە، دەستبەجێ هێرشیان بۆ دەبەن‌و بەدەم قیژەو هاواری ناهەنگئامێزەوە دەکەونە لوشدانیان، بەو پێیەی ئەو ئەسپێیە دوژمنی مرۆڤە، دواجار دۆزینەوەی ئاگر ئەو نەوسنییەی سنووردار کرد کە خواردنێك لەخواردنێکی تر جیا ناکاتەوە، ئاگرو کشتوکاڵ مرۆڤیان لەپشت بەستنی تەواو بە ڕاوکردن ئازاد کرد، لێنانی خواردنیش لەسەر ئاگر هەردوو توخمی سلیلۆزو نیشاستەی بۆ مرۆڤ توانەوە کە لەناو تاڵی ڕووەکە جۆربەجۆرەکاندان‌و وای لێدەکەن ئەگەر بەبێ دەستکاری بخورێت بەئاسانی هەرس نەکرێت، وردە وردەش مرۆڤ پشتی زیاتری بەدانەوێڵەو سەوزە بەست‌و کردنی بەخۆراکی سەرەکی خۆی، ئەگەرچی لێنانی خواردن لەسەر ئاگر بەو پێیەی خواردنە رەقەکان نەرمتر دەکات دەبێتە هۆی پێویست نەکردن بەجوین‌و لێرەشەوە گەندەڵبوونی دانی مرۆڤ دەستی پێکرد کە یەکێکە لەنیشانەکانی ژیار[٧].

دواتر مرۆڤ خۆراکێکی تری خستە سەر لیستی جۆرەکانی خۆراك کەلەهەموویان بەتامترو بەچێژتر بوو، ئەویش گۆشتی مرۆڤی هاوەڵی بوو، چونکە لە ڕۆژگاری خۆیدا خواردنی گۆشتی مرۆڤ لەناو هەموو خەڵکدا باو بووە،

تاڕادەیەك دەتوانین بڵێین لەناو هەموو هۆزە سەرەتاییەکاندا ئەو دیاردەیەمان هەست پێکردووە، هەروەك چۆن لەناو چەندین گەلیشدا بینیومانە کە لەمێژوویەکی دڕەنگدا بوونیان هەبووە، وەك دانیشتوانی ئایرلەنداو ئیبریاو کۆمەڵی بیکت، بگرە لەناو خەڵکی دانیمارك لەسەدەی پانزەهەمدا، گۆشتی مرۆڤ لای زۆر هۆز یەکێك بووە لەپێداویستییە سەرەکییەکانی ژیان‌و خەڵك نەریتی مردوو ناشتنیان نەزانیوە، تەنانەت خەڵکی کۆنگۆی باکوور بەپیاوو ژن‌و منداڵەوە بەزیندوویی کڕدراون‌و فرۆشراون، بەئاشکراش وەك سەرچاوەیەکی خۆراك کڕین‌و فرۆشیان پێوە کراوە[18]، لەدورگەی بەریتانیاش گۆشتی مرۆڤ لەدوکانەکاندا دەفرۆشرا بەهەمان شێوەی فرۆشتنی گۆشتی ئاژەڵ لەدوکانی گۆشتفرۆشەکانی ئەمرۆدا، هەروەها لەهەندێك دورگەی سلێماندا قوربانییە مرۆییەکانیان دادەناو قەڵەویان دەکردن –بەتایبەتی ژنەکانیان- بۆ ئەوەی وەك بەراز داوەتێکی چەوریان پێ رێك بخەن[19]، هەرچی خەڵکی فویجییە ئەوە پایەیەکی لەسەگ بەرزتریان دەدایە ژن لەبەرئەوەی "بەگوتەی خۆیان" تامی گۆشتی سەگ خۆش نەبوو، کاتێك (پیار لووتی) بەدورگەی تاهیتی-دا تێپەڕی سەرۆك هۆزێکی پیر لەسەرۆك هۆزەکانی پۆلینیزیا کەوتە باسکردنی خواردن بۆی‌و گوتی: " پیاوی سپی ئەگەر بەباشی ببرژێندرێ، تامی وەك تامی مۆزی گەیبو وایە"، بەڵام خەڵکی فویجی حەزیان لەگۆشتی پیاوی سپی نەبوو لەبەرئەوەی بەقسەی خۆیان گوایا سوێرییەکی زیاد لەپێویستی تێدایەو دەماری زۆرە، ئەگەر دەریاوانێکی ئەورووپایی بکەوتایەتە بەر چنگیان ڕەنگ بوو لەبەرئەوەی بەکاری خواردن نایەت لێی گەڕێن، بەلای ئەوانەوە پیاوی پۆلینیزیا تامی خۆشتر بوو[20].

ئینجا دەپرسین، سەرچاوەی ئەم خووە بۆچی دەگەڕێتەوە؟ شتێك نییە ئەوەمان بەتەواوی بۆ بسەلێنێت کە بگەڕێتەوە –وەك پێشتر خەڵکانێك مەزەندەیان کردبوو- بۆ کەمی جۆرەکانی تری خۆراك، خۆ ئەگەر وابێت، ئەوە دوای کۆتاییهاتنی ئەو بێبڕشتییەی لەسەرچاوەکانی تری خۆراکدا هەبوو، مرۆڤ

تازە فێر بووبوو چێژ لەخواردنی گۆشتی مرۆڤ ببینێت‌و ئەو خووەی واز لێ نەهێنا[21]، لەبەرئەوەی خوەکە تازە ڕەگی داکوتاو خواردنەکەش ئەوسی خەڵکی دەجووڵاند. ئەوە سروشتە، پێیدا بگەڕێ دەبینیت خوێنی مرۆڤ خواردنێکی بەتامەو هەرگیز کۆتەرەیەك لەو باشتر نییە، تەنانەت ڕووەکخۆرە سەرەتاییەکانیش زۆر خێرا لەسەری ڕادەهاتن‌و هەڵپەیان بۆ دەکرد، ماوەیەکی زۆر دوورودرێژ هۆزەکانیان خوێنی مرۆڤیان دەخواردەوە، ئەگەرچی ئەگەر لەهەلومەرجێکی تردا ژیانیان بەسەر ببردایە زۆر دڵنەرم‌و هەست ناسك دەبوون، جارێك وەك دەرمان دەیانخواردەوەو جارێك وەك جۆرێك لەنوێژو پەرستن‌و جارێك بەناوی ئەمەکداری بۆ بەڵێنێك، هەمیشەش بەو بڕوایەوە دەیانخواردەوە کە هێزی زیندووی پیاوە خوراوەکە دەداتە ئەو کەسەی خوێنەکە دەخواتەوە، کەسیش لەم ڕووەوە شەرمی لەوە نەکردووە حەزی لەگۆشتی مرۆڤ بوبێت[22]. وەك دەردەکەوێت خەڵکە سەرەتاییەکان وەك حوکمی ئیتیکی هیچ جیاوازییەکیان لەنێوان خواردنی گۆشتی مرۆڤ‌و خواردنی ئاژەڵدا نەکردووە، بگرە لەمالینیزیا جێی شانازی بوو سەرۆك هاوڕێکانی خۆی داوەت بکات بۆ خواردنی گۆشتی مرۆڤێکی برژاو، لەمەشدا سەرۆکێکی بەرازیلی کەفەیلەسووف بوو دەڵێت: "کەمن دوژمنەکەمم کوشت، دیارە بیخۆم باشترە لەوەی وازی لێ بهێنم‌و بەوە بەفیڕۆ بڕوات‌و کەس کەڵکی لێ نەبینێت.. خواردنی مرۆڤ خراپترین شت نییە، بەڵکو مردنەکەی خراپترین شتە، ئەگەر من کوژرام هیچ جیاوازییەکی نییە لەلام دوژمنی هۆزەکەم بمخوات یان فڕێم بدات، لەکاتێکدا من خۆم لەناو هەموو جۆرەکانی ڕاودا هیچ خۆراکێکم نەبینیوە هێندەی گۆشتی مرۆڤ بەتام بێت، بەڕاستیش ئێوە سپی پێستەکان لەبەتامیدا گەیشتوونەتە ئەوپەڕی"[23].

ئەوەی هیچ گومانێکی تێدا نییە ئەوەیە کە ئەو خووە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە گەلێك لایەنی باشەی هەبووە، چونکە خووەکە لەڕووی سەردەمەوە دەکەوێتە پێش پلانەکەی (سۆفت) سەبارەت بەکەڵك وەرگرتن لەو منداڵانەی بوونیان

پێویست نییه، دوای ئەوە دەرفەتێکیش دەخاتە بەردەم پیرەکان کە مردنێك بمرن سوودی تێدا بێت بۆ خەڵکی تر، بێجگە لەو بۆچوونەی دەڵێت توقووسی بەخاك سپاردنی تەرم خەرجییەکی زیادەیەو هیچ پێویست ناکات. بەبۆچوونی مۆنتینی "ئەشکەنجەدانی مرۆڤ لەژێر دەمامکی خوداپەرستیو تەقوادا تا ئەو کاتەی گیانی دەسپێرێت -کەئەوە لەسەردەمی ئەودا باو بووە- زۆر درندانەترە لەلێنانی گۆشتەکەیو خواردنی لەپاش ئەوەی دەمرێت، دەبێت هەر یەکێکمان ڕێز لەوەهمەکانی ئەوی تر بگرێت".

## بابەتی دووهەم

## بناغەکانی پیشەسازی

### ئاگر – ئامێرە سەرەتاییەکان – چنینو پیشەسازی سیرامیك – بیناسازی – بارگواستنەوە – بازرگانیو کاروباری پارە

ئەگەر مرۆڤایەتیی مرۆڤ بەئاخافتن دەستی پێ کردبێتو ژیار بەکشتوکاڵ دەستی پێکردبێت، ئەوە پیشەسازی بەو ئاگرە دەستی پێکردووە کەداهێنانی مرۆڤ خۆی نییە، بەڵکو بەلای زۆرەوە پێدەچێت سروشت، جا یان لەڕێی لێکخشانی لقو پۆپو گەڵای درەختەکانەوە، یان بەهۆی پریشکی هەورەتریشقەیەکەوە، یان بەناوێتەبوونی بەرێکەوتی چەند توخمێکی کیمیایی، ئەم شتە سەیرو سەمەرەیەی پێشکەش کردبێت. مرۆڤ هەموو زیرەکییەکەی تەنها لاساییکردنەوەی سروشتو تەواوکردنی کارەکانی بوو، هەر ئەوەندەش سەیروسەمەرەیی ئاگری زانی، ئیدی بەهەزارو یەك شێوە بەکاری هێنا، یەکەم شتیش بەمەزەندەی ئێمە ئەوەبوو مەشخەڵێکی لێ دروستکرد بۆ بەزاندنی دوژمنە ترسناکەکانی، دواتر بۆ گەرمبوونەوە بەکاری هێنا، بەوەش توانی لەناوچە گەرمەسێرەکانی خۆی دوور

بکەوێتــەوە بــەرەو ناوچــەگەلێکی نــوێ کەکــەمتر شــەکەتیان دەکــرد، بــەو جێگۆڕکێیــەش پەیتاپــەیتا هــەموو هەسارەی زەویــی ئــاوەدان کــردەوەو کردییــە مــەنزلگای خــۆی، دواتــر ئــاگری لەکانزاکانــدا خــستەکار، نــەرمی دەکردنــەوەو دەیکوتان‌و تێکەڵ بە یەکتری دەکردن بەجۆرێك رەقتر یان نەرمتری دەکردنەوە لەشکڵی یەکەمجار کە لەکاتی دۆزینەوەیاندا هەیانبووە. ئاگر لای مرۆڤی سەرەتایی بەرادەیەك سەیرو سەمەرەو بەکەڵك بوو لەلای بووبووە موعجیزەیەك شایستەی ئەوەی بکرێتە خوداوەندو بپەرسترێت، بۆیە ژمارەیەکی زۆر ئاهەنگی پەرستنی بۆ سازکردو کردیــە ســەنتەرێك بــۆ گــوزەران‌و بــۆ مــاڵی خــۆی، هــەر جــارێکیش لەجێگەیەکەوە بەرەو جێگەیەکی تر باری بکردایە لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرت‌و هانای بۆ دەبرد، قایل نەدەبوو بەهیچ جۆرێك خامۆش بێت، بگرە خودی رۆمانەکان بوون پاکیزەی بێگوناهیان لەسەر ئەوە لەسێداردا وەك سزایەك بەرامبەر ئەو کەمتەرخەمییەی نواندی‌و خەریك بوو ببێتە هۆی خامۆش بوونی ئاگرە پیرۆزەکەیان.

بەڵام مرۆڤ هەر لەو کاتەشدا کەهێشتا لەقۆناغی راوو ئاژەڵداری‌و کشتوکاڵدا بوو، هەمیشە داهێنەر بووە، مرۆڤی سەرەتایی بەردەوام ئەقڵی خۆی تیژ دەکردەوە بەو هیوایەی وەڵامی شیاوی دەست بکەوێت بۆ هەموو ئەو پرسانەی کە ژیانی ئابووری بەرپوویدا دەیورووژاندن ، مرۆڤ لەسەرەتای سەرەتاوە –بەرواڵەت- قایل بوو بەو شتانەی سروشت پێشکەشی دەکرد، قایل بوو بەرهەمی زەوی بکاتە خۆراکی خۆی، قایل بوو پێست‌و فەرۆی ئاژەڵ بکاتە پۆشاکی، ئەشکەوت‌و لاپاڵی گردەکان بکاتە شوێنی نیشتەجێی، دواتر بەمەزەندەی ئێمە (چونکە بەشی زۆری مێژوو مەزەندەیەو ئەوەی تریشی هەر کەسەو بەئارەزووی خۆی پری دەکاتەوە) کەوتە لاساییکردنەوەی کەرەستەکانی ئاژەڵان‌و دروستکردنی ئەو کەرەستانە، ئەوەبوو مەیموونی دەبینی چۆن بەردو بەری میوەجات دەگرێتە دوژمنەکانی، یان چۆن گوێزو گوێچکە ماسی بەبەرد دەشکێنێت، دواتر سەگگلاوی دەبینی چۆن

بەربەستی ئاو بۆ خۆی دروست دەکاتو مەلی دەبینی چۆن هێلانەو جێگەی هێلکە بۆ خۆی ساز دەکات، شامپانزیی دەبینی چۆن ماڵێك بۆ خۆی دروست دەکات کە تەواو لەو کەپرانە دەچوو کەمرۆڤ دروستیان دەکات، بۆیە ئیرەیی بەو هێزە برد کە ئەو ئاژەڵانە لەچنگو دانو کەڵبەو شاخەکانیاندا هەیانبوو، ئیرەیی بەپێستە جیرەکەیان دەبرد، هەربۆیەش دەستبەجێ کەوتە دروستکردنی کەرەستەو چەکی هاوشێوەی چەكو کەرەستەکانی ئەوان، بگرە لەوانەی ئەوانیش باشتر، چونکە مرۆڤ (وەك فرانکلین دەڵێت)[٢٤] ئاژەڵێکی کەرەستە دروستکەرە، بەڵام ئەم خەسڵەتەش (دیسان وەك هەموو ئەو خەسڵەتانەی تری مرۆڤ کەخۆمانی پێوە بادەدەینو هەڵدەکێشین) تەنها لەڕووی پلەوە باڵاییە لەبەردەم ئاژەڵاندا نەك لەڕووی جۆرەوە. ئەو ڕووەکەی لەژینگەی مرۆڤی سەرەتاییدا هەبوو سەرچاوەی زۆربەی کەرەستەکانی بوو، مرۆڤ لەداری قامیش تیرو چەقۆو دەرزیو گۆزەی ئاوی دروستکرد، هەروەها لەلقوپۆی درەخت مەقاشو قولاپی ماسیگرتنی دروستکرد، لەتوێکڵو دەماری درەختیش جۆرەها بەنی جۆری پۆشاکی دروستکرد، بێجگە لەهەموو ئەوانەش مرۆڤ دارەدەستی بۆ خۆی دروستکرد، ئەو دارەدەستەش چەندە داهێنانێکی سادە بوو بەڵام هێندە بەکەڵك بوو هەردەم مرۆڤ وەك هێمایەکی هێزو دەسەڵات لێی دەڕوانی، هەر لەدارە جادووییەکەی لای زاوا جنۆکەکانەوەو، لەدارگۆچانی شوانەکانەوە هەتا دارەدەستەکەی موسا یان هارون، دواتریش ئەو دارە عاجییەی باڵیۆزەکان لەڕۆژگاری دەوڵەتی ڕۆمانەکاندا دەبوو بیگرن بەدەستیانەوەو، ئەو تێلایەی فالگرەکان ڕوویان دەکردە نادیارو پاشان ئەو دارەی دادوەر یان شا دەیگرت بەدەستەوە. هەر ئەو دارە لەکشتوکاڵدا دواتر بوو بەپاچ، بەڵام لەجەنگەکاندا بوو بەخەنجەر یان تیر یان ڕم یان شمشێر یان چەقۆ[٢٥]. بەهەمان شێوە مرۆڤ کانزاکانیشی قۆستەوەو لەبەرد ئەو چەکانەی دروستکرد کەئەمرۆ پیشانگاکان دەڕازێننەوە، چەکوشو مێخو قاپی ئاوکوڵاندنی لێ دروستکرد، هەروەها چەقۆو سەرەڕمو مشارو پلێتو ئاخورو نوێڵو پاچو

درەوشـەی لـێ دروسـتکرد، ئامرازەکـانی خـۆی لـەجیهانی ئـاژەڵانیش دروسـتکرد، بێـژنگی دروسـتکرد، کەوچـك، قـاپ، دەوری، پـەرداخ، لەنگـەرو تـۆڕ، هـەموو ئـەم شـتانەی لەگوێـچکەماسیی پـەرش‌وبلاوی کـەنارەکان دروسـتکرد، شـتی تـری زۆر زەبـەلاح‌و زۆر وردیـشی لەشـاخ‌و لەکەڵبـەو ددان‌و ئێـسك‌و مـوو و پێـستی ئـاژەڵ دروستکرد، هەموو ئەو شتانەش دەسکی تەختەیان بەشێوەیەك پێوە دەبەسترایەوە کەنیشانەی کارامەیی وەستاکانیان بوون، چونکە ئـەو دەسکانەیان بەتۆپەڵەمووی لوولـدراو یـان بـەگوریس یـان بـەدەماری ئـاژەڵ دەبەسـتەوە، هەنـدێك جـاریش بەکەتیرەیـەك دەیانبەستەوە کـە لەتێکەڵەیـەکی سـەیری خـوێن ئامادەیـان دەکـرد. لێهـاتوویی مرۆڤـی سـەرەتایی بـەلای زۆرەوە هاوتـا (یـان ڕەنگـە بـالاتر بووبێـت) لەلێهاتوویی کەسێکی ئەم چاخە نوێیەی ئێمە کە ژیرییەکی مام ناوەنجیی هەبێت، ئەگەر ئێمە جیاوازیش بین لـەو سـەرەتاییانە، ئـەوە بـەهۆی چاکەی ئـەو زانیـاری‌و ئامرازو کەرەستانەوەیە کە لەبەردەستماندا کەڵەکە بـوون، جیـاوازیی ئێمـە لەگـەڵ ئەواندا ناگەڕێتەوە بـۆ بالاییـەکی ژیـری کـەبڵێین خەسـڵەتی ئێمـە بێـت بەبـەراورد لەگەڵ ئەواندا، بەڕاستی ئەو ڕۆڵانەی سروشت شاگەشگەییەکی سـەیر دایانـدەگرێت لەو کاتەدا کە کۆسپێك دەبەزێنن، بەزاندنێك لەگەڵیدا هەست بـەوە بکـەن مێشکی داهێنەرانـەی خۆیـان تێـدا بـەکارهێناوە. ئـەوەتا یـەکێك لـەو ئـامرازی کـات بەسـەر بردنانەی ئەسکیمۆکان زۆر حەزیان لێیەتی ئەوەیە کـە دەچنـە شـوێنێکی سـەخت‌و چـۆڵەوانی، ئەوسـا لـەوێ دەکەونـە پێـشبڕکێی ئـەوەی کـێ دەتوانێـت ئامرازێـك دابهێنێت بەکەڵکی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو پێداویستییانەی ژیـان بێـت کـە تائـەو کاتە شتێکیان نەبێت بۆ ئەو بوارە پشتی پێ ببەسترێت[٣٦].

لێهاتوویی مرۆڤی سەرەتایی لەهونەری ڕستندا بەشێوەیەك دەردەکەوێت کەشایستەی ئەوەیە شانازی پێوە بکەن، لێرەشدا جارێکی تر مرۆڤ لەڕێوڕۆیشتنیدا وانە لەئاژەڵەوە وەردەگرێت، لەبەرئەوەی تاڵە چنراوەکانی جاڵجاڵۆکەو هێلانەی مەل‌و پێکداپژانی تاڵ‌و گەڵاو بەیەکداچوونیان لەو دیمەنە چنراوە سروشتییەدا

کەلەدارستاندا هەیە، هەموو ئەوانە نموونەیەکی دیار بوون بۆ مرۆڤ کەهەستیان ڕادەکێشا، ئەو نموونەیە هێندە ڕوونە وامان لێدەکات بەلای زۆرەوە گومانمان بۆ ئەوە بچێت رستن لەکۆنترین ئەو هونەرانە بژمێرین کە مرۆڤ دایهێناون. ئەوەتا موو و گەڵاو تاڵو گیای دەرِستو پۆشاکو مافوورو جاجمی بۆ داپۆشینی دیوارەکانی لێ دروست دەکردن، ئەوەندەش دەستڕەنگین بوبوو لەهەندێك کاتدا ئەگەر بەپیشەسازی ئەم ڕۆژگارەدا بگەڕێیت بەو هەموو کەرەستەو ئامرازانەوە کەئێستا هەن، شتێك نابینیت لەدەستکردەکانی ئەوان باشتر بێت. ژنانی ئالوشیا ساڵێکی ڕەبەق بە ڕستنی کراسێك بەسەر دەبەن، هیندییەکانی ئەمریکای باکووریش بەتانیو جاجم دروست دەکەنو دواتر برژانگی بۆ دەکەنو مووی تێ دەئاخنن لەگەڵ تاڵی قامیشی ڕەنگکراو بەجوانترین ڕەنگو ڕەنگەکە لەروەکی توو دەردێنن، هەتا ئەوەی قەشە تیۆدۆت لەبارەی ئەو ڕەنگانەیانەوە دەڵێت[٢٧]: "ئەوەندە ڕوونن بە ڕادەیەك بڕوا ناکەم ڕەنگەکانی ئێمە بەلاشیاندا بچن". هونەر ئەو کاتە دەستی پێکرد کە سروشت کۆتایی هات، ئەوەتا ئەوە ئێسکی مەلو ماسی، ئەوەش قامیشی حەیزەرانی ورد، مرۆڤ بەشێوەیەك دەستی تێ خستوون کردوونی بەدەرزی، ئەوە دەماری ئاژەڵ کە کراوە بەتاڵە دەزووی ئەوەندە وردو باریك بەکونی دەرزیی بەرگدرِوودا ڕەت دەبێت، چەند ئەو کونی دەرزییە تەسكو باریکیش بێت. هەروەها مرۆڤ لەموو فەرشو قوماشی دروستکردووە، پێستی ئاژەڵیشی وشك کردۆتەوەو پێڵاوو پۆشاکی لێ دروستکردووە، تاڵیشی لێك ئاڵاندوەو ڕستنێکی ئەوەندە بەهێز ڕستوونیو پاشان لقە نەرمو تاڵە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئەوەندە چنیوەو سەبەتەیەکی لێ دروست کردوون زۆر جوانتر لەوەی لەچاخی نوێدا لەو بوارەدا بەرهەم دەهێنرێ[٢٨].

پیشەسازیی کووپەڵە دروستکردنیش زۆر لەپیشەسازی سەبەتە دەچێت، بەڵکو ڕەنگە لەوەوە وەرگیرابێت، چونکە ئەوان قوڕە گیراوەکەیان لەسەر چوارچێوەیەك لەچڵی شۆڕەبی دەگرتەوە بۆ ئەوەی لقەکان نەسووتێن[٢٩]، بەوەش قوڕەکە قاوغێکی

وشك دەبۆوەو ئیدی نەدەسووتا، بەوە ئەگەر چوارچێوەی بییەكەشی لێ بكرایەتەوە شێوەی وەك خۆی دەقی دەگرت. ڕەنگە ئەمە یەكەمین قۆناغی ئەو ڕێگایە بوبێت كە وردە وردە گەشەی كردو لەپیشەسازیی گووپەڵەی ناسراو بە(بۆرسەلان)دا گەیشتە چڵەپۆپە، یان ڕەنگە تیشكی خۆر چەند پارچە قوڕێكی وشك كردبێتەوە كە خراونەتە بەری‌و ئەوەش ڕێی نیشانی مرۆڤ دابێت بۆ پیشەسازیی گووپەڵە، دوای ئەوە مرۆڤ تەنها یەك هەنگاوی دەمێنێت بینێت، ئەویش ئەوەیە كەتیشكی خۆرەكە بگۆڕێتەوە بەئاگر، دواتریش لەخۆڵی زەوی قاپی هەمەچەشنە بۆ خۆی دروست بكات كە لەبوارە جیاجیاكانی ژیانیدا بەكاریان بهێنێ، بۆ چێشت لێنان، بۆ عەمباركردن، بۆ شمەك گواستنەوە، دواجاریش بۆ ڕازاندنەوەو خۆدەرخستن، ئەو نەخشانەش كە بەنینۆك یان بەئامرازە تایبەتییەكانی خۆی لەسەر قوڕە تەڕەكە دەینەخشاندن بەر لەوەی وشك بێتەوە، ئەوانە وێنەیەكی هونەری بوون لەیەكەمین سەرهەڵدانی هونەردا، هەروەك ڕەنگە یەكەمین سەرچاوەی نووسینیش بووبن.

هۆزە سەرەتاییەكان خشتیشیان هەر لەو قوڕە دروستكرد كەخۆر وشكی دەكردەوەو لەوەوە خانوویان بۆ خۆیان دروستكرد، دواتر لەو خانووانەدا نیشتەجێبوون كە دەكرێت ناویان بنێین ماڵە نەخشینەكان، بەڵام ئەو خانووانە یەكەمین شێوەی بیناسازیی مرۆڤ نین، ئەو خانووانەی كە لە كەپرێكی قوڕینەی شوێن نیشتەجێی هەمەجێكەوە گەشەیان كرد تاگەیشتنە ئاستی بەردی تایبەتی بیناسازیی كەلەتەلارەكانی نەینەواو بابلدا دەبینرێن، ئەم گەشەكردنەش ئەڵقە بەئەڵقەو بەگرێدراوی بەیەكەوە زنجیرەی بەست بەشێوەیەك كەهەر یەكەیان دەبووە هۆكار بۆ ئەوەی دوای خۆی، هەندێك هۆزی سەرەتایی وەك فیداوییەكانی نیشتەجێی دورگەی سیلان خانوویان نەبوو تیایدا نیشتەجێ بن، ئەوان ئەوەندەیان بەس بوو زەوی بكەنە ڕاخەرو ئاسمان بكەنە جاجمیان، هەندێكیشیان وەك خەڵكی تسمانیا، پەنایان بردە بەر كلۆرە بەتاڵەكانی درەختەكان، هەندێكی

ن یان وەك دانیشتووانی باشووری نیووێڵز ئەشکەوتیان کردە خانەی خۆیان، هەندێکیان وەك بۆشمەنەکان بەربەستیان لێرەو لەوێ لەلقی درەخت دروست دەکردو بەو بەربەستانە خۆیان لە با دەپاراست ، زۆر بەدەگمەنیش بەردیان لەزەوی دەچەقاندو بەقەوزەو لقەدار دایان دەپۆشی، هەر ئەو بەربەستانەی بۆ خۆپاراستن لە ڕەشەبا دروست دەکران بوونە کەپر، ئەو کاتەی لەتەنیشتەکانیانەوە لایان بۆ دروستکرا، هەر لەبەرئەوەشە کەلەهەموو قۆناغەکانی گەشەکردنیدا دەبینیت کەپر لای دانیشتوانی ڕەسەنی ئوسترالیا هەر لارە، ئەمە لەهەموو کەپرەکانیاندا هەر بەو شێوەیە دەیبینیت، لەسەرەتاکانەوە کەکەپر لەلقەدارو گیاو خۆڵ دروستدەکراو تەنها جێگەی دوو کەس هەتا سێ کەسی تێدا دەبۆوە، هەتا دەگاتە ئەو کەپرە گەورانەی سی کەسو بەرەوژوور دەگرن، هەرچی بیابان نشینیشە، ئیتر ڕاوچی بێت یان شوانکارە، ئەوە خێوەتی پێ باشتر بوو بۆ خۆی تا بتوانێت بۆ هەر شوێنێك دوای نێچیرەکەی کەوت لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێت، بەڵام چینە بەرزەکانی هۆزە سەرەتاییەکان، وەك هیندییەکانی ئەمریکا، ئەوە تەختەیان بەکار دەهێنا لەبیناکردنی کەپرەکانیاندا، بەهەمان شێوە هۆزی ئیراکوا-یش لەو دارەی کەهێشتا توێکڵەکەی پێوە مابوو خانوویەکی فراوانیان دروست دەکرد کەدرێژییەکەی دەگەیشتە ٥٠٠ پێو ژمارەیەکی زۆر خێزانی دەگرتەخۆی، لەکۆتاییشدا دەبینیت خەڵکی ئۆقیانووسیا خانووی ڕاستەقینەیان لەپلێتی تەختە دروست دەکرد کەزۆر وەستایانە دادەتاشراو بەو خانووانە گەشەی خانووی تەختە گەیشتە دوا پلەی خۆی[٢٠].

مرۆڤی سەرەتایی تەنها سێ هەنگاوی مایەوە لەسەر ڕێگەی ئەو گەشەیەی دەیگەیاندە سەرلەبەری پێداویستییەکانی ژیاری ئابووری: ئامرازەکانی گواستنەوە، پرۆسەکانی بازرگانی، شێوازەکانی ئاڵوگۆڕی شمەك. ئەگەر بڕوانیتە ئەو باربەرەی باری فرۆکەیەك دادەگرێت کەتازە نیشتۆتەوە بۆ سەر زەوی، شێوازی گواستنەوەی شمەك لەیەکەم قۆناغییەوە هەتا دواهەمین قۆناغی پێکەوە دەبینیت، گومان

لەوەدا نییە پیاو لەسەرەتادا خۆی باری خۆی لەکۆڵ دەنا، مەگەر هاوسەری بگرتایە، ئەو کاتە ژنەکەی دەبوو بارەکەی هەلگریت، بەڵکو هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆش دەبینیت مرۆڤی باشوورو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەر خۆی گالیسکەو گوێدرێژو هەموو شتێکی خۆیەتی، دواتر گوریس‌و نوێڵ‌و خولخولۆکەی داهێنا، جڵەوی ئاژەڵیشی گرت‌و کردیە باربەری خۆی، دواتر یەکەمین جۆری بارهەلگری دروستکرد کەمێژوو پیشانی دابین، ئەویش ئەوەبوو وەهای دەکرد ئاژەڵەکانی لقەداری درێژ بەدوای خۆیاندا بەسەر زەوییەکەدا رابکێشن‌و شمەکەکانی خۆی دەهاویشتە سەر ئەو لقەدارانە، دواتر کۆتەرەداری لەشێوەی تایە هێناو خستیە ژێر ئەو دارە بارکێشانەوە، دواتر ئەو کۆتەرانەی بەپانی بڕییەوەو بەوە گەیشتە مەزنترین داهێنانی میکانیکی کەبریتی بوو لەتایە، چونکە تایەکانی خستە ژێر بارکێشەکەوەو بەوەش گالیسکەی دروستکرد، هەر لەکۆتەرەی دار کەڵەکی دروستکرد بۆ پەڕینەوە لەئاو، ئەوەش بەوەی کۆتەرەکانی پێکەوە بەستەوە، هەروەها بەلەمیشی دروستکرد بەوەی کۆتەرەکەی هەلکۆڵی‌و ناوەکەی بەتاڵکردەوە، هەر ئەوەندەی ئەوەشی بۆ مەیسەربوو ڕووبارەکان لەبەردەمیدا بوونە ڕێگایەکی ئاسانتر بۆ گواستنەوەی شمەك، هەرچی وشکانیشە ئەوە سەرەتا بەدەشت‌و بەرزاییەکاندا کەرێگەی هاتوچۆیان تێدا نەبوو ڕێگەوبانی بۆ خۆی دروستکرد، دواتر هێڵێکی بۆ گالیسکە خۆشکرد، دواجاریش ڕێگەی بەتەواوی تەخت‌و خۆشکرد بۆ خۆی، لەدوای ئەوەش کەوتە لێرامانی ئەستێرەکان‌و بەچیاو بیاباندا کاروانەکەی لێدەخوڕی‌و بەسەیرکردنی ئاسمان ڕێگەی دەدۆزییەوە، مرۆڤ کەوتە بەرەو پێشبردنی بەلەمەکەیشی چ بەسەوڵلێدان‌و چ بەچارۆکە بادان هەتا بەوپەڕی ئازایەتییەوە دورگە لەدوای دورگە لەدەریاش پەڕییەوە، لەدوای هەموو ئەوانەش زەریای بڕی‌و کەلتووره هەژارانەکەی کیشوەر بەکیشوەر بڵاوکردەوە، لەمڕووەوە بەر لەدەستپێکردنی مێژووی نوسراو کاروباری مرۆڤ بێ گرفت دەگوزەرا.

لەبەرئەوەش هێزە مرۆییەکانو سەرچاوە سروشتییەکان بەچونیەکی بەسەر زەویدا دابەش نەبوون، بۆیە دەبینیت گەلێکی دیاریکراو بەهۆی گەشەکردنی تواناو ئامادەباشییەکانی خۆیەوە، یان بەهۆی نزیکییەوە لەکەرەستە پێویستەکان، توانایەکی لەدروستکردنی هەندێك شتی دیاریکراودا پەیداکردو بەتێچوونێکی کەمتریش لەوەی دراوسێکانی دەیانویست بۆ بەرهەمهێنانی هەمان ئەو شتانە، بەوەش کەوتە دروستکردنی لاپەسای ئەو شتانە هەتا ئەوەندەی لەپێویستیی خۆی زیاتری بەرهەم هێنا، دیارە ئەوسا ئەوەی لێی زیاد دەبێت دەیداتە دراوسێکانی بەرامبەر ئەو شتانەی ئەوان بەرهەمی دەهێنن، هەر ئەم ئاڵوگۆڕەش سەرەتای بازرگانییە. هیندییەکانی شیشا لەکۆلۆمبیا بەردی خوێیان هەناردە دەکرد کەلەولاتەکەیاندا زۆر بوو، بەرامبەر ئەو خوێیەش دانەوێڵەیان هاوردە دەکرد کەمەحاڵ بوو لەزەوییە وشکەکانی ئەواندا سەوز ببێت، هەندێك گوندی هیندییەکانی ئەمریکاش لەوەدابوون پسپۆڕی لەبواری دروستکردنی سەرەڕم دا پەیدا بکەن، لەکاتێکدا هەندێك گوندی نیوگینیا لەدروستکردنی قاپو قاچاخی قوڕیندا تایبەتمەندن، بەهەمان شێوەش لەئەفەریقا دەبینیت هۆزگەلێك هەن ئاسنگەرییان کردۆتە پیشەی خۆیان، هەندێکیشیان پیشەسازیی بەلەم یان ڕم، ئەو جۆرە پیشە تایبەتییانەش زۆر جار بۆ هۆزو گوندەکان بۆتە هۆی ناونانیان بەناوی پیشەکانیانەوە (ئاسنگەر، یان ماسیگر، یان کوپەڵەچی..)، پێ بەپێی کاتیش هەر ئەو ناوانە گوێزرانەوە بۆ ئەو خانەوادانەی پسپۆڕییان لەم پیشەو لەو پیشەدا وەردەگرت. بازرگانیش بەبەرهەمە زیادەکانەوە سەرەتا ئاڵوگۆڕکردنی دیاری بوو، بگرە تەنانەت لەم ڕۆژگارەدا کەهەموو شتێك بەحسابو کتابە ڕەنگە هەر دیارییەك (هەتا ئەگەر داوەتێکی نانخواردنیش بێت) یان پێشەکیی سەودایەکی بازرگانییە یان پاشەکییەکەیەتی، ئەوەی ئەو ئاڵوگۆڕەشی ئاسانتر کرد لەکاتی خۆیدا شەڕو دزیو سەرانەو جەزاکردنو فەرەبووکردنەوەو ئەو شتانە بوون کەهەموو ئەو ئامرازانە وایان کرد کاڵاکان لەم ناوچە بۆ ئەو ناوچە بجووڵێن.

مرۆڤ نەیدەتوانی رێ لەو پرۆسەیە بگرێت، پاشتر وردە وردە سیستمی ئاڵوگۆڕ کەوتە سەرهەڵدان، ئیدی ناوەندەکانی بازرگانیو بازاڕو دوکان دامەزرێندران، ئەمیشیان سەرەتا ناوەناوە بەبێ هیچ بەرنامەیەك بەڕێوەدەچوو، دواتر لەوادەی دیاریکراوو زانراودا، دواتریش بوو بەهەمیشەیی. لەو شوێنانەدا وەها لەهەر کەسێك کرا کەکاڵایەکی هەبوایەو خۆی پێویستیی پێ نەبوایە، بیخاتەڕوو بەرامبەر ئەو کاڵایەی پێویستێتی[٦١].

بازرگانیکردن ماوەیەکی زۆر لەو ئاڵوگۆڕە تێپەڕی نەکرد، چەندین سەدەی ویست هەتا ئەوەی ئامرازێك دابهێنرێ بەهایەکی خۆی هەبێتو جووڵەی بازرگانی خێراتر بکات، ئەوەتا هەر پیاوێکی دیاك بۆی هەبوو بەتۆپەڵێك شانە هەنگوینەوە چەندی حەز بکات کووچە بەکووچەی بازاڕەکە بگەڕێتو بەدوای کڕیارێکدا بگەڕێت کە بتوانێت ئەو تۆپەڵە هەنگوینەی لێوەرگرێتو بەرامبەرەکەی شتێکی بداتێ بۆ ئەم کەڵکی زیاتر بێت[٦٢]. یەکەمین ئامرازەکانی ئاڵوگۆڕیش ئەو کاڵایانە بوون کەهەموو مرۆڤێك دەیویستنو هەموو فرۆشیارێك وەك نرخێك بەرامبەر کاڵاکانی خۆی وەری دەگرتن، وەك خورماو خوێو پێستەو خوریو خشڵو کەرەستەو چەك، لەم چەشنە ئاڵوگۆڕەشدا دوو چەقۆ بەرامبەر جووتێك گۆرەوی بوو، سیانیش پێکەوە بەتانییەکیان دەکرد، بەچواریش بەرامبەر تفەنگێك بوون، بەپێنجیشیان دەیانکردە هێسترێك، هەروەها دوو کەڵی بچووك بەرامبەر جوانوویەکی ماین بوون، هەشت جوانووی ماینیش ژنێکیان دەکرد[٦٣]، شتێکی ئەوتۆ نەبوو خەڵك لێرەو لەوێو لەم سەردەمو ئەو سەردەمدا وەك بەکارهێنانی پارە بەکاریان نەهێنابێت: پاقلەو رۆنی ماسیو گوێچکە ماسیو بەردی شووشەییو مووروو و گوێزی هیندیو دانەوێڵەو چاو بیبەرو دواجاریش مەڕوماڵاتو بەرازو وڵاخو کۆیلەکانیش، خۆ مەڕوماڵات پێوەرێکی لەباریش بوو بۆ پێوانەکردنی بەهای شتەکانو وەك ئامرازێکی ئاڵوگۆڕ لەنێوان راوچییەکانو شوانکارەکاندا، چونکە ئەو مەڕوماڵاتە بۆ بەخێوکردن قازانجی دەکردو گواستنەوەشی ئاسان بوو بەو پێیەی

خۆی خۆی دەگواستەوە، بۆیە دەبینیت خەڵك و شتەکان هەتا سەردەمی هۆمەریش هەر بەمەڕوماڵات دەنرخێندران، قەڵغانی (دیۆمدیز) بایی هەشت سەر ئاژەڵ بوو، کۆیلەیەکی کارامەش بەرامبەر چوار سەر بوو، ئەو دوو دەستەواژەیەش کەڕۆمانەکان بۆ مەڕوماڵات و بۆ دراو بەکاریان دەهێنان زۆر لەیەك دەچن، بۆ یەکەمیان دەستەواژەی Pecusو بۆ دووهەمیان دەستەواژەی Pecunia یان بەکاردەهێنا. هەروەها وێنەی گایان لەسەر دراوی کۆن دەنەخشاند، بەڵکو ئەو وشەیەی لەزمانی ئینگلیزیدا بۆ سەرمایە بەکاردەهێندرێ کەبریتییە لە Capital سەرچاوە مێژووییەکەی لە رێی زمانی فەرەنسییەوە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی Capitaleی لاتینی کە بەمانای موڵك دێ، ئەو وشەیەش لای خۆیەوە لە Caputەوە وەرگیراوە کەبەمانای سەر دێت و مەبەست لێی سەرێکی ئاژەڵە. ئەو کاتەی کانزاکان لەزەوی دەرهێنران ئیدی وردە وردە جێگەی شتەکانی تریان گرتەوە لەبەکارهێناندا وەك پێوەرێکی نرخ، نموونەی ئەو کانزایانەش مس و برۆنز و ئاسن و دواجاریش زێڕ و زیو، چونکە ئەم دوانەی دوایی بەهایەکی زۆر و قەبارەیەکی کەمیان هەبوو، بۆیە بوونە ئامرازی ئاڵوگۆڕی هەموو مرۆڤەکان، ئەم گواستنەوەیەش لەکاڵا پێوەرییەکان بۆ دراوی کانزایی بەلای زۆرەوە داهێنانی خەڵکانی سەرەتایی نەبووە، بەڵکو هەنگاوێکە خەڵك لەسەردەمی مێژووی نوسراوەدا ناویانە، ئە و خەڵکە دراویان داهێناوە و ئایینیان هێناوەتە ئاراوە، بەو شێوەیەش لەڕێی ئاسانکردنی ئاڵوگۆڕی شتە زیادەکانەوە بەسامانەکانی مرۆڤ و هەروەها خۆشگوزەرانی مرۆڤەکانیان بردەپێشەوە[٣٤] .

## بابەتی سێهەم

## ڕێکخستنی ئابووری

### کۆمۆنەی سەرەتایی – هۆکارەکانی ئەمالی – بنەماکانی موڵکداریتی تایبەتی – کۆیلایەتی – سەرهەڵدانی چینەکان

بازرگانیکردن مەزنترین شتی سەرسامکەر بوو بۆ جیهانی سەرەتایی، چونکە ئەو دەمانە هیچ موڵکێك بوونی نەبوو، بەو پێیەش هیچ سیستمێکی دەسەلآت نەبوو مەگەر زۆر بەکەمی، ئەمە بەر لەوەی موڵکایەتی بێتە ناو ژیانی خەڵکەوەو کلکی خۆی بەدوای خۆیدا بەکێش بکات کەبریتییە لەپارەوپوول‌و قازانج. لەیەکەمین قۆناغەکانی گەشەی ئابووریدا موڵکایەتی –لەزۆرترینی حاڵەتەکاندا- تەنها لەسنووری ئەو شتانەدا گیری خواردبوو کەموڵکدارەکە بۆ خۆی بەکاری دەهێنان، مانای ئەو موڵکدارییەش ئەو سەردەمە هێندە بەهێز بوو بەڕادەیەك موڵکەکان لەخاوەنەکەیان نەدەبوونەوەو زۆرترینی کات لەگەڵیشیدا –پاش مردنی- دەخرانە گۆڕەکەیەوە (ئەمە تەنانەت خودی ژنەکەیشی دەگرتەوە). هەرچی ئەو شتانەی پەیوەندییان بەکەسی خاوەن موڵکەوە نەبوو ئەوە موڵکداریی لەبارەیانەوە بەو جۆرە بەهێزە ڕۆشن نەبوو، بۆیە ئەوەندە بەس نییە بڵێیت بیرۆکەی موڵکداری لەمرۆڤدا بیرۆکەیەکی ڕەسەن‌و ڕیشەیی نییە، بەڵکو دەبێت ئەوەش بڵێیت کە سەبارەت بەو شتانەی لەکەسێتیی موڵکدارەکەوە دوور بوون بیرۆکەکە لەمێشکی خەڵکدا بەڕادەیەك لاواز بوو پێویستی بەتۆکمەکردن‌و گوتنەوەی بەردەوام هەبوو.

ئەوەتا دەبینیت زەوی هەتا ڕادەیەکی زۆر لای هەموو گەلە سەرەتاییەکان موڵکی هەموو کۆمەڵگا بووە، هیندییەکانی ئەمریکای باکوورو خەڵکی پیرۆو

هیندییەکانی سەر گردی چیتاگۆنگو خەڵکی بۆرنیۆو دانیشتوانی دورگەکانی دەریای باشوور، خەڵکی لەو چەشنانە –بەلای زۆردا- زەوی موڵکی هەموویان بووەو بەکۆمەڵ کێڵاویانەو دواتریش بەکۆمەڵ بەرهەمەکەیان بەشکردووە. لەوبارەیەوە هیندییەکانی ئۆماها قسەیەکیان هەیە دەڵێت "زەوی وەك ئاوو هەوایە، ناکرێت بفرۆشرێت". بەهەمان شێوە فرۆشتنی زەوی لای خەڵکی ساموا بەر لەهاتنی مرۆڤی سپی پێست بۆ ئەوێ نەبوبوو بەدابو کەس نەیبیستبوو. پرۆفیسۆر (ریفەرز) پێی وایە کۆمۆنەی زەوی لەمالینیزیاو پۆلینیزیا هێشتا ماوەتەوە، هەروەك دەتوانیت سەرنجی ئەوە بدەیت کەلەناو لایبیریادا هەر بوونی هەیە[٣٥].

بەڵام کۆمۆنە لەخۆراکدا ئەوە بەشێوەیەکی کەمتر باو بووە، چونکە ئەوەی لەبارەی هەمەجەکانەوە دەزانرێت ئەوەیە هەر کەسێك خواردنێکی هەبووایە لەگەڵ ئەوەدا بەشی دەکرد کەهیچی نەبوو، هەروەك ئەو خووەشیان هەبووە ئەگەر گەشتیارەکانیان پێویستیان بەخۆراك بووایە خۆیان دەکرد بەهەر ماڵێکی سەر رێگاکەیان کە ئارەزوویان بکردایە، بەڵکو نەریتێکی تریش هەبووە بریتی بووە لەوەی ئەو کۆمەڵانەی بێبڕشتی تەنگی پێ هەڵچنینایە هانایان دەبردە بەر دراوسێکانیان[٣٦]. ئەگەر مرۆڤێکیش لەناو دارستانێکدا دابنیشتایە بۆ خواردنی ژەمە خۆراکەکەی، ئەوە خەڵك چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرد بەر لەوەی دەست بەخواردن بکات بانگ لەوانە بکات کەدەمیانەوێ لەگەڵی بخۆن[٣٧]، ئەگەرنا ئەوە وەها دادەنرا کەکارێکی چەوتی ئەنجامداوە. ئەوەتا ئەو کاتەی تێرنەر چیرۆکی هەژارێکی خەڵکی لەندەن بۆ پیاوێکی خەڵکی ساموا دەگێڕێتەوە، هەمەجییەکە بەسەرسامییەوە لێی دەپرسێت: "ئەوە چۆن دەبێت؟ لەوێ خواردن نییە؟ ئەو پیاوە هەژارە هاوڕێی نییە؟ ئەو جێگایە شوێنی نیشتەجێبوونی لێ نییە؟ ئەی کەوابێت ئەو هەژارە لەکوێ گەورە بووە؟ هاوڕێکانی ماڵیان نییە؟"[٣٨].. برسییەکانی هیندییەکانیش هیچیان لەسەر نییە ئەوە نەبێ داوا بکەنو دەستبەجێ بەبەخشندەییەوە داواکانیان وەڵام دەدرێتەوە، چونکە چەندە سەرچاوەی خۆراك

لای کەسی نانیدە کەم بێت، دەبێت شتێکی لێ بدات بەو داواکارە مادام پێویستی پێیەتی، "لەبەرئەوەی هەر ئەوەندەی لەجێگەیەکی شارەکەدا دانەوێڵە هەبێت مەحاڵە کەسێکی برسیت تووش ببێت "[٣١]. نەریتی خەڵکی (هۆتنتۆت) وەها بوو ئەگەر کەسێك لەوانی تر زیاتری هەبێت لەگەڵیان بەش بکات تائەوەی هەموویان وەك یەکیان لێ دێت.. گەڕیدە سپی پێستەکان لەکاتی گەشتەکانیاندا بۆ ئەفەریقا سەرنجی ئەوەیان دەدا –بەر لەوەی ژیار بپەڕێتەوە بۆ ئەو کیشوەرە- ئەگەر دیارییەك بدرێ بەپیاوێکی رەشپێست، جا ئەو دیارییە خواردن بووایە یان هەر شتێکی تری بەنرخ، دەستبەجێ لەگەڵ کەسوکارەکەیدا بەشی دەکرد، ئەگەر گەشتیارەکە دەستێك جلی پێشکەش بەیەکێك لەو رەشپێستانە بکردایە، هەر بەپەلە دەیبینی ئەو رەشپێستەی دیارییەکەی وەردەگرت خۆی بەشێکی ئەو دەستە جلەی دەپۆشی، دواتر دەیبینی هاوڕێیەکی دەهاتو پانتۆڵەکەی لەبەر دەکردو یەکێکی تر دەهات چاکەتەکەی لەبەر دەکرد. ئەسکیمۆکانیش بەهەمان شێوە هیچ مافێکی تایبەتییان نەدەدایە راوچی لەو نێچیرەی خۆی راوی دەکرد، بەڵکو دەبوو نێچیرەکەی بەسەر هەموو خەڵکی ئاواییەکەدا دابەش بکات، هەموو ئامرازو خۆراکە عەمبار کراوەکانیش موڵکێکی کۆمۆنەیی هەموان بوون. کاپتن کارڤەر کاتێك وەسفی هیندییەکانی ئەمریکای باکوور دەکات دەڵێت "ئەوان تەنها لەکەرەستەکانی ناو ماڵدا موڵکیان جیایە، بەرامبەر بەیەکتریش تادوارادە بەخشندەن، ئەگەر یەکێکیان شتێکی لێ زیاد بێتو هاوڕێکەی لەو شتەدا کەموکورتی هەبێت پێویستە ئەوەی یەکەمیان کەموکورتی هاوڕێکەی پڕبکاتەوە". بەهەمان شێوە مژدەبەخشێکی مەسیحی دەنووسێتو دەڵێت "ئەوەی زۆر بەقووڵی پیاو سەرسام دەکات ئەوەیە ئەو خەڵکە دەبینیت هێندە بەناسکیو بەگفتی شیرین مامەڵەی یەکتری دەکەن زۆر بەدەگمەن وێنەی ئەو مامەڵەیەت لەناو شارستێنترین نەتەوەکانیشدا بەرچاو دەکەوێت، ئەوەش بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو دەستەواژەی (موڵکەکەی من)و (موڵکەکەی تۆ) کەکریستۆستەمی پیرۆز

لەبارەیانەوە دەڵێت هەرچی مەشخەڵی چاکەیە لەناخماندا دەیکوژێننەوەو لەبری ئەو مەشخەڵە ئاگری چاوبرسێتیەك دادەگیرسێنن کەئەو هەمەجانە هێشتا پێی ئاشنا نەبوون". کەسێکی تر گەواهی دەداتو دەڵێت "بەچاوی خۆم ئەوەم لێ بینین کەنێچیرەکەیان ئەگەر بەکەڵکی بەشکردن بهاتایە بەشیان دەکرد، بەڵام یەك نموونەم بەرچاو نەکەوت وەك دەمەقاڵەو ناکۆکی یان ڕەخنەگرتنێك لەشێوازی بەشکردنەکە، بۆ نموونە یەکێك بڵێ دادپەروەرانە نەبوو یان هەر ڕەخنەیەکی تری لەو بابەتە، هەر کەسێکیان بگریت ئەوەی پێ خۆشترە بەسکی بەتاڵ بخەوێت نەك بەوە تاوانبار بکرێت کە دەستی یارمەتی بۆ نەدارێك درێژ نەکردووە، هەموویان خۆیان بەئەندامی یەك خێزانی گەورە دەزانن"[٤٠].

بۆچی ئەو کاتەی مرۆڤ گەیشتە ئەو دۆخەی وا ئەمڕۆ بەکەمێك لایەنگیرییەوە ناومان ناوە ژیار، ئیدی کۆمۆنەی سەرەتایی نەما؟ (سمنەر) پێی وایە لەبەرئەوەی ئەو کۆمۆنەیە بوونێکی بایۆلۆژی نییە، چونکە کۆسپ بووە لەبەردەم ململانێ لەپێناوی مانەوەدا، هەروەها بەپێی پێویست پاڵی بەخەڵکەوە نەناوەو هانی نەداون بەرەو داهێنانو چالاکیو ئابووری، هەروەك پاداشت نەکردنی کەسی لێهاتوو و سزانەدانی کەسانی لەو بێتواناتر (مەگەر تەنها لەناو ئەوانەدا کەئاستیان لەیەکەوە نزیك بووە)، ئەوە دژی گەشەکردن بووەو دژی کێبەرکێی سەرکەوتوو بووە لەگەڵ گروپەکانی تردا[٤١]. لۆکسێل لەبارەی هەندێك هۆزی هیندی لەباکووری ڕۆژهەڵاتدا دەنووسێتو دەڵێت "هێندە تەمبەڵن خۆیان هیچ شتێك ناچێنن، بەڵکو تەواو پاڵیان داوەتەوەو پشتیان بەوە بەستووە کە دەزانن کەسانی تر هەرچییان بەرهەم هێنا لەگەڵیان بەش دەکەن، لەبەرئەوەش کە کەسی چوستو چالاك لەبەرووبوومی زەوی تەنها هێندەی کەسێکی تەمبەڵی بەردەکەوت، بۆیە ساڵ لەدوای ساڵ بەرهەمیان ڕووی لەکزی دەکرد"[٤٢]. بەبۆچوونی داروین-یش یەکسانیی تەواوی نێوان فویجییەکان هەموو هیوایەکی ئەو خەڵکە بەگەیشتنە ژیار لەناو دەبات[٤٣]، یان ڕەنگە فویجییەکان بڵێن ئەگەر ژیار بگاتە لایان ئەوە ئەو یەکسانییە لەناو دەبات

کەلەناویاندا هەیە.. بەڵێ.. کۆمۆنە کەسانێکی خاترجەم کردووەو ژیانیانی لەکارەساتەکانی هەژاریو نەزانیو دەرهاویشتەکانیان ڕزگارکردووە، دەرهاویشتەکانیان بەهەموو ئەو نەخۆشییانەوە کە لەکۆمەڵگە سەرمتاییەکاندا بەربلاوە، بەلام بەتەواوی لەو هەژارییە دەری نەهێناون، هەرچی تاکگەراییە ئەوە دەوڵەمەندیی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، بەلام لەگەڵ خۆیدا دڵەڕاوکێو کۆیلایەتیشی هێناوە. بەڵێ، تاکگەرایی هەموو هێزو توانا شاردراوەکانی لەپیاوانی بەتوانادا جووڵاندوە، بەلام لەهەمان کاتدا فووی بەئاگری ململانێدا کردووەو هەڵی گیرساندوە، وەهای لەخەڵك کردووە هەستێکی زۆر تاڵ بەهەژاری بکەن، ئەو هەژارییەی کاتێك هەمووان وەك یەك بوون ئازاری هێندە نەبوو.

کۆمۆنە دەتوانێت لەو کۆمەڵگە کۆچەرییانەدا کە هەمیشە مەترسیو نەداری یەخەی گرتوون زۆر ئاسانتر بژیو درێژە بکێشێت، چونکە لەوێ ڕاوچیو شوانکارەکان هیچ پێویستیان بەموڵکێکی تایبەت نییە لای خۆیان بیهێڵنەوە، بەلام کاتێك کشتوکاڵ دەبێتە ڕواڵەتی ژیانێکی سەقامگیر، ئەو کاتە هێندە نابات خەڵکەکە تێدەگەن لەوەی هەر کاتێك پاداشتی خزمەتکردنی زەوی بۆ ئەو خێزانە گەڕایەوە کە خزمەتەکەی کردووە، ئەوە بەروبوومی ئەو زەوییە دەگاتە ئەوپەڕیو خزمەتکردنەکەشی گەشەی زیاتر دەکات، سەرەنجامو بەگوێرەی هەڵبژاردنی سروشتی (الانتخاب الطبيعي) نێوان سیستمی کۆمەڵایەتیو بیروڕاکان، کە وەك هەڵبژاردنی سروشتی نێوان کەسەکانو گروپەکانە، گواستنەوە لەقۆناغی ڕاوەوە بۆ قۆناغی کشتوکاڵ موڵکایەتی هۆزی لەگەڵ خۆیدا گۆڕی بۆ موڵکایەتی خێزان، بەوەش ئابووریدارترین یەکەی کۆمەڵایەتی لەتێچوونی کردەی بەرهەمهێناندا هەر خۆی بووە یەکەی موڵکداری. هەر ئەوەندەش خێزان وردە وردە ڕوخسارێکی باوکسالارانەی وەهای بەسەردا دابڕا کە هەموو دەسەڵاتەکان لەدەستی بەتەمەنترین نێرینەی خێزاندا چڕبکاتەوە، ئیدی موڵکیش پەیتا پەیتا زیاتر لەدەستی تاکەکاندا چڕ بووەوە، دواتر میراتگری بۆ کەسێکی دیاریکراوو بێ میراتکردنی کەسێکی تر

هاتە ئاراوە. ئەگەر ئەوەش بزانین کە زۆر جار کەسێکی سەرکێش بەندەری ئاسایی خێزانی بەجێ دەهێشت بۆ ئەوەی سەرکێشییەکانی خۆی بگەیەنێتە ئەوەی ئەو سنوورەی کەسوکارەکەی بڕیویانە، ئینجا کارە سەختو دژوارەکەشی دەیگەیاندە ئەوەی پارچە زەوییەك لەدارستانێکدا یان شیوەلانێکدا یان زۆنگێکدا بۆ خۆی بپچڕێت، ئەوە دیارە ئەو کەسە ئیدی زۆر بەپەرۆشەوە ئێشکی بەدیار ئەو مولکەیەوە دەکێشاو نەیدەهێشت کەسێکی تر لێی زەوت بکات، بەو پێیەی ئیدی ئەوە مولکی تایبەتی خۆیەتی، هەتا دەگەیشتە ئەوەی کۆمەڵەکە دواجار دان بەمافە تایبەتییەکەیدا بنێن لەو زەوییەدا. بەمەش جۆرێکی تری مولکی تایبەتی هاتە ئاراوە[143]، ئەم جۆرە داگیرکردنەی زەوی‌و زاریش لەگەڵ زۆرتر بوونی ژمارەی دانیشتواندا وردە وردە پەرەی سەندو گەیشتە ئەو ڕادەیەی لەسەر خاکی کۆن جێگەیەك نەمێنێتەوە، هەتا کار لای ئەو کۆمەلگانەی لەوانی تر ئالۆزتر بوون لەپەیوەندییەکانیاندا گەیشتە ئەوەی مولکداریی تایبەتی ببێتە سیستمی زاڵ. پارە داهات‌و ئەم فاکتەرانە لەوەدا یارمەتیدەر بوون بۆ داهێنانی کە بەئاسانی بتوانێت سامان کەڵەکە بکات‌و بیگوازێتەوەو هەواڵەی جێگەی تری بکات. مافە کۆنەکانی هۆزو داب‌و نەریتەکانیان بەوپەڕی ماناوە ڕواڵەتی مولکدارییان بەخۆوە گرت. کەسی مولکدار ئەو کاتە بریتی بوو لەخەڵکی گوند بەکۆمەڵ، یان شاکەیان، ئینجا ئەو مولکدارییە ناوە ناوە سەرلەنوێ کەلاڵەو دابەش دەکرایەوە، لەنێوانی سیستمی کۆن‌و سیستمی نوێشدا ئەو سەردەمە بەسەرچوو کەمولکداری دەستاودەست بکات‌و بەناجێگیری بمێنێتەوە، ئیدی بەدوای ئەوە مولکداریی تاکەکەسیی تایبەت بەشێوەیەکی گومان هەڵنەگر سەقامگیر بوو، بوو بەسیستمی ئابووریی بنەڕەتی لەکۆمەلگاکانی ئەو سەردەمانەدا کەمێژوویان نوسراوەتەوە.

بەڵام ئەو کاتەی کشتوکاڵ ژیاری بەبنیاتنان بنیات دەنا، ئەو کشتوکاڵە چۆن گەیشتە سیستمی مولکداریی، هەر بەهەمان شێوە گەیشتە سیستمی کۆیلایەتی، ئەو سیستمەی گروپە ڕاوچییەکان پێی ئاشنا نەبوون، چونکە لەو گروپانەدا

کەژیانیان تەنها لەسەر ڕاوکردن بەند بوو ژنی ڕاوچییەکەو منداڵەکانی کارە سادەکانیان ئەنجام دەدا، هەر ئەوانیش بۆ ئەو کارانە بەس بوون، پیاوەکانیش ژیانیان بەم جۆرە بوو: قۆناغێکی پشێو کەبریتی بوو لەچالاکی راووشکار یان شەڕو کوشتارو بەدوایدا قۆناغێکی پشوو و قاچ درێژکردنی دوای ماندوویی‌و شەکەتی، ڕەنگیشە ئەو تەمبەڵییەی وەك مۆرکێکی هۆزە سەرەتاییەکانی لێهاتووە، بەمەزەندەی ئێمە، لەم خووەوە هاتبێت، خووی پشوودانی خاووخلیچکانەی پاش ماندووبوونی شەڕو کوشتارو ڕاوکردن، ئەگەرچی ئەم خووە لەو سەردەمانەیدا تەمبەڵی نەبوو هێندەی پشوودان‌و کات گوزەراندن بوو. لەپێناوی ئەوەدا کە ئەو چالاکییە بچڕبچڕە ببێتە کارێکی نەپساوەی بەردەوام، دەبوو دووشت ئەنجام بدرێت: بایەخدانی ڕۆژانە بەمزەوی‌و، هەروەها دابەشکردنی کار.

ڕێکخستنی کار بەهۆی نزمی ئاستی چالاکییەوە هێندە توندوتۆڵ نابێت، چونکە خەڵك تەنها بۆ خۆیان کار دەکەن، بەڵام ئەگەر وای لێهات کار بۆ کەسانی تر بکەن، ئەوە بێگومان دەبێت لەدواجاردا ڕێکخستنی کار پشت بەهێزو بەناچارکردن ببەستێت، ئەوەش لەبەرئەوەی سەرهەڵدانی کشتوکاڵ‌و هاتنەکایەی جیاوازی لەئاستی خەڵکەکاندا لەئاکامدا گەیشتە بەکارهێنانی ئەو کەسانەی لەرووی کۆمەڵایەتییەوە لاوازن لەلایەن ئەو کەسانەوە کەلەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بەهێزن. ئەو کەسەی پێشتر لەجەنگدا سەردەکەوت پەی بەو ڕاستییە نەدەبرد کەدیلی جەنگ بەزیندوویی کەڵکی زیاتری هەیە، هەر لەو ڕێیەشەوە تا سیستمی کۆیلایەتی بەرفراوانتر بوایەو تەشەنەی بکردایە کوشتوبڕو خواردنی گۆشتی خەڵك لەلایەن یەکترییەوە ڕووی لەکەمی دەکرد[٤]، کەواتە مرۆڤ لەڕووی ئیتیکیشەوە هەنگاوێکی مەزنی بەرەو پێشەوە نا، وازی لەکوشتنی هاوڕەگەزەکەی‌و خواردنی گۆشتەکەی هێنا، بەوەندە وازی لەدوژمنەکانی هێنا کە دەیکردنە کۆیلەی خۆی. ئەمرۆش تەشەنەسەندنێکی لەو بابەتە لەسەر ئاستێکی فراوان لەبەرچاودایە، ئەوەتا نەتەوە سەرکەوتووەکان وازیان لە کوشتوبڕی دوژمنە

شکست خواردووەکان هێناووەو تەنها بەکۆیلەکردنیان لێیان دەگەڕێن، کۆیلەکردنەکەش لەڕێی ئەو قەرمبووەیە کە دەیسەپێنن بەسەریاندا. کاتێکیش سیستمی کۆیلایەتی سەقامگیر بوو و کەڵك‌و قازانجی خۆی سەلماند، چوارچێوەکەی فراوانتر کراو وەهای لێکرا چەندین گروپی تر بێجگە لەدیلەکانی جەنگ بگرێتەوە، ئەوەبوو خەڵکانی مەدەنیش لەوانەی قەرزدار بوون‌و قەرزەکانیان پێ نەدەدرایەوە یان ئەو تاوانکارانەی کردەی تاوانیان چەندبارە دەکردەوە، ئەوانیش خرانە لیستی کۆیلەوە، ئەمە بێ لەو پەلامارانەی کە بەدەستی ئەنقەست بۆ هێنانی کۆیلە بەڕێوەدەچوون، بەمشێوەیە جەنگ لەسەرەتادا فاکتەرێك بوو بۆ سەرهەڵدانی کۆیلایەتی، پاشتر کۆیلایەتی بوو بەفاکتەرێك بۆ هەڵایسانی جەنگ.

ڕەنگە سیستمی کۆیلایەتی لەگەڵ درێژەکێشانیدا بۆ چەند سەدەیەك مرۆڤ لەڕووی کارکردنەوە داب‌ونەریتەکانی خۆی لێ وەرگرتبێت، ئەوەتا هەر کەسێك لەئێمە هەتا توانای خۆ بواردنی هەبێت‌و بزانێت لەهەموو ئاکامە جەستەیی‌و ئابوورییەکان بێوەی دەبێت خۆی لەکارە سەخت‌و دژوارەکان دەدزێتەوە. کەواتە کۆیلایەتی بوو بەبەشێك لەو سیستمەی مرۆڤ بەهۆیەوە خۆی بۆ قۆناغی پیشەسازی ئامادەکرد، بێجگە لەوەی ڕۆڵی ناڕاستەوخۆی خۆی لەپێشخستنی ژیاردا گێڕا، بەوەی سامانی زیاکردو لەو ڕێگەیەشەوە کاتی دەستبەتاڵی بۆ توێژێکی کەمی خەڵك دروستکرد، هەر ئەوەندەی چەند سەدەیەکیش بەسەر ئەم سیستمەدا تێپەڕی، ئیدی خەڵك وایان لێهات وەك سیستمێکی خۆڕسك لێی بڕوانن کە نەتوانرێ دەستی لێ بەربدرێ، ئەمە بۆچوونی ئەریستۆیەو هەروەها پۆڵس‌ی پیرۆزیش ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییەی پەسەندکردووە کە بەگوتەی ئەو دەبێت بۆ ئەو چاخەی تیایدا سەری هەڵداوە زۆر پێویست بووبێت‌و فەرمانی خودای لەسەر بووبێت.

بەم جۆرە کشتوکاڵ‌و سیستمی کۆیلایەتی، بەهەمان شێوەی دابەشکردنی کارو ئەو جیاوازییانەی دابەشکردنی کار دەیخاتە نێوان خەڵکەوە، هەموو ئەوانە پەیتا

پەیتا ئەو یەکسانییەی لەناو گروپە خۆڕسکەکاندا هەبوو دەیانگۆڕی بەجیاوازی لەئاستداو جیاوازیی لەئینتیمای چینایەتیدا، چونکە لەکۆمەڵگەی سەرەتاییدا – بەگشتی- جیاوازییەك نییە لەنێوان کەسێکی سەربەستو کەسێکی کۆیلەدا[45]، بەڵکو کۆیلەکردنو چینی کۆمەڵایەتیی جیاواز لەو کۆمەڵگەیەدا بەدی ناکەیت، جیاوازی نێوان سەرۆكو رەعیەتەکانیشی تەنها جیاوازییەکی زۆر بچووکە. پەیتا پەیتا کەرەستەو پیشەسازییەکان ئاڵۆزتر بوون، ئەوەش وایکرد کەسی لاوازو بێتوانا ملکەچی ویستی بەهێزو لێهاتووەکان بێت، هەرچەند داهێنانێکی نوێش دەرکەوتایە دەبووە چەکێکی نوێ بەدەست بەهێزەکانەوە، ئەوەش دەسەڵاتیانی بەسەر لاوازەکانەوە زیاتر دەکردو دەبووە هۆی زیاتر چەوساندنەوەیان. دوای ئەوە سیستمی میراتگری جیاوازییەکانی لەئاستی گوزەراندا قووڵتر کردەوە، بەوەی بێجگە لەو ئیمتیازەی بەهێزەکان کە بریتی بوو لەهەبوونی دەرفەت لەبەردەمیاندا، ئیمتیازێکی تریشی پێ بەخشین کەبریتی بوو لەموڵکی بۆماوە، ئیدی ئەو کۆمەڵگانەی ڕۆژێك لەڕۆژان چونیەكو پێکەوە گونجاو بوون کردنی بەژمارەیەکی لەبن نەهاتووی چینو توێژو ناوەندی جیاجیا، هەستی دەوڵەمەندەکان بەدەوڵەمەندیی خۆیانو هەژارەکان بەهەژاریی خۆیان بووە هەستێك کە بەهۆیەوە بەگژ یەکتریدا دەچوونەوە. بەم شێوەیە ململانێی چینەکان بەدرێژایی هەموو چاخەکانی مێژوو وەك هێڵێکی سوور ڕێچکەی خۆی گرت، ئەم شەڕەی نێوان چینەکانیش ئەو دەوڵەتەی دامەزراند کە ئیدی بوارێك نەمایەوە بۆ خۆلادان لەدامەزراندنی لەپێناوی ڕێکخستنی ئەو چینانەداو پاراستنی موڵكوماڵو جەنگ بەرپاکردنو سازدانی ئاشتی.

# باسی سێهەم
# توخمە سیاسییەکانی ژیار

## بابەتی یەکەم
## بنەچەکانی حکومەت
### غەریزەی کۆمەڵایەتی – پشێوێی سەرەتایی– هۆز–خێڵ – شا– جەنگ

مرۆڤ بەخواستو ئارەزووی خۆی ئاژەڵێکی سیاسی نییە، هەر کەسێك لەگەڵ هاوەڵەکانیدا یەکانگیر دەبێت ئارەزوو و خولیای خۆی پاڵنەری نین بۆ ئەو یەکانگیربوونە هێندەی ئەوەی دابو نەریتو بارودۆخی ناهەموار پاڵی پێوەدەنێن، تاك ئەوەندەی لەتەنهایی دەترسێت ئەوەندە کۆمەڵگەی خۆش ناوێت، بۆیە لەگەڵ خەڵکانی تردا یەك دەگرێت چونکە گۆشەگیریی دووچاری مەترسیی دەکات، بێجگە لەوەی شتێکی زۆر هەن دەشێت بەهاوکاری کەڵکی زیاتر بگەیەنن تا بەدەست بۆ بردنی تاکەکەسییانە. لێرەوە هەر مرۆڤێك لەناخی خۆیدا بوونەوەرێکی کێوییەو چۆن دوژمن بەرەوڕووی دوژمنەکەی دەبێتەوە ئەمیش بەهەمان شێوە بەوپەڕی قارەمانێتییەوە بەرەوڕووی دنیا دەبێتەوە، جا ئەگەر هەموو شتێك بەخواستی مرۆڤ بەڕێوە بچوایە ئەگەری زۆر هەبوو دەوڵەت هەر بوونی نەبووایە، بگرە هەتا لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا دەبینی مرۆڤ ڕقێکی زۆری لەدەوڵەتە، مردنو باج وەرگرتنی لەلا وەك یەکە، تاسووقی حکومەتێکە لەکەمترین بواردا دەسەڵاتی بەسەریدا هەبێت، ئەو کاتەی دەبینێت داوای یاساو ڕێسای زیاتر دەکات ئەوە تەنها لەو ڕوانگەیەوە داوایان دەکات کە دەبێت دراوسێکەی ئەو یاسایە پەیڕەو بکات، بەڵام خۆی، ئەوە ئەگەر لێی گەڕێن یەکسەر بەلای بێ سەرەوبەرەییەکدا

یادەداتەوە هیچ بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی بۆی جلەوگیر نەکریٚ، پیٚشی وایە یاسا — بۆ ئەو- هیچ پیٚویست ناکاتو شتیٚکی زیادەیە.

ئەگەر بڕوانیتە سادەترین کۆمەڵگەکان لەڕووی پیٚکهاتەوە، ئەوە هیٚندەی نامیٚنیٚ بلیٚیت هیچ ڕواڵەتیٚکی حکومەتیان تیادا بەدی ناکەیت، ڕاوچییە سەرەتاییەکان ئارەزووی پەسەندکردنی هیچ بە یاساییکردنیٚکی هەڵسوکەوتیان ناکەن، تەنها ئەو کاتە نەبیٚت کە پیٚکڕا دەچنە گروپیٚکەوەو خۆیان بۆ دابەشکردنی ڕۆڵ ئامادەدەکەن، لەغەیری ئەو حاڵەتەدا، ئەوە سەیری هۆزی بوشمەن بکە، دەبینیت وەك ئاسایی لەچەند خیٚزانیٚکی پەرتەوازەدا ژیانیان دەگوزەریٚنن، بەهەمان شیٚوەش کورتەباڵاکانی ئەفەریقاو خەڵکە خۆڕسکەکەی ئوستراليا بەشیٚوەیەکی کاتیو بۆ ئەرکیٚکی کاتی نەبیٚت ڕیٚکخستنی سیاسییانە پەسەند ناکەن، هەرئەوەندەش ئەو ڕیٚکخستنە ئەرکە کاتییەکەی خۆی بەجیٚگەیاند خیٚرا بلاوەی لیٚدەکەنەوەو هەر خیٚزانیٚکیان دەبیٚتەوە بە خیٚزانیٚکی سەربەخۆ. خەڵکی تسمانیا نە سەرۆکیان هەیەو نەیاساو نەحکومەت، فیدییەکانی دانیشتووی سیلان بەپیٚی پەیوەندییە خیٚزانییەکان بەسەر چەند گروپیٚکدا دابەش بوون، هیچ حکومەتیٚکیان بەسەرەوە نییە، کوبییەکانی سۆمەترا بەبیٚ ئەوەی کەس دەسەلاتی بەسەریاندا هەبیٚت ژیان دەگوزەریٚنن، هەر خیٚزانیٚك خۆی حوکمی خۆی دەکات، لەناو خەڵکی فیجی زۆر بەکەمی گروپیٚك دەبینیت ژمارەیان لە دوانزە کەس زیاتر بیٚت، بەهەمان شیٚوە تانجییەکان لەچەند گروپیٚکی پەرتەوازەدا دەژین کەهەر گروپیٚکیان ١٠ خیٚوەت دەبیٚتو نابیٚت، کۆمەڵی ئوسترالییەکانیش زۆر بەدەگمەن لەشەست کەس تیٚپەڕ دەکات[1]، ئەو کۆمەڵەش بەمەبەستی زۆر تایبەتی وەك ڕاوکردن نەبیٚت گردنابنەوە، بەبیٚ ئەوەی هیچ سیستمیٚکی سیاسیی هەمیشەیی یەکی خستبن.

هۆز یەکەم شکڵی سیستمی کۆمەلایەتیی هەمیشەیی بووە، مەبەستیشمان لەهۆز کۆمەڵیٚك خیٚزانە کە پەیوەندیی خزمایەتی پیٚکەوەیان دەبەستیٚتەوەو

لەپارچە خاکێکدا (لەزۆرترینی حاڵەتەکاندا) دەژین و یەك پەرستراوی هاوبەشیان هەیەو یەك حکومەت بەپێی یاساگەلێکی دیاریکراو بەڕێوەیان دەبات، جا ئەگەر کۆمەڵێك هۆز لەژێر چەتری سەرۆکێکدا خڕبوونەوە ئەوە تیرە پێکدێ، تیرە دووهەمین هەنگاوە بەرەو پێکهاتنی دەوڵەت، بەڵام گەشەکردن لەسەر ئەم ڕێگایە زۆر بەخاوی بەڕێوە چووە، چونکە زۆر گروپ بێ سەرۆك بوون[٢]، گروپی تریش هەبوون —بەبڕوای ئێمە- سیستمی سەرۆکایەتییان قبووڵ نەکردووە لەحاڵەتی جەنگدا نەبێت[٣]، بۆیە دیموکراسی مۆرکێکی ئەم چاخەی ئێمە نییە کە بۆمان هەبێت خۆمانی پێوە بابدەین لەبەردەم چاخەکانی تردا، لەبەرئەوەی ئەو دیموکراسییە لەگروپە سەرەتاییەکاندا بەجوانترین شێوە بەرجەستەبووە. ئەوەتا حکومەتەکانی ئەو گروپانە هیچ نین ئەوە نەبێت کە سەرۆك خێزانەکانی تیرەکە پێکەوە لەسەری ڕێدەکەوتن، هەرگیزیش ڕێگەیان نەداوە دەسەڵاتێك لەخۆڕا سەرهەڵدات[٤]. هیندییەکانی هۆزی ئیراکۆو دلاوێر دانیان بەهیچ یاساو دیسپلینێکدا نەدەنا بەدەر لەو چوارچێوە سروشتییەی بەکەڵکی خێزان یان تیرە دەهات، سەرۆکەکانیشیان تەنها دەسەڵاتێکی بچووکیان هەبوو کە پیرانی تیرەکە هەرکات بیانویستایە دەیانتوانی ئەو دەسەڵاتەشیان لێ بسێننەوە. هیندییەکانی ئۆماها-ش ئەنجومەنی (حەوت کەسی)یان هەبوو کە ئەندامەکانی ئەو ئەنجومەنە تادەگەیشتنە کۆدەنگی، بەردەوام تاوتوێی مەسەلەکانیان دەکرد، ئەگەر لەگەڵ ئەمەدا باسی کۆبوونەوە بەناوبانگەکەی ئیراکوا بکەین، کە تیایدا کۆمەڵێك هۆزی زۆر لەسەر پرسگەلێك ڕێکەوتن و هەموویان پێکەوە وابەستەی ڕێکەوتننامەیەکی ئاشتیپارێزی بوون، دەبینیت کەلێنێکی زۆر لەنێوان ئەو هەمەجانەو دەوڵەتانی مۆدێرندا نامێنێت، بەڵێ.. دەوڵەتانی مۆدێرن کە لەکۆمەڵەی نەتەوەکاندا بەڵێنی بڵاوکردنەوەی ئاشتی دەدەن و ڕەنگە دواتر ئەو بەڵێنەی خۆشیان نەبەنەسەر.

بەڵام ئەوە جەنگە سەرۆك و پادشاو دەوڵەت دەخوڵقێنێت، هەروەك ئەوانیش جارێکی تر دێنەوەو جەنگ بەرپا دەکەنەوە. لەساموا سەرۆك تەنها لەحاڵەتی

جەنگدا دەسەڵاتی هەبوو، خۆ ئەگەر شەڕ نەبووایە خەڵکەکە هێندە گوێیان پێ نەدەدا، هۆزی دیاك هیچیان لەبارەی حکومەتەوە نەدەزانی ئەو دەسەڵاتە نەبێت کە سەرۆکی خێزان بەسەر خێزانەکەی خۆیەوە هەیبوو، ئەگەر تووشی شەڕێکیش ببوونانە ئازاترین کەسی خۆیان دەکردە سەرکردەو ئیدی کوێرانە گوێڕایەڵی دەبوون، پاشان هەر کە شەڕەکە تەواو بوایە بەتەواوی مانا لەسەرکردەییان دەخستو دەیانگێڕایەوە سەر کارەکەی پێشتری خۆی°. لەسەردەمی ئاشتیدا زیاترینی دەسەڵات دەچووە دەستی کاهین یان سەرۆکی جادووبازان، ئەو کاتەی سیستمی دەسەڵات گەشەی کردو پادشایی بووە ڕواڵەتی باوی لەناو زۆربەی هۆزەکاندا، شا فەرمانەکانی خۆی لەفەرمانەکانی ئەو جۆرە خەڵکانەوە (کاهین‌و جادووبازان) هەڵ هێنجا، هەموو ئەو فەرمانانەشی خستە ژێر رکێفی خۆی، ئەرکی جەنگاوەرو باوکی بەتەمەن‌و کاهین، بەڕادەیەك دەبینیت دوو هێز حوکمی گروپەکان دەکەن: وشە لەسەردەمی ئاشتیداو شمشێر لەسەردەمی تەنگژەدا. کەواتە هێز تەنها کاتێك بەکاردەهێنرێ کە ڕێنماییکردنی خەڵك بەقسە نوشوستی بهێنێت. بەدرێژایی چاخەکان یاساو بیروباوەڕە ئەفسانەییەکان شانبەشانی یەکتری هەڵیانکردووە، یان هاوکاریی یەکتریان کردووە لەحوکمکردنی مرۆڤەکاندا یان هەر یەکەیان ماوەیەك ئەو کارەی ئەنجامداوە، هیچ دەوڵەتێك هەتا دەگاتە ڕۆژگاری ئەمرۆی ئێمەش نەیوێراوە لەیەکیان جودا بکاتەوە، کێ دەزانێت، خۆ ڕەنگە سەرلەنوێ یەکانگیریش ببنەوە.

بەڵام بابزانین چۆن جەنگ بەسەرهەڵدانی دەوڵەت کۆتایی هات؟ ئەمە لەبەرئەوە نییە کەمرۆڤ بەخۆڕسك ئارەزووی جەنگ بکات، ئەوەتا زۆر گەلی دواکەوتوو بەڕادەیەکی زۆر ئاشتی پەروەرن، ئەسکیمۆکان هەرگیز لەوە حاڵی نەدەبوون بۆچی ئەوروپاییەکان وێڕای ئەوەی هەموویان هەڵگری یەك ئایینی ئاشتیخوازانەن کەچی وەك نەهەنگی دەریا دوای یەکتری کەوتوون بۆ لووشدانی یەك، یان بۆچی هەندێکیان زەوی ئەوانی تر زەوت دەکەن، بۆیە وەك جۆرێك

لەپیرۆزکردنی خاکەکەی خۆیان پەندێکیان هەبوو دەیانگوت: "ئای چەندە جوانە جاجمەکەی ئێمە بەفرو بەستەڵەك بێت!! چەندە جوانە ئاڵتوون‌و زیوی شاردراوەی ژێر تاوێرەکانی ئێمە، ئەو ئاڵتوون‌و زیوەی مەسیحییەکان زۆر چاوبرسییانە لەسەری بەربوونەتە سەروگوێلاکی یەك، کەوتبێتە ژێر بەفرێکی چڕوپڕی وەهاوە کەدەستیان نەیگاتێ!! بێ بەروبوومی خاکەکەی ئێمە سەرچاوەی بەختەوەریمانەو هەر ئەویش لەتەمای دەستدرێژکاران رزگاری کردووین.."[٦].

لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی خەڵکە سەرەتاییەکان پڕ بووە لەجەنگی نەبڕاوە، ڕاوچییەکان لەسەر شوێنەکانی ڕاوکردن بەشەڕ دەهاتن کە هەردەم بەنێچیر ئاوەدانیش بووە، شوانکارەکان لەسەر لەوەڕگای تازە بەشەڕ دەهاتن بۆ ڕانە ئاژەڵەکانیان، کشتیارەکان لەسەر زەوی تازەو نەکێڵراو بەشەڕ دەهاتن، هەموو ئەوانەش ناوەناوە بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە بەشەڕ دەهاتنەوە، یان بۆ ئەوەی نەوەی نوێی خۆیان لەسەر ڕەقی‌و لەسەر دیسپلین رابهێنن، یان بۆ ئەوەی کەمێك جووڵە بدەنە ژیانە ڕۆتینییە بێزارکەرەکەیان، یان بۆ ئەوەی دەستکەوتێك لەتالانی بچننەوە، یان کچێك دیل بکەن‌و بڕفێنن، زۆر بەکەمیش ئەوانە لەسەر ئایین‌و بیروباوەڕ شەڕیان کردووە، سیستەم‌و داب‌ونەریتی تایبەتیان هەبوو کە شەڕەکانیان پێ لەقاڵب دەدا، وەك ئەوانەی ئێمە هەمانە، چەند کاتژمێرێکی ڕۆژ یان چەند ڕۆژو هەفتەو مانگێکیان دیاری کردبوو کە لەو ماوانەدا هەمەجیی نەفس بەرز بۆی نەبوو کەس بکوژێت، هەروەك چەند ڕێسایەکیان دانابوو کە نەدەبوو کەس سەرپێچییان بکات، هەندێك ڕێگاش هەبوون نەدەبوو کەس دەستدرێژی بکاتە سەریان، هەندێك بازاڕو نەخۆشخانەشیان هەبوو نەدەبوو شەڕیان تێدا بکرێت. هەر بەم شێوەیە بوو کۆمەڵەی ئیراکوا ئاشتییەکی مەزنی بۆ ماوەی سێسەد ساڵ بەرقەرار کرد[٧]، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا شەڕ ئامرازی دیاریکراوی (هەڵبژاردنی سروشتی) بوو لەنێوان نەتەوەو گروپە سەرەتاییەکاندا.

ئاکامی شەڕەکان سنوورێکی کۆتاییان نەبوو تیایدا رابووەستن، ئەو شەڕانە فاکتەرێکی بێبەزەیی بوون بۆ هەڵکەندنی گەلە لاوازەکانو بنبڕ کردنیان، ئاستی مرۆڤیشیان لەرووی ئازاییو توندوتیژیو دڵڕەقیو زیرەکیو لێهاتوییەوە بەرزتر کردەوە، هانی مرۆڤیشیان دەدا بۆ داهێنان، بوونە هۆی دروستکردنی ئامرازگەلێك کە پاشتر ئامرازی سوودبەخشیان لێ دەرچوو، هەروەها داهێنانی چەندین هونەری جەنگی کە دواتر دەبوونە هونەری ئاشتییانە، "ئەوەتا چەندین هێڵی ئاسنین ئەمڕۆ وەك بەشێك لەپلانی جەنگ دەست پێدەکەنو سەپێنێ دەبنە ئامرازێکی بازرگانیکردن!!"، لەسەرووی هەموو ئەوانەشەوە جەنگ ئەو کۆمۆنەو بێ سەروەبەرەییەی نەهێشت کە لەناو گروپە سەرەتاییەکاندا زاڵ بوو و لەبری ئەوانە سیستەمو یاسای خستە ژیانیانەوە، بوو بەهۆی بەکۆیلەکردنی دیلەکانی جەنگو ملکەچ کردن بەچینەکانو سەرهەڵدانی حکومەتەکان. لەڕاستیدا مولکداری دایکی دەوڵەتەو جەنگیش باوکێتی.

## بابەتی دووهەم

## دەوڵەت وەك ڕێکخستنی هێز – کۆمەڵگەی دێهاتی – پایە دەروونییەکانی دەوڵەت

نیچە دەڵێت: "گروپێك ئاژەڵی سرکی دڕندەی سپی پێست، گروپێك لەشکرکێشی بەرێز، بەهەموو سیستەمە جەنگیو هێزە رێکخراوەکەیانەوە، بەچنگە ترسناکەکانیانەوە، شاڵاو دەبەنە سەر خەڵکێکی زۆر کە ڕەنگە لەرووی ژمارەوە زۆر لەخۆیان زۆرتر بن، بەڵام هێشتا سیستەمێکیان بۆ خۆیان دانەرشتووە کە بارودۆخی خۆیانی پێ دیاری بکەن، ئەمە بنەچەی دەوڵەتە"[٨]. لیستەر وۆرد-یش دەڵێت: "دەوڵەت –وەك شتێکی جیاواز لەسیستەمی هۆزگەرایی- ئەو کاتە دەستپێدەکات کە رەگەزێکی مرۆیی پەلاماری رەگەزێکی دیکە دەدەن"[٩]، هەروەها نۆپنهایمەر دەڵێت:

"چاو بەهەر لایەکدا بگێڕیت دەبینیت هۆزێکی جەنگاوەر پەلاماری سنوورەکانی هۆزێکی تر دەدەن کە هێندەی ئەوان خۆیان بۆ جەنگ تەیار نەکردبێت، دواییش لەخاکی ئەو هۆزە ئائامادەیەدا خۆیان وەك گرووپی چاودێر جێگیر دەکەن‌و دەوڵەتی تێدا دادەمەزرێنن"[١]، تاتزینهۆفەر-یش دەڵێت: "توندوتیژی ئەو ئامرازەیە کە دەوڵەتی خوڵقاندووە"[٢]، گامپلۆویز-یش لەوبارەیەوە دەڵێت: "دەوڵەت ئاکامی پەلامارە، بریتییە لەپێکهاتنی چینێکی فەرمانڕەوا لەسەرکەوتوەکان بەسەر سەری دۆڕاوەکانەوە"[٣]، سیمنەر-یش دەڵێت: "دەوڵەت ئاکامی هێزەو هەمیشە بەپاڵپشتی هێزێك دەمێنێتەوە"[٣].

ئەم مل پێکەچکردنە لەڕێی توندوتیژییەوە زۆرترینی کات سەروگوێلاکی گروپێکی کشتوکاڵیی جێگیر دەگرێتەوە لەلایەن هۆزێك لەڕاوچی‌و شوانکارەکانەوە[٤]، چونکە کشتوکاڵ شێوازی ئاشتییانەو ناتوندوتیژ فێری مرۆڤ دەکات‌و مرۆڤ لەسەر ژیانێکی رۆتینی رادەهێنێت کە ئەمڕۆی لەگەڵ دوێنێیدا جیاوازییەکی نەبێت، بەهۆی ڕۆژێکی درێژی پڕ لەماندووییشەوە مرۆڤەکان شەکەت دەکات، خەڵکێکی لەو جۆرە سامان کۆدەکەنەوە، بەڵام هونەرو هەست‌و نەستی جەنگیان لەبیر دەچێتەوە، هەرچی ڕاوچی‌و شوانکارەیە، کە لەسەر مەترسی ڕاهاتوون‌و لەجەنگیشدا لێهاتوویيان پەیداکردووە، ئەوە وەك جۆرێکی تری ڕاوی نێچیر سەیری جەنگ دەکەن، کە هێندە مەترسییەکانی لەمەترسییەکانی ڕاوکردن زۆرتر نییە، جا ئەگەر سەرچاوەکانی ناو جەنگەڵ وشکی کردو ئەو نێچیرەی تێدا نەما کەدڵیان دەیخوازێت، یان ئەگەر بەهۆی نەمانی لەوەڕگەی پێویستەوە رانە ئاژەڵەکانیان ڕووی لەکەمی کرد، ئەو کاتە پیاوانی ڕاوو شوانکارەکان بەچاوی ئیرەییەوە دەڕواننە کێڵگەکانی گوند بەو هەموو خێروبێرەوە کەتیایاندایە، هەر خێراش بیانوویەك دەدۆزنەوە بۆ هێرشکردنە سەر گوند، لەمەشدا لەخەڵکی ئەم سەردەمەی ئێمە دەچن کە هەر خێرا پاساو بۆ پەلاماردان دەدۆزنەوە، دواتریش پەلامارەکەیان دەدەن‌و تالانی خۆیان دەکەن‌و ئەوسا فەرمانڕەوایی دەوڵەتیش دەگرنە دەست، بەڵام فەرمانڕەوایی

قۆناغێکی درەنگتر بەگوێرەی پلەکانی پێشکەوتن، فەرمانڕەواییەك کە بەر لەچاخەکانی نووسینەوەی مێژوو بوونێکی ئەوتۆی نەبوو، چونکە دروستبوونی دەوڵەت پێویستیی بەگۆڕانکاری بنەڕەتی هەیە لەبنەمای ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیدا، بنەماکە وای لێدێت دەسەڵات بکەوێتە دەست ئەو کەسەی جڵەوی بەدەستە نەك خزم وەك ئەوەی لەکۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا باوبوو، ئەگەرچی یاسای جڵەوگیری لەباشترین حاڵیدا ئەوەیە کە چەند گروپێکی خاوەن سروشتی جیاواز جۆرە یەکانگیرییەك بکەوێتە نێوانیانەوە چ وەك یاساو چ وەك بازرگانی سوودیان پێ بگەیەنێت. تەنانەت لەم حاڵەتەشدا ئەو جڵەوگیرییە وەك دەبینین زۆر بەدەگمەن نەبێت تەمەنی درێژ نابێت، مەگەر پێشکەوتنێك لەبواری داهێناندا هێزی لایەنی خاوەن هێزی زیاتر گردبێتو بایی ئەوەندە چەكو کەرەستەی خستبێتە بەردەست کە ئەگەر شۆڕش هەڵایسا بتوانێت کپی بکاتەوە. لەحاڵەتی جڵەوگرتنی هەمیشەییشدا دەبینین خولیای خۆسەپاندن زیاتر بەلای شاردراوەییدا دەڕوانێت، بەڕادەیەك هێندەی نامێنێت خۆی لەناخی مرۆڤەکاندا بشارێتەوە. ئەو کاتەی فەرەنسییەکان لەساڵی ١٧٨٩دا شۆڕشیان بەرپاکرد، خەریك بوو پەی بەو ڕاستییە نەبەن (ئەگەر کامیل دیمۆلاین وەبیریانی نەهێنایەتەوە) کە ئەو چینی خانەدانانەی فەرمانڕەواییان دەکەن بەر لەهەزار ساڵ لەئەڵمانیاوە هاتوونو بەزەبری هێز خۆیان بەسەر وڵاتەکەیاندا سەپاندووە، بەڕاستی زەمەن شتێك لەپیرۆزی دەبەخشێتە هەموو شتێك لەبووندا، تەنانەت پیسترین دزییەکانیش ئاساییە کە دەیبینین لەنێو دەستی نەوەکانی دزەکەدا وەك موڵکێکی پیرۆز خۆیان دەردەخەن کە نەکرێت دەستدرێژییان بکرێتەسەر. هەموو دەوڵەتێك بەستەم دەست پێدەکات، بەڵام هێندە نابات خووگرتن بەملکەچی دەبێتە حاڵەتێکی ویژدانیو هەر خێراش دوای ئەوە هەموو هاوڵاتییەك وابەستەیی بۆ ئاڵا ناخی دەهەژێنێت.

هاوڵاتی لەم بارەیەوە کارێکی ڕاست دەکات، چونکە سەرەتای دەوڵەت بەهەر چەشنێك بێت هێندە نابات دەبێتە پایەیەکی سەرەکی یاساو ڕێساو ناتوانرێت وازی

لێ بهێنرێ، چونکە ئەگەر بازرگانی کۆمەڵێک هۆزو خێڵ پێکەوە ببەستێتەوە، پەیوەندییەك لەنێوان خەڵکەکەدا دروست دەبێت کە لەبناغەدا پشت بەخزمایەتی نابەستێت، بەڵکو پشت بەو پەیوەندییانە خۆیان دەبەستێت کە لەنێوان خەڵکەکەدان، کەواتە ناچار دەبێت ئەگەر بەداتاشینیش بووە بناغەیەك بۆ رێکخستنی ئەو پەیوەندییە دابتاشرێ. دەتوانین کۆمەڵگەی دێهات بکەینە نموونە بۆ ئەو ڕاستییە، گوند جێگەی هۆزو خێڵی گرتەوەو بوو بەرواڵەتی رێکخستنی کۆمەڵایەتی ناوخۆیی، ئەو گوندە حکومەتێکی سادەی بۆ خۆی دروستکرد کە هێندەی نەماوە بڵێین دیموکراتییە، حکومەتێکە دنگەکانی بریتین لەچەند ناوچەیەکی بچووك کە سەرۆك خێزانەکان تیایدا کۆدەبنەوە، بەڵام هەر تەنها بوونی ئەو گروپانەو زۆروزەوەندییان، پێویستی بەهێزێکی دەرەکی بووە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوانیانو بۆ ئەوەش کە بیانکاتە بەشێك لەتۆڕێکی ئابووریی بەرفراوانتر، هەر دەوڵەتیش بوو ئەو کەلێنەی پڕکردەوە، ئیتر با لەسەرەتادا ئەو دەوڵەتە هەرچییەکی تێدا بێت کەخەڵك لێی بترسنو لێی بسڵەمنەوە. دەوڵەت تەنها لەوەدا نامێنێت هێزێکی رێکخەر بێتو هیچی تر، بەڵکو دەبێتە ئامرازێك بۆ پێکەوە هەڵکردنی بەرژەوەندییەکانی سەدان گروپی رکابەر کە کۆمەڵگە لەشکڵە ئامێتەکەیدا پێکدەهێنن، هەر ئەوەندە دەوڵەت ئەوەی بۆ چوەسەر، پەتی دەسەڵاتو یاساکانی خۆی زیاتر بۆ دوور دەهاوێتو چوارچێوەی خۆی پەیتا پەیتا فراوانتر دەکات. ئەگەرچی شەڕە دەرەکییەکانیش زۆر لەوانەی بەر لەپێکهاتنی دەوڵەت وێرانکارترن، بەڵام ئەو شەڕانە ئاشتیی ناوخۆیی سەقامگیرتر دەکەنو پایەکانی جێگیرتر دەکەن. ئەوەندە بەسە دەوڵەت بەو پێناسەیە بناسیت کە بریتییە لەئاشتییەکی ناوخۆیی بەمەبەستی ئامادەباشی بۆ جەنگێکی دەرەکی. خەڵك کاتێکی زۆریان نەویست هەتا لەوە تێبگەن کە باجدان بەدەوڵەت باشترە لەوەی بەرببنە سەروگوێلاکی یەکتری، سەرانە بدەن بەیەك دزی گەورەو زەبەلاح باشترە لەوەی بەرتیل بەهەمموو لایەکدا بڵاو بکەنەوە. ئەگەر دەتەوێت ئەوەش بزانیت کە

کۆمەڵگەیەکی لەو جەشنە ماوەیەك بەبێ سەردار بمێنێتەوە چیی لێ دەقەومێت، ئەوە سەیری گروپی پاگەندا بکە کە لەکاتێکدا شاکەیان مرد ناچار بوون هەموویان خۆیان پڕ چەك بکەن، چونکە یاسابەزێنەکان ئاشووبو کوشتوبڕو دزی وتاڵانییان بەهەموو وڵاتدا بڵاوکردەوە[15]. سپێنسەر ڕاستی کرد کاتێك گوتی: "بەبێ دەسەڵاتێکی ئۆتۆکرات مەحاڵ بوو گەشەی کۆمەڵگە قۆناغە بەراییەکانی خۆی ببڕێت"[16].

بەڵام ئەو دەوڵەتەی تەنها پشت بەهێز دەبەستێت هێندە نابات بیناکەی تووشی داخوران دێت، چونکە خەڵك ئەگەر بەسروشتی خۆیان بەئەمەکیش بن، بەڵام دیسان هەر بەسروشتی خۆیان کەللەرەقن، هێزیش وەك باج وەهایە، تاچەندە پەنهانو ناڕاستەوخۆ بێت سەرکەوتنی زیاتری لێ دەچنرێتەوە. لێرەوە دەوڵەت –بۆ ئەوەی پارێزگاری لەخۆی بکات- پەنای بردە بەر چەندین ئامرازو ڕێگە کە هەندێکیان هەبوونو بەکاری دەهێنانو هەندێکی تریان بەخۆی دایدەهێنان بۆ ئەوەی ڕاسپاردەکانی خۆی بگەیەنێتە خەڵك، وەك خێزانو کڵێساو قوتابخانە، لەپێناوی ئەوەی ڕەوشتی وابەستەیی بەنیشتمانەوەو شانازیکردن بەو نیشتمانەوە لەناخی هاوڵاتیدا بچێنێت، دەوڵەت بەو جۆری پێگەیاندنەی هاوڵاتی کاری بەسەدان پیاوی پۆلیس نەما، ڕایەکی گشتیشی بۆ یەکانگیربوونی ملکەچانەو وابەستەکارانە دروستکرد، چونکە ئەو جۆرە یەکانگیرییە بۆ حاڵەتی جەنگ زۆر زۆر پێویستە، لەسەرووی هەموو ئەوانەشەوە، کەمینەی دەسەڵاتدار هەوڵیاندا باڵادەستی خۆیان کەلەرێی هێزەوەو بەسەپاندن سەپاندوویانە بەسەر خەڵکدا، بکەنە کۆمەڵێك یاسا کە بشێن بۆ ئەوەی بەسەرێك دەسەڵاتەکەی خۆیانی پێ سەقامگیرتر بکەنو بەسەرێکی تر شتێك ئاسایشو ئارامی ببەخشن بەخەڵکەکە بۆ ئەوەی دەسەڵاتەکەیان پەسەند بکەن، ئەو بەخششەش بریتییە لەدانانان بەمافەکانی رەعیەتدا "دان پێدانانێك بیانخاتە سەر خولیای پەسەندکردنی یاساکانو لایەنگیریکردن لەدەوڵەت".

## بابەتی سێهەم

## یاسا

### نەبوونی یاسا– یاساو داب‌و نەریت – تۆڵەسەندەوە – جەزاکردن – دادگاکان – مەینەتی – شەڕەشمشێری بەرابەرانە – سزادان – ئازادیی سەرەتایی

یاسا لەگەڵ موڵکداریی‌و هاوسەرگیری‌و حکومەتدا پێکەوە دێن، چونکە نزمترین کۆمەڵگەکانن ئەوانەی بەبێ یاسا کاروباری خۆیان ڕایی دەکەن. ئەلفرێد راسل والاس دەڵێت: "لەگەڵ گروپە هەمەجییەکانی ئەمریکای باشوورو ڕۆژهەلاتدا ژیانم بەسەربردووە، لەناویاندا نەیاسام بەرچاو کەوتووەو نەدادگا بێجگە لەڕایەکی گشتی کە خەڵکی گوند زۆر ئازادانە دەری دەبڕن، هەموو مرۆڤێکی ئەوانە زۆر بەوردی ڕێز لەمافی هاوڕێکانی دەگرێت، دەستدرێژیکردنە سەر ئەو مافانە زۆر دەگمەنە یان هەر مەحاڵە، هەموو خەڵك لەو جۆرە گروپانەدا تاڕادەیەك چونیەکن"[٧١].. بەهەمان شێوە هێرمان ملڤیل شتێکی لەو بابەتە لەبارەی خەڵکی دورگەی مارکساس دەنووسێت‌و دەڵێت: "ئەو کاتەی لەناو هۆزی تایپیێ بووم، هەرگیز کەسێك بەتۆمەتی دەستدرێژیکردنە سەر خەڵکانێکی تر نەدرا بەدادگا، هەموو شتێك لەو دۆڵەدا بەهێمنی‌و بەرێکوپێکی بەڕێوە دەچوو، کە هەرگیز لەناو گروپە مەسیحییەکاندا ئەگەر باشترین‌و پاکترین‌و بێخەوشترینیشیان هەڵبژێریت، لەجۆری ئەوان نابینیت، ئەم قسەیە ئازایەتییەکی دەوێت هەتا بیڵێم، بەڵام دەیڵێم، چونکە قسەیەکی ڕاستە"[٧٢]. حکومەتی ڕوسیای کۆنیش چەند خانوویەکی دادگای لەدورگەکانی ئالووشیادا دروستکرد، بەڵام هەرگیز بەدرێژایی پەنجا ساڵ ئەو دادگایانە کارێکیان نەبوو

بیکەن، برینتۆن دەڵێت: "تاوانو دەستدرێژی لەنێو هۆزی ئیراکوادا لەسایەی سیستمە کۆمەڵایەتییەکەیاندا هێندە کەم بوو کە خەریکە وامان لێ بێت هیچ پاساوێك شك نەبەین بۆ هەبوونی یاسای سزادان لەنێویاندا"[91]. ئەمە ئەو هەلومەرجە نموونەییانەن، یان ڕەنگە ئەو شکڵە نموونەییانەی بارودۆخ بووبن لەپشتی ئێمەوە کە ئەنارشیستەکان (فەوزەوییەکان) خوازیاری گەڕانەوەیانن، بەڵام ئەم شکڵە دەبێت هەندێك دەستکاری بکرێت، لەبەرئەوەی گروپە خۆڕسکەکان ئازادییەکی ڕێژەییان هەیە لەبەردەم کۆتو بەندەکانی یاسادا، یەکەم چونکە بەخۆیان ملکەچی کۆمەڵێك دابو نەریتن کە لەڕووی توندوتۆڵیو دژوارییی بەزاندنیان وەك هەر یاسایەکی تر وەهان، دووهەمیش چونکە تاوانەکانی توندوتیژی لەسەرەتادا وەك مەسەلەی تایبەتی تاکەکەسی دادەنرێن کە تیایاندا تۆڵەسەندنەوە سەرپشکەو ئەوەش ڕێگە بۆ خوێنڕشتن خۆش دەکات.

دابو نەریت بۆ ئەوەی ببنە بناغەیەکی جێگیرو بەهێز دەبێت لەژێر هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆیان قایم بکەن، چونکە ئەو دابونەریتە وەك ئەو بەردە نەجووڵاوەیە کە لەبناغەی خانوودایە، پایەکانیشی بریتین لەو بیروڕا هەمەڕەنگو کردارە جۆراوجۆرانەی کە زەمەن بەئەڵقەیەك لەپیرۆزی دەوری گرتوون، لەکاتی شڵۆق بوونی یاسا یان هەر گۆڕانکاریو پشێوییەکیشدا شتێك لەجێگیریو لەڕێسا دەبەخشنە کۆمەڵگا، ئەو سەقامگیرییەی دابو نەریت دەیداتە کۆمەڵگە وەك ئەو سەقامگیرییەیە کە وەچەخستنەوەو غەریزە دەیدەنە ڕەگەزی مرۆیی. لەلایەکی ترەوە دابو نەریت ئەو بەردەوامییە چەندبارەیەیە کە مێشکی مرۆڤەکان لەسەریاندا دەهێڵێتەوە، چونکە ئەگەر مرۆڤ ئەو کەناڵانەی نەبێ کە لەمیانەیانەوە بیرکردنەوەو کارکردن بەشێوەیەکی نەستییانەی ئاسان ڕۆدەچنە خوارێ، ئەوە مێشك ناچار دەبوو بەرامبەر هەر شتێك دوودڵی دایگرێتو هەر خێرایش وەك شێت لەبەر شتەکان هەڵێت. سنوورەکانی غەریزەو خووڕەوشتو دابونەریتو بارە کۆمەڵایەتییەکان تێکڕا

بەگوێرەی یاسایەکی ئابووری دیاری دەبێت کە بۆ کەمێك واز لەزۆرێك دەهێنێت، چونکە کاری عەفەوییانە باشترین ڕێگەیە مرۆڤ لەڕێگەیەوە بچێت بەپیری هەر خرۆشێنەرێکی دەرەکییەوە ئەگەر دووبارە بۆوە، یان بچێت بەپیری هەر هەڵوێستێکەوە ئەگەر بۆ جارێکی تر یەخەی گرتەوە، هەرچی بیرکردنەوەی ڕەسەن‌و جەختکردنەوەیە لەسەر ڕەفتارو هەڵسوکەوت، ئەوە بێ سەرەوبەرەییە لەڕێچکە بەردەوامەکەی خۆیداو مرۆڤ دەرەقەتی نایەت، مەگەر تەنها لەحاڵەتێکدا ئەگەر بیەوێت ڕەفتاری ئاسایی خۆی بەشێوەیەك بگۆڕێت لەگەڵ ئەو هەڵوێستەدا بیگونجێنێت کە یەخەی گرتووە، یان لەو حاڵەتانەدا کە هیوایەکی بەوە هەبێت قازانجێکی زۆر لەو جەختکردنەوەو بیرکردنەوەیە بچنێتەوە.

جا ئەگەر ئەم بناغە سروشتییە کە بریتییە لەدابونەریت، لەڕێی ئایینەوە دڵنیاییەکی ئاسمانیشی بۆ زیاد بکرێت، دابونەریتەکانی باووباپیرانمان هەمان ئەو ڕەفتارانە بن کە خوداوەندەکان لێمانی دەخوازن، ئەو کاتە دابونەریت لەیاسا بەهێزتر دەبێت‌و مرۆڤ بەشێوەیەکی جەوهەری لەئازادییە خۆڕسکییەکەی دوور دەخاتەوە، تۆ ئەگەر بتوانیت سنووری یاسا ببەزێنیت ئەوە نیوەی ئەو خەڵکە سەرسام دەکەیت کە لەقووڵایی ناخەوە ئیرەیی بەهەر کەسێك دەبەن بتوانێت زیرەکانە ئەو دوژمنە دێرینە بۆڕ بدات، بەڵام ئەگەر سنووری داب‌و نەریت ببەزێنیت ئەوە دەکەویتە بەر ڕقی هەموان، چونکە داب‌و نەریت لەناو خەڵك خۆیانەوە سەر دەردێنێت، لەکاتێکدا یاسا لەلایەکی سەرووترەوە بەسەپاندن دەسەپێندرێت بەسەریاندا. یاسا زیاترینی کات مەرسوومێکە دەسەڵات ویستوویەتی، بەڵام دابونەریت هەڵبژاردنی سروشتی ئەو جۆرانەی ڕەفتارە کە لەڕێی ئەزموونەکانی کۆمەڵگەوە باشییان سەلێندراوە، ئەو کاتەی دەوڵەتیش جێگەی خێزان‌و هۆزو خێڵ‌و کۆمەڵگەی گوندنشین دەگرێتەوە کە هەموویان سیستمی سروشتین، یاسا لەچارەسەرەکانیدا جێگەی دابونەریت

دەگرێتەوە، دواتریش ئەو کاتەی نووسین دێتەئاراوە یاسا لەجێگەی دابونەریت دادەنیشێت. یاساکان لەرەوتی گۆڕانکارییاندا لەو یاساڕێژییەوە کە بەرەودوا دەگەڕێتەوەو پشت بەیادەوەریی پیرو بەساڵداچووەکان دەبەستێت دەبێتە سیستمێکی یاساڕێژکراوی ڕوونی تۆمارکراوی سەر پلێت، بەڵام ئەو جێگەگرتنەوەیەی داب‌و نەریت لەلایەن یاساوە ڕۆژێك لەرۆژان نەگەیشتۆتە حاڵەتی بەرکەماڵی، بۆ هەتا هەتایەو لەو دەمەدا کە مرۆڤ بڕیار لەسەر ئەوە دەدات چ ڕەفتارێك لەبارترە بیگرێتەبەرو کە جۆرەکانی ڕەفتار حوکمی باش‌و خراپیان بەسەردا دەدرێت، داب‌ونەریت هەر بەو هێزە دەمێنێتەوە کە لەپشت یاساوە خۆی شاردۆتەوە، داب‌ونەریت هەر بەو هێزە دەمێنێتەوە کە لەپشت تەختی فەرمانڕەواییەوە خۆی دەشارێتەوە، "دواهەمین‌و مەزنترین داوەرە ژیانی مرۆڤ بەڕێوەببات".

یەکەم قۆناغی گەشەکردنی یاسا ئەو قۆناغەیە کە تیایدا مرۆڤ خۆی تۆڵەی خۆی وەردەگرێت، پیاوێکی هۆزە سەرەتاییەکان دەڵێت "ئەم تۆڵەیە هی خۆمەو ئەو ئەرکە لەخۆم دادەماڵم کە بەرۆکی گرتووم"، هەر تاکێکی ئەو هۆزە هیندییانەی لەکالیفۆرنیای خوارووی نیشتەجێن خۆی پۆلیسەو هەر خۆیشی تا ئەوەندەی هێزی تۆڵەسەندنەوەی هەبێت تەرازووی داوەری هەڵدەگرێ. لەزۆربەی کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا ئەگەر کەسی (أ) کەسێکی تر (ب) بکوژێت، لەناکامدا لەسەر دەستی کوڕ یان هاوڕێیەکی (ب) دەکوژرێتەوە کە بابڵێین ئەمیان (جـ)ە، ئەم کوڕە یان ئەم هاوڕێیەش بەدەستی کەسێکی چوارەم دەکوژرێت کەبریتییە لە(د)و کوڕ یان هاوڕێی (أ)ەو هەر بەو شێوەیە کارەکە دەڕوات هەتا هەموو پیتەکان تەواو دەبن، تەنانەت لەپێشکەوتووترین خانەوادەکانی ئەمریکادا هەتا ڕۆژی ئەمڕۆمان نموونەی تۆڵەو تۆڵەکاری بەبەرچاوەوەن. بەدرێژایی تەمەنی یاسا لەهەموو چاخەکانی مێژوودا تەمەنی تۆڵەکاری لەگەڵیدا درێژ دەبێتەوە، ئەمە لەو تۆڵەیەدا دەردەکەوێت کە لەیاسای

ڕۆمانیدا باسکراوه. هەروەك تۆڵە ڕۆڵێکی گەورە لەیاساکەی حامورابی-دا دەگێڕێت، بەو جۆرە دەیبینیت ئەو "چاو بەچاوو ددان بەددان" واتە(هەق بە هەق)ی لەفەرمانەکەی مووسادا هەیە هەتا ئەمڕۆش لەپشت زۆر سزای دادگەراییەوە خۆی حەشارداوە.

هەنگاوی دووهەمی سەر ڕێگای یاساو ژیار لەڕووی کاردانەوەکانی دەرهەق بەتاوان، بریتییە لەوەرگرتنی قەرەبوو لەبری تۆڵەسەندنەوە، چونکە زۆرجار سەرۆك دەسەڵاتو دەستڕۆیشتووی بۆ ئەوە بەکارهێناوە تا پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامانی گروپەکەی بەباشی بهێڵێتەوەو ئەو خێزانە ناچار بکات کە نیازی تۆڵەسەندنەوەیان هەیە لەبری خوێن ئاڵتوون یان شمەکی تر وەربگرن، ئیدی ئەوەندە نابات باجی یاسایی سەرهەڵدەداتو ئەو باجە دیاریی دەکات چ بڕێکی پارە بارتەقای چاوەو چەند بەرامبەر ددانەو قۆڵ بایی چەندەو ژیان بایی چەند. حامورابی لەداڕشتنی یاساکەیدا بەم ئاقارە چۆتە پێشەوە. خەڵکی حەبەشە زۆر بەوردی سزای تۆڵەکارانەیان دەچەسپاند، بەجۆرێك ئەگەر کوڕێك لەسەر دارێکەوە بەربوایەتەوەو بکەوتایەتە سەر هاوڕێکەی‌و بیکوشتایە، حوکمی داوەر ئەوەبوو دایکە کۆستکەوتوەکە کوڕێکی تری خۆی بنێرێت هەتا لەسەر دارەکەوە بەربێتەوە سەر ملی ئەو کوڕەی یەکەمجار تاوانەکەی لەدەست بۆتەوە[20]. خەملاندنی تاوانەکانیش لەحاڵەتی قەرەبوودا بەپێی ڕەگەزو تەمەن‌و پلەوپایەی تاوانبارەکەو قوربانییەکە ڕەنگە بگۆڕێت. خەڵکی فیجی بۆ نموونە دزییەکی بچکۆلەی پیاوێکی ئاسایی بێ پلەو پایە لەلایان زۆر تاوانێکی گەورەتر بووە لەوەی سەرۆك پیاوێك بکوژێت[21]، بەدرێژایی مێژووش هەر ئەمە ڕوویداوە، هەمیشە پێ بەپێی بەرزبوونەوەی پلەو پایەی تاوانبارەکە قورسایی تاوانەکە کەمتر بۆتەوە، جا لەکاتێکدا ئەو جەزاکردن‌و قەرەبووانەی بۆ خۆلادان لەتۆڵەکاری دادەنران پێویستییان بەخەملاندنی تاوانەکەو قەرەبووەکە بووە بەشێوەیەك کە پێکەوە بگونجێن، بۆیە هەنگاوی سێهەمی بەرەو یاسا چوون نرا

که بریتی بوو لەدامەزراندنی دادگا، لێرەشدا سەرۆك‌و ئایینداروو پیرەکان لەئەنجومەنی داوەریدا دادەنیشتن‌و لەوێ ناکۆکییەکانی نێوان خەڵکیان یەکلایی دەکردەوە. ئەو دادگایانە هەموو کاتێك ئەنجومەنێکی وەها نەبوون وەك داوەری ئەمڕۆ حوکم بدەن، بەڵکو زۆر جار بریتی بوون لەئەنجومەنی تەمبێکردن‌و نێوەندگێڕان، ئەوەبوو لایەنە دژەکانیان دەگەیاندە یەك‌و دەیانگەیاندنە چارەسەرێك هەردوولا بەئاشتییانە پێی قایل بن، پەنابردنە بەر دادگاش لای زۆرێك لەگەلان بەدرێژایی چەندین سەدە بەویستی خەڵکەکە خۆیان بووە، ئەگەر قوربانیش بەو حوکمە قایل نەبووایە کەدادگا لەبارەیەوە دەریکردووە بۆی هەبووە بەدەستی خۆی تۆڵەی خۆی بکاتەوە[22].

لەزۆر حاڵەتدا چاوخشاندنەوە بەناکۆکییەکاندا لەشێوەی شەڕێکی نێوان لایەنە ناکۆکەکاندا بەبەرچاوی هەموو خەڵکەوە بەڕێوەدەچوو ، ئەم شەڕانەش لەڕووی بڕی ئەو خوێنەوە کەتیایاندا دەڕژا جیاواز بوون، هەر لەشەڕەمستێکەوە کە هیچ ئازارێکی ئەوتۆی لێ نەدەکەوتەوە (وەك ئەوەی ئەسکیمۆ داناکان دەیکەن) تا دەگاتە شەڕەشمشێرێك کە دەبوو بەمردنی لایەك تەواو بێت. زۆر جار خەڵکە خۆڕسکەکان پەنایان دەبردە بەر گەمەی تاقیکردنەوە بۆ یەکلاییکردنەوەی گرفتەکانیان، بەڵام ئەمە لەسەر بنەمای ئەو تیئۆرییە نەبوو کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا باو بوو گوایا خوداوەند لەڕێی ئەو تاقیکردنەوەیەوە کەسی تاوانبار ئاشکرا دەکات، بەڵکو بنەمای خەڵکە خۆڕسکەکان هیوا بوو بەوەی ئەو تاقیکردنەوەیە چەند لەدادپەروەرییەوە دوور بێت گرنگ ئەوەیە کۆتایی بەململانێیەك دەهێنێت کە ئەگەر پەنا بۆ ئەو شێوازە نەبرێت ڕەنگە ململانێکە بۆ چەندین نەوە هۆزەکە بخاتە پاشاگەردانییەوە. بۆ نموونە داوا لەتاوانبارو خاوەن سکاڵاکە دەکرا هەریەکەیان یەکێك لەو دوو سینییە خواردنە هەڵگرێت بۆ خۆی کە یەکێکیان ژەهراوییە، خۆ ڕێ دەکەوت بێتاوانەکە سینییە ژەهراوییەکە هەڵبژێرێت، (زۆربەی جاریش ژەهرەکە جۆرێك نەبوو کە دواتر چارەسەر

کردنی مەحاڵ بێت)، بەڵام ناکۆکییەکە بەوە دەبڕایەوە، مادام هەردوو لا بەبێ زۆرەملێ بڕوایان بەعەدالەتی بنەمای تاقیکردنەوە هەبوو. خووی هەندێك هۆزی تر بەو شێوەیە بوو کە ئەگەر تاوانبار دانی بەتاوانەکەیدا بنایە دەبوو قاچ لەبەردەم قوربانییەکەدا درێژبکات بۆ ئەوەی خاوەن سکاڵاکە بەنووکی ڕمەکەی برینداری بکات، یان داوا لەتاوانبارەکە دەکرا لەبەر ڕمی خاوەن سکاڵاکاندا رابووەستێتو ئەوان ڕمبارانی بکەن، جا ئەگەر هیچ ڕمێکی بەرنەکەوت ئەوە بێتاوانیی رادەگەیەندرێ، ئەگەر چەند ڕمیش پێکای ئەوە هەم تۆمەتبارکردنەو هەم سزاکەشی وەرگرتووەو بەوەش ناکۆکییەکە یەکلایی دەبێتەوە[٢٣].

بەمجۆرە بنەمای تاقیکردنەوە بەدرێژایی چاخەکاندا دێتەخوارێ، لەو چاخە زۆر سەرەتاییانەوە دەستی پێکردووە هەتا دەگاتە یاساکانی موساو حامورابیو دواتر هەتا دەگاتە چاخەکانی ناوەڕاست، شەڕەشمشێریش (موبارەزە) هەر جۆرێکی ئەو تاقیکردنەوەیە، مێژوونووسان پێیان وابوو ئەو بەرامبەرێنە سەردەمی بەسەرچووە، بەڵام لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆماندا وا خەریکە سەرلەنوێ دەردەکەوێتەوە، بەم جۆرەش دەبینین جیاوازیی نێوان مرۆڤی سەرەتاییو مرۆڤی سەردەم لەهەندێك لایەنی ژیانەوە زۆر بەرتەسکەو، مێژووی ژیاریش زۆر کورتە.

چوارەمین هەنگاوی یاسا لەڕەوتی گەشەکردنیدا بریتییە لەوەی سەرۆك یان دەوڵەت بەڵێنی ئەوە بدەن نەهێڵن کەس دەستدرێژی بکاتە سەر کەسو دەستدرێژیکەر سزا بدەن، لەنێوان یەکلاییکردنەوەی کێشەو سزادانی دەستدرێژیکەر لەلایەکەوەو هەوڵی بەرگرتن لەڕوودانی کێشەو دەستدرێژییەکەدا لەلایەکی ترەوە، تەنها یەك هەنگاو دەمێنێت. بەبڕینی ئەو هەنگاوە ئیدی سەرۆك تەنها وەك داوەرێك نەمایەوە، بەڵکو لەپاڵ ئەوەدا بوو بەیاساڕێژ، ئیدی بەمە یاساگەلێکی نوێ زیادکران بۆ ئەو یاسا گشتییە باوانەی ناو خەڵك کە لەدابونەریتەوە وەرگیرابوون، یاساگەلێکی نوێی داهێنراو کە مەرسوومەکانی

حکومەت سەرچاوەیان بوون. لەحاڵەتی یەکەمدا یاساکان لەخوارەوە بەرەوژووور دەڕۆن، بەڵام لەحاڵەتی دووەمدا لەسەردا دێنە خوارەوە بۆ ناو خەڵک، لەهەردوو حاڵیشدا یاساکان هەر مۆرکێکی نەوەکانی ڕابردوویان تێدا دەبینرێت، دەبینیت هێشتا بۆنی ئەو تۆڵەیەیان لێ دێت کە گوایا ئەمان بۆ ئەوە هاتوون جێگەی بگرنەوە. سزاکانی گروپە سەرەتاییەکان دڵرەقانە بوون[٣٤] چونکە ئەو گروپانە لەژیانی خۆیان دڵنیا نەبوون، بۆیە دەبینیت تا سیستمی کۆمەڵایەتی گەشەی زیاتر بکات سزاکان نەرمتر دەبنەوە. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین لەکۆمەڵگەی خۆڕسکدا مافەکانی تاك کەمتر بوون لەوەی لەکۆمەڵگەی مەدەنیدا هەیە، بەهەر لایەکدا چاو بگێڕیت دەبینیت مرۆڤ بەکۆمەڵێك کۆت و بەندەوە دێتە دنیاوە، کۆت و بەندی میراتگری و ژینگەو داب و نەریت و یاسا، هەر تاکێکی گروپی سەرەتایی لەنێو تۆڕێك لەیاسادا دەجووڵێتەوە کە لەوردەکارییدا دەگاتە ڕادەیەك ئەقڵ وەریناگرێت، هەزارو یەك شتی قەدەغەکراو ڕەفتارەکانی دیاری دەکەن و هەزارو یەك جۆری تۆقاندن ویستی زەوت دەکەن، خەڵکی نیوزیلاندا ئەگەر بەچاو سەیریان بکەیت وادەزانی بەبێ یاسا دەژین، بەڵام لەڕاستیدا داب و نەریت خۆی بەسەر هەموو دیاردەیەکی ژیان و گوزەرانیاندا سەپاندبوو، بەهەمان شێوە خەڵکی بەنگال داب و نەریت بەڕێوەیان دەبات و هیچ توانایەکیشیان نییە بۆ گۆڕین یان بەرهەڵستکردنی ئەو داب و نەریتانە. ئەو داب و نەریتانە چۆنێتیی دانیشتن و هەستان و راوەستان و بەڕێداڕۆشتن و خواردن و خواردنەوەو نوستنیان دیاری دەکەن، هێندەی نامێنێت تاك لەداب و نەریتی ئەواندا بەبوونەوەرێکی سەربەخۆی نێو کایەی ژینگەی خۆڕسکی دانەنرێت، کەسیش بوونێکی ڕاستەقینەی نەبوو بێجگە لەخێزان و لەهۆزو لەخێڵ و لەکۆمەڵگەی گوندنشین، ئەو ئۆرگانانە خاوەنی زەوی بوون و دەسەڵاتیان هەبوو، تاك تەنها پاش دەرکەوتنی موڵکدارێتی تایبەتی نەبێت کە دەسەڵاتێکی ئابووریی بۆ فەراهەمکرد، نەبووە خاوەنی بوونێکی ڕاستەقینەی تایبەت

بەخۆی‌و جیاواز لەبوونی گروپەکەی، هەروەها پاش دەرکەوتنی ئەو دەوڵەتە نەبێت کە دانی بەبوونی یاسایی‌و چەند مافێکی دیاریکراویدا نا[٢٥]. ئێمە مافەکانمان لەسروشتەوە وەرناگرین، چونکە سروشت هیچ مافێك ناناسێت بێجگە لەزیرەکی‌و هێز، بەڵکو مافەکان کۆمەڵێك ئیمتیازن گروپ دەیداتە تاکەکانی خۆی بەو پێیەی دەبنە مایەی خێر بۆ هەموو لایەك. بۆیە ئازادی جۆرێکە لەو خۆشکاتبیەی (تەرەف) کە بەشێکە لەپێداویستییەکانی ژیانی سەقامگیرو تاکی ئازادیش بەروبوومێکی ژیارییەو هەروەها خەسڵەتی جیاکەرەوەی ئەو ژیارەیە.

## بابەتی چوارەم

## خێزان

### ئەرکی خێزان لەژیاردا – هاوسەنگکردنی هۆزو خێزان – گەشەی سەرپەرشتی باوکایەتی – بێبایەخی باوك – لێکترازانی دوو ڕەگەزەکە – مافی دایکایەتی – پێگەی ژن – ئەرکەکانی – کارە ئابوورییەکانی – خێزانی باوکسالاری – ملپێکەچکردنی ژن

ئەگەر برسێتی‌و خۆشەویستی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیان بن، ئەوە ئەرکە سەرەکییەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بریتی دەبن لەدابینکردنی سەرچاوە ئابوورییەکان‌و درێژەدان بەمانەوەی ڕەگەز لەڕووی بایۆلۆژییەوە، چونکە پێکەوەبەسترانی وەچەکان لەزنجیرەیەك نەوەی بەردەوامدا هێندەی خواردن کارێکی نۆرگانییە، بۆیە دەبینیت کۆمەڵگە لەپاڵ سیستمە کۆمەڵایەتییەکانیدا کە ئاسوودەیی مادی‌و ڕێسای سیاسی فەراهەم دەکەن، چەند سیستمێکی تر زیاد دەکات کە درێژە دەدەن بەمانەوەی مرۆڤ لەتوخمەکەی خۆیدا. هۆز (تاکاتی سەرهەڵدانی دەوڵەت لەدەوروبەری سەرەتاکانی ژیاری مێژووییدا کە ئیدی

سیستمی کۆمەڵایەتی بوو بەسەنتەری سەرەکی هەمیشەیی) هۆز هەتا ئەو سەردەمانە ئەم ئەرکە وردەی ڕادەپەڕاند، ئەرکی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان دوو ڕەگەزو پەیوەندییەکانی نێوان نەوە بەرودواکانی یەکتری، بگرە هەتا کاتی سەرهەڵدانی دەوڵەتیش، جڵەوی بەڕێوەبردنی مرۆڤ هەر لەدەستی ئەو گروپەدا جێگیر بوو کە لەهەموو سیستمە مێژووییەکان ڕەگی قووڵترە، واتە خێزان. خۆ ئەگەرێکی زۆر دوورە مرۆڤی سەرەتایی لەخێزانگەلێکی پەرتەوازەدا ژیانی بەسەر بردبێت، تەنانەت لەقۆناغی راویشدا، چونکە لاوازی ئەو ئەندامە فسیۆلۆژیانەی مرۆڤ کە بەرگرییان پێدەکات لەخۆی، بێگومان دەیانکردە نێچیری ئەو درندانەی هێشتا لەسەر زەویدا تەراتێنیان دەکرد. خووی سروشت وەهایە کە هەر بوونەوەرێك بەتاك توانای بەرگریکردنی لەخۆی کەم بێت پەنا دەباتە بەر پشت بەستن بەتاکگەلێکی تری لەجۆری خۆی، بۆ ئەوەی هەموو ئەو تاکانە پێکەوە پەناببەنە بەر هاوکاریی یەکتری لەپێناوی درێژەدان بەمانەوەیان لەجیهانێکی پڕ لەکەڵبەو چنگ‌و پێستی جیڕ. ئەگەری زۆریش هەیە مرۆڤ سەرەتا بەم شێوەیە گوزەراندبێتی، سەرەتا بەئامێتەبوونی لەنێو گروپی راوداو دواتر لەنێو هۆزدا خۆی قوتار کردبێت. پاشان کە پەیوەندییە ئابوورییەکان‌و سەروەریی سیاسی وەك بنەمای ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی جێگەی خزمایەتییان گرتەوە، هۆز ئەو پێگەیەی خۆی لەدەست دا کە پێشتر کردبوویە پایەی بنەڕەتی کۆمەڵگە، ئەوسا خێزان لەلاخوارووی بونیادەکەیداو لەلاسەرووشیدا دەوڵەت جێگەیان گرتەوە، ئیتر لەوەودوا حکومەت گرفتی سەقامگیرکردنی ڕێساکانی گرتە ئەستۆی خۆی‌و خێزانیش ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆی خۆی کە پیشەسازییەکان ڕێك بخاتەوەو کار بۆ مانەوەی توخمی مرۆڤ بکات.

ئاژەڵە ئاست نزمەکان ئەو خووەیان نییە بایەخ بەوەچە بدەن، بۆیە مێینەکانیان بڕێکی زۆر هێلکەی خۆیان فڕێ دەدەن، ئیدی هەندێکیان دەژین‌و گەشە دەکەن، بەڵام زۆرینەی هەرەزۆریان یان لووش دەدرێن یان پیس دەبن،

زۆربەی جۆرەکانی ماسی ساڵانە یەك ملیۆن گەرا دادەنێن، تەنها جۆرێکی کەمیشیان هەن برێك سۆز ببەخشنە بەچکەکانیان، هەر یەکێکیان ئەگەر ساڵانە پەنجا گەرا دابنێت بەشی مەبەس‌و پێداویستیەکانی دەکات. باڵندەکان لەماسی زیاتر بایەخ بە بەچکەکانیان دەدەن، هەر باڵندەیەك ساڵانە پێنج تا دوانزە هێلکە دەکات، بەڵام ئاژەڵە مەمکدارەکان کە بەناویاندا دیارە بایەخی زیاتر بەبەچکەی خۆیان دەدەن[٣٦]، ئەوە بەوەچەیەکەوە کە وەك تێکڕای ساڵانە لەسێ بەچکە بۆ هەر مێینەیەك تێناپەڕێت، بەو وەچەیەوە خۆیان بەسەر زەویدا زاڵکردووە. یاسای بنەڕەتی لەجیهانی ئاژەڵاندا ئەوەیە کە وەچەی زۆر نانەوەو لەناوچوونی بەکۆمەڵی وەچە پێکەوە ئاستیان لەگەڵ بایەخدانی زیاتری دایکان‌و باوکان بەبەچکەکانیان دادەبەزێت. یاسای بنەڕەتیی جیهانی مرۆڤیش لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە وەهایە کە هەتا ئاستی ژیاری بەرەو پێشەوە بچێت تێکڕای لەدایکبوون‌و تێکڕای مردنیش کەم دەبێتەوە. ئەگەر بایەخدانی خێزان بەمنداڵ باشتر بکرێت، ئەوە توانای ئەوە دەبەخشێتە ئەو منداڵانە ماوەیەکی زیاتر لەژێر چەتری خێزاندا بمێننەوەو مەشق‌و گەشەکردنیان تەواوتر دەبێت بەر لەوەی فڕێ بدرێن بۆ پشت بەستن بەخۆیان، هەروەها کەمیی ڕادەی منداڵبوون ڕووی تواناکانی مرۆڤ دەکاتە جۆری دیکەی چالاکی لەبری ئەوەی هەمووی لەپرۆسەی وەچەخستنەوەدا لەناوببرێت.

بەو پێیەی زۆربەی ئەرك‌و خزمەتەکانی بەخێوکردنی منداڵان بەژن دەسپێردرێ، بۆیە بەگوێرەی ئەو بناغەیەی ڕێکخستنی خێزان لەسەرەتادا لەسەری ڕاوەستابوو (تا ئەوەندەی بتوانین لەنێو تڵخایی مێژووەوە چاوێك بگێڕین) ڕۆڵی باوك تەنها ڕۆڵێکی بێبایەخ‌و سەرپێی بوو، لەکاتێکدا ڕۆڵی دایك لەو ئەرکەدا بنەڕەتی بوو و هیچ ئەرکێکی تری لەپێشەوە نەبوو، خۆ ئەو ڕۆڵە فسیۆلۆژییەی نێرینە لەگردەی زاووزێدا دەیگێڕێت ئەوەندە نادیارە لەوانەیە سەرنجی هەندێك هۆزی ئەم ڕۆژگارەش ڕانەکێشێت، ڕەنگە گروپە مرۆییە هەرەکۆنەکانیش

هەروابووبن، پیاو لەمەدا وەك نێرینەی ئەو جۆرانەی ئاژەڵە کە سروشت بانگهێشتیان دەکات بۆ زاووزێو ئەوانیش هەر نێرێکیان مێینەی خۆی بانگ دەکاتو وەچە دەخەنەوە بەبێ ئەوەی مێشکیان بەوە ماندووبکەن ئەم کردەیە لێکبدەنەوەو شیبکەنەوە بۆ هۆکارو ئاکام.. دانیشتوانی دورگەکانی ترۆبریاند سکپڕیی ژنان گرێ نادەنەوە بەپەیوەندیی نێوان دوو ڕەگەزەکەوە، بەڵکو وەهای لێك دەدەنەوە گوایا خێوێك دەچێتە ناو سکی ژنەکەوە، ئەو خێوەش هەردەم لەکاتی خۆشتندا دەچێتە سکییەوە، ئەو کچەی سکیشی پڕ دەبێت دەڵێت: "ماسی گازی لێگرتووم". مالینۆفسکی دەڵێت: "پرسیاری ئەوەم لێکردن ئەگەر منداڵێك بەزۆڵی لەدایك بوو کێ دەبێتە باوکی؟ هەموویان پێکەوە گوتیان: ئەوە منداڵێکی بێ باوکە، چونکە کیژەکە شووی نەکردووە.. کە برێك ڕوونتر لێم پرسین: کێ پەیوەندییەکی فسیۆلۆژیی بەو کچەوە بەستوەو منداڵی لێ بووە؟ هیچ لەپرسیارەکەم نەگەیشتن، خۆ ئەگەر وەڵامیان بدایەتەوە ئەوە دەیانگوت: خێو ئەو منداڵەی پێ بەخشیووە". دانیشتوانی ئەو دورگەیە بڕوایەکی سەیریان هەبوو، ئەویش گوایا خێو زووتر دەچێتە ژنێکەوە کە خۆی تەسلیمی زۆرترین ژمارەی پیاوان بکاتو لەو ڕووەوە خۆپارێزی نەکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ژنان بیانویستایە سکیان پڕ نەبێت ئەوە هەر کاتێك ئاوی دەریا بەرز بوایەتەوە ماوەیەك مەلەیان تێدا نەدەکردو پەیوەندیشیان بەپیاوانەوە نەدەکرد لەو ماوەیەدا[٢٧]، خۆ ئەو بڕوایە چێژو تامی خۆی هەیەو بێگومان خەڵکی لەسەرسوڕمانێکی زۆر رزگارکردووە لەبەردەم هەر پەیوەندییەکی نێوان ژنو پیاودا.

هەرچی خەڵکی مالینیزیایە، دەیانزانی سکپڕی ئاکامی پەیوەندیی نێوان دوو ڕەگەزەکەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کچانەی شوویان نەکردبوو سوور بوون لەسەر ئەوەی هۆکاری سکپڕییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ جۆرە خواردنێکی دیاریکراو کە خواردوویانە[٢٨]، تەنانەت پاش ئەوەش ئەرکی نێرینەیان زانی لەکردەی زاووزێدا،

هێشتا پەیوەندییە سێکسییەکانیان هێندە بێ سەرەوبەرە بوو کە بەئاسانی نەیاندەتوانی باوکی هەر منداڵێك دەستنیشان بکەن، هەر لەبەر ئەوەشە ژنی سەرەتایی زۆر بەکەمی خۆی بەوە بەوە سەرقاڵ دەکرد بەدوای باوکی منداڵەکەیدا بگەڕێت، منداڵ منداڵی خۆی بوو، خۆیشی وابەستەی هیچ پیاوێك نەبوو، بەڵکو وابەستەی باوکی، یان برای، یان هۆزەکەی بوو، چونکە لەگەڵ ئەواندا ژیانی خۆی بەسەر دەبرد، ئەوانە هەموو خزمە نێرینەکانی خۆی بوون کە منداڵەکەی دەبوو وەك خزمانی خۆی بیانناسێت[٢٩]. بۆیە پەیوەندییە سۆزدارییەکانی نێوان براو خوشك لەپەیوەندیی نێوان مێردو ژن بەهێزتر بوو، لەزۆر حاڵەتدا مێردەکە لەگەڵ خێزانو هۆزی .دایکی خۆیدا دەژیاو تەنها وەك میوانێکی چارشێودار ژنەکەی دەدیت، تەنانەت لەژیاری کۆندا برا لەلای ژن لەمێرد خۆشەویستتر بوو. ئەوەتا ژنی (ئەنتافەرنیز) براکەی لەتووڕەیی (دارا) رزگار دەکات نەك مێردەکەی، بەهەمان شێوە ئەنتیگۆنا لەپێناوی براکەیدا نەك مێردەکەی خۆی دەکاتە قوربانی[٣٠]. ئەو بیرۆکەیەی دەڵێت ژنی هەر پیاوێك نزیکترین کەسی دنیایە لەدڵییەوە بیرۆکەیەکی تاڕادەیەك نوێیە، پاشان بیرۆکەیەکە تەنها لەناو بەشێکی تاڕادەیەك کەمی مرۆڤایەتیدا بوونی هەیە[٣١].

پەیوەندیی نێوان باوكو منداڵەکانی لەکۆمەڵگەی سەرەتاییدا هێندە لاوازە کە هەر یەکەیان بەجیا لەیەکتریو لەناو ژمارەیەك هۆزی جیاجیای زۆردا ژیان بەسەر دەبەن، ئەوەتا لەئوسترالیاو لەنیوگینیای بەریتانیدا، لەئەفەریقاو میکرۆنیزیا، لەئوسامو بۆڕما، لەناو ئەلووشییەکانو ئەسکیمۆکانو سامۆدییەکاندا، لێرەو لەوێی ئەمسەرو ئەوسەری جیهاندا، هەتا ئەمڕۆش ڕەنگە هۆزگەلێك ببینیت ژیانی خێزانی بەهیچ شێوەیەك لەناویاندا دیار نییە، پیاوان بەجیا لەژنان دەژین، زۆر بەکەمیش نەبێت سەریان لێ نادەن، تەنانەت خۆراکیشیان جیایەو هەرلایەکیان دوور لەوی تر نانی خۆی دەخوات. لەباکووری بابوا پیاو بۆی نییە لەگەڵ ژندا بەبەرچاوی خەڵکەوە پێکەوە ببینرێن، با ئەو ژنە دایکی

منداڵەکانیشی بێت. خەڵکی تاهیتی بەهیچ شێوەیەك بەژیانی خێزانی ئاشنا نین‌و نازانن چییە، هەر لەم جیابوونەوەی دوو رەگەزە پەیوەندیی نهێنی دەکەوێتەوە، پەیوەندیی نێوان پیاوو پیاو کە لەهەموو رەگەزە سەرەتاییەکاندا دەبینرێت، ئەو پەیوەندییەی زۆربەی کات دەروازەیەکە پیاوان لێوەی لەدەست ژنان هەڵدێن[٣]. ئەم پەیوەندییە نهێنییانە لەژیانی ئەمرۆی ئێمەشدا هاوشێوەیان هەیە، جا ئەگەر لەرواڵەتیشدا جیاواز بێت بەڵام ئەمەی ئەمرۆ وەچەی ئەوەی زووە.

کەواتە سادەترین شێوەی خێزان بریتییە لەژن‌و ئەو منداڵانەی لەسایەی دایکیدا یان براکەیداو لەناو هۆزەکەیدا بەخێویان دەکات. ئەم سیستمە ئاکامێکی سروشتیی خێزانە لەناو ئاژەڵاندا کە لەدایکەو بێچووەکانی پێکدێت، هەروەك ئاکامێکی سروشتیی ئەو نەزانینیە بایۆلۆژییەیە کە خەسڵەتی مرۆڤی سەرەتاییە. ئەم سیستمە خێزانییە لەیەکەمین چاخەکاندا شتێك هەبوو جێگەی بگرێتەوە، ئەویش ئەو جۆری هاوسەرگیرییە بوو کە پیاوەکەی دەخستە سەر خێزانی ژنەکەی، بەگوێرەی ئەو سیستمە دەبوو مێردەکە هۆزەکەی خۆی بەجێ بهێڵێت‌و لەگەڵ هۆزو خێزانی ژنەکەیدا ژیان بەسەر ببات‌و خۆی بخاتە خزمەتییەوە، یان بەخۆی‌و ژنەکەیەوە خزمەتی باوکی ژنە بکەن. لەم حاڵەتەدا گەڕان بەدوای بنەچەدا لەرێی دایکەوە دەبێت‌و میراتگریش هەر لەرێی ئەوەوە دەبێت، تەنانەت مافەکانی پەیوەست بەتەختی فەرمانڕەوایییش هەر لەرێی دایکەوە دەگەیشتە دەستی جێگرەوە نەك لەرێی مێردەوە[٣]. بەڵام ئەو مافی دایکایەتییە مانای ئەوە نەبوو جڵەوی پیاوان لەدەستی ژناندا بێت[٣]، چونکە ئەگەر میراتیش لەدایکەوە بۆ کوڕەکانی بەجێ مابێت، بەڵام خۆی دەسەڵاتێکی زۆر کەمی بەسەر ئەو میراتییەدا هەبوو، هەموو مەسەلەکە ئەوەبوو ژن بووبووە ئامرازێکی گەڕان بەدوای بنەچەدا، چونکە ئەگەر وانەبووایە ئەوە گوێنەدانی خەڵك لەپەیوەندییە سێکسییەکانداو کرانەوەی سێکسی دەبوونە هۆکاری ونبوونی هەموو نیشانەکانی خزمایەتی[٣٥]. بەڵێ، ژن لەنێو هەر سیستمێکی کۆمەڵایەتیداو هەرچییەك بێت دەسەڵاتێکی خۆی

هەیە با ئەو دەسەڵاتە زۆر سنووورداریش بێت، ئەوەش سەرەنجامی سروشتیی ئەو ڕۆڵە هەستیارەیە کە لەخێزاندا هەیەتی‌و ئەو ئەرکەی لەئەستۆیدایە لەڕووی دەستکاریکردنی خۆراک‌و شمەکەکانی پیاوو توانای ڕەتدانەوەی پیاو. مێژوو هەندێك جار لەنێو هەندێك هۆزی ئەفەریقای باشووردا سەرداری ژنیشی بەخۆیەوە بینیووە، سەرۆك لەدورگەکانی بلیۆدا نەیدەتوانی هیچ کارێکی گرنگ ئەنجام بدات ئەگەر ڕاوێژی بەئەنجومەنێکی پیرێژنان نەکردایە، ژنانی هۆزی ئیراکواش ئەگەر ئەنجومەنی هۆزەکە کۆبوونەوەی بکردایە لەدەنگدان‌و قسەکردندا مافێکی تەواو وەك مافی پیاویان هەبوو[٦]، ژنانی هیندییەکانی سەنکاش هێزێکی مەزنیان هەبوو کە ڕەنگ بوو بیانگەیەنێتە مافی دیاریکردنی سەرۆك، ئەمە هەمووی ڕاستە، بەڵام بەهەموو ئەوانە حاڵەتی دەگمەنن‌و زۆر بەکەمی ڕوودەدەن، بەڵام لەزۆرینەی حاڵەتەکاندا پێگەی ژن لەنێو کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا پێگەیەکی ملکەچانە بوو کە لەپێگەی کۆیلە نزیك دەبۆوە، چونکە ئەو لاوازییە جەستەییەی لەدەمی (حەیز)دا یەخەی ژنی دەگرتەوەو مەشق نەکردنی لەسەر هەڵگرتنی چەك‌و لەبنهاتنی هێزو تواناکانی لەڕووی بایۆلۆژییەوە بەهۆی دووگیانی‌و شیردان بەمنداڵ‌و پەروەردەکردنی منداڵانەوە، هەموو ئەوانە بەسەریەکەوە لەشەڕیدا بەرامبەر پیاوان دەبوونە کۆسپ لەبەردەمیدا، ناچاریشیان دەکرد بچێتە خوارترین پێگە لەهەموو گروپەکاندا، تەنها دواکەوتووترین‌و پێشکەوتووترین گروپەکان نەبێت.

مەرجیش نییە پێشکەوتنی ژیار بەرزبوونەوەی پلەو پایەی ژنانی بەدوادا بێت، لەوڵاتی گریکی سەردەمی برۆکلیزدا لەچارەی ژنان نوسرابوو پێگەیان لەپێگەی ژنانی هیندییەکانی ئەمریکای باکوور نزمتر بێت، پێگەی ژن ئەوەندەی پێ بەپێی گرنگیی پیاو لەجەنگدا بەرزو نزم دەکات، ئەوەندە وابەستەی گەشەکردنی ڕۆشنبیریی پیاوو گەشەکردنی ئیتیکی پیاوان نییە.

ژن لەقۆناغی ڕاودا دەتوانین بڵێین هەموو ئەرکەکانی ڕادەپەڕاند، خودی کردەی ڕاوکردنەکە نەبێت، هەرچی پیاوە ئەوە زۆربەی کاتەکانی ساڵ بەپشوویەکی تەواوەوەو بەکەمێك لەخۆڕازیبوونەوە خۆی لێ درێژ دەکرد، چونکە ئەو خۆی تووشی ناڕەحەتیی ڕاونانی نێچیرو مەترسییەکانی کردووە. ژن منداڵێکی زۆری دەخستنەوەو پەروەردەی دەکردن‌و کەپر یان ماڵەکەی بەباشی دەپاراست، خواردنی لەدارستان‌و کێڵگەکان کۆدەکردەوەو چێشتی ئامادە دەکردو جلوبەرگ‌و پێڵاویشی دروست دەکرد[٣٧].. ئەگەر هۆزەکەش شوێنی خۆیان بگوێزایەتەوە لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر، پیاو بێجگە لەچەکەکانی خۆی هیچی هەڵنەدەگرت، چونکە ناچار بوو لەئامادەباشیدا بێت بۆ بەرەوبوونەوەی هەر دوژمنێك بیەوێت هێرش بکاتە سەریان، بۆیە هەموو شمەکەکانی تر دەبوو ژنان هەڵیانگرن. ژنانی هۆزی بوشمەن وەك کارەکەرو بارهەڵگریش بەکار دەهێنران، ئەگەر دەریش بکەوتایە کەتوانای ئەوەیان نییە پێ بەپێی کاروانەکە بەرێدا بڕۆن، ئەوە لەسەر چەقی ڕێگە بەجێیان دەهێشتن[٣٨]. دەگێڕنەوە دانیشتوانی ڕووباری موریی خوارووو ئەگەر گاگەلێکیان ببینیایە وایاندەزانی ژنی پیاوی سپی پێستەکانن[٣٩]. ئەو جیاوازییەش کە ئەمڕۆ لەنێوان توانا جەستەییەکانی ژن‌و پیاودا دەیبینین، دەکرێ بڵێین کە لەسەردەمانی زوودا بوونی نەبووە، ئەو جیاوازییەی ئێستا سەرەنجامی ژینگەیە زیاتر لەوەی سروشتێکی ڕەسەنی ژنان‌و پیاوان بێت. ژن لەو سەردەمە کۆنانەدا –ئەگەر ئەو فاکتەرە بایۆلۆژییانە وەلابنرێن کە جارجارە لەجووڵەیان دەخست- باڵای لەباڵای پیاوەوە نزیك بوو، هەروەها لەتوانای بەرگەگرتن‌و لەزیرەکی‌و بوێریشدا لەپیاوەوە نزیك بوو، هێشتا نەبووبوو بە ڕازێنەرەوەیەك‌و بەس یان تابلۆیەك، یان تەنها گەمەیەکی سێکسی، بەڵکو ئاژەڵێکی بەهەرەت بوو دەیتوانی بۆ چەند کاتژمێرێك کاری زۆر قورس بکات، بگرە توانای هەبوو –ئەگەر پێویستی بکردایە- هەتا مردن لەپێناوی کوڕەکانی‌و هۆزەکەیدا شەڕ بکات، سەرۆکێکی هۆزی چیپوا گوتوویەتی:

"ژنان بۆ کارکردن خولْقاون، هەر یەکێکیان دەتوانێت هێندە باری قورس هەلْگرێت بەدوو پیاو هەلْنەگیرێ، هەر ئەوانیش خێوەتەکانمان بۆ هەلْدەدەن‌و جلوبەرگمان بۆ دروست دەکەن‌و چاکیان دەکەنەوەو شەوانیش گەرمان دەکەنەوە، مەحالْە بتوانین بەبێ ئەوان کۆچ بکەین، ئەوان هەموو شتێك دەکەن‌و تەنها شتێکی کەمیشیان تێدەچێت، چونکە مادام هەمیشە خواردن ئامادە دەکەن، دەتوانن لەسالاْنی بێ برشتیشدا پەنجەیان بلێسنەوە"[٤٠].

بەشی زۆری پێشکەوتنی ژیانی ئابووری لەکۆمەلْگەی سەرەتاییدا بۆ ژنان گەراوەتەوە، پتر لەوەی بۆ پیاوان گەرابێتەوە، چونکە لەکاتێکدا پیاو چەندین سەدە هەر دەستی بەشێوازە کۆنەکانی خۆیەوە گرتبوو لەراوکردن‌و ئاژەلْ لەوەراندنەکەیدا، ژن لەنزیك شوێنی نیشتەجێکەیدا سەرقالْی گەشەدان بوو بەکشتوکالْ، دەستیشی کردبوو بەو هونەرە مالْدارییانەی دواتر بوونە گرنگترین پیشەسازیی مرۆڤ. لەداری خوری –گریگەکان ئەم ناوەیان لەرووەکی پەموو نابوو- ژن بەنی دەرست‌و جلوبەرگی لۆکەی دەچنی[٤١]، هەرئەویش –بەلای زۆرترەوە- گەشەی بەهونەری رستن‌و چنین‌و دروستکردنی سەبەتەو کووپەلْەو کاری تەختەو بیناسازی داوە، بەلْکو لەزۆر حالْەتدا ئەو کاری بازرگانیی کردووە[٤٢]، هەر ژنیش گەشەی بەخانوو داوەو پەیتا پەیتا پیاویشی خستۆتە لیستی ئەو ئاژەلاْنەوە کە مالْیی دەکردن‌و بەو جۆرە لەسەر کاروبارو پێداویستییەکانی کۆمەلْگە رایدەهێنا، هەر ئەو کاروبارو پێداویستییانەش دواتر بوون بەبناغەی ژیارو بوون بەو گیراوەیەی بەشەکانی بینای ژیار پێکەوە دەلکێنێت. بەلاْم کاتێك کشتوکالْ گەشەی کردو زۆرتر بوو، رەگەزی بەهێز (نێر) وردە وردە دەستیکرد بەدەست بەسەرداگرتن‌و زەوتکردنی[٤٣]، هەروەها پیاو لەئاژەلْداریدا سەرچاوەیەکی نوێی زیاتری دۆزییەوە بۆ هێزو سامان‌و سەقامگیربوون، تەنانەت کشتوکالْ کە بۆ گەورەپیاوانی سەردەمی زوو کارێکی ساردوسر بوو، پیاو دواجارو دوای چەند بەچەند تەیکردنی زەوی‌و پێداگەرانی رووی لێنا. بەوە پیاوان ئەو سەرکردایەتیە

ئابوورییەیان لەدەست ژنان دەرهێنا کە ماوەیەك بەهۆی کشتوکاڵەوە بەدەستیان هێنابوو. ژن هەندێك ئاژەڵیشی ماڵی کردبوو، پیاو هاتو ئەو ئاژەڵەشی لەکشتوکاڵدا بەکارهێنا، بەوە توانی لەسەرپەرشتیکردنی زەوی کێڵاندا جێگەی ژن بگرێتەوە. کە گۆڕینەوەی بێڵیش بەگاسن برێك هێزوتوانای جەستەیی دەویست، پیاو توانی باڵادەستی خۆی بەسەر ژندا هێندەی تر بباتەپێشەوە، بێجگە لەوەی زۆرتر بوونی موڵکەکانی مرۆڤ لەوەی بتوانرێت لەکەسێکەوە بگوازرێتەوە بۆ کەسێکی تر، وەك ئاژەڵو بەروبوومەکانی کشتوکاڵ، بووە هۆی ئەوەی لەڕووی سێکسیشەوە ژن مل بۆ پیاو کەچ بکات، چونکە پیاو داوای ئەمەکی لێکرد، ئەمەکێك کە بتوانێت بیکاتە پاساو بۆ بەجێهێشتنی هەموو سامانە کەڵەکەبووەکەی بۆ ئەو کوڕانەی ژنەکەی دەڵێت گوایا هی ئەون. بەو جۆرە پیاو وردە وردە پلانەکەی خۆی جێبەجێکردو لەناو خێزاندا دان بەباوکایەتیدا نرا، موڵکداریش لەرێی پیاوەوە دەستی کردە دابەزینو بەمیراتبوون، مافی دایکایەتیش لەبەردەم مافی باوکایەتیدا پاشەکشەی کرد، خێزانی باوکسالاریش، واتە ئەو خێزانەی بەتەمەنترین پیاو سەرۆکایەتیی دەکات، بوو بەیەکەی ئابووریو یاسایی‌و سیاسی‌و ئیتیکی لەکۆمەڵگەدا، ئەو خوداوەندانەش کەپێشتر زۆربەیان ژن بوون وەرگەڕانو بوونە پیاوی ڕیشدار کە وەك باوکانێك دەردەکەوتن بەژن دەورەدرابن، ڕێك چۆن پیاوانی خاوەن خوازونیاز لەکاتی گۆشەگیرییاندا خەونیان پێوە دەبینی.

ئەم وەرچەرخانە ڕووەو خێزانی باوکسالاری -ئەو خێزانەی باوك حوکمی دەکات- گورزێکی جەرگبڕ بوو لەپێگەی ژن، خۆی‌و کوڕەکانی پاش ئەوە لەهەموو ڕووە گرنگەکانی ژیانەوە بوونە موڵکی باوك یان برای گەورەو پاش ئەوانیش موڵکی مێرد، تەواو وەك چۆن کۆیلەکان لەبازاڕدا دەکڕدران ئەمانیش بەهەمان شێوە لەپرۆسەی هاوسەرگیریدا کڕین‌و فرۆشتنیان پێوە کرا، وەك هەموو موڵکەکانی تری مێردیش پاش مردنی ئەمەی دواییان ژن دەبووە میرات، لەهەندێك وڵاتیشدا وەك نیوگاناو، نیوهابەردیزو، دورگەکانی سلێمانو، فیجی‌و،

هیندستان‌و.. تاد، دەخنکێندراو لەگەڵ مێرد لەگۆڕ دەنرا، یان داوای ئەوەی لێدەکرا خۆی بکوژێت بۆ ئەوەی لەو دنیا بکەوێتەوە خزمەتی مێردەکەی[٤]. باوك ئارادەیەکی زۆر بووە خاوەنی ئەو مافەی چۆنی بوێت‌و چۆن حەز بکات ئاوەها مامەڵەی ژنەکانی‌و کچەکانی بکات، بیانکاتە دیاری، بیانفرۆشێت، بەسووڕ بیانداتە خەڵکی تر، لەبەکارهێنانی ئەم مافەشیدا هیچ شتێك ڕێگەی نەدەگرت بێجگە لەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتییانەی ڕێگەیان بەباوکەکانی تر دەدا هەمان مافەکانی ئەم بەکاربهێننەوە، لەکاتێکیشدا لەکۆمەڵگەی باوکسالاریدا پیاو ئەو مافەی لەدەستی خۆیدا هێشتەوە کە هەر پەیوەندییەکی سێکسی لەدەرەوەی چوارچێوەی خێزاندا ببەستێت، کەچی ژن داوای پاکیزەیی تەواوی لێکرا بەر لەشووکردنی، بەم شێوەیە هەر رەگەزێکیان بوو بەخاوەنی پێوەری تایبەت بەخۆی کە هەڵسوکەوتەکانی پێ هەڵبسەنگێندرێت.

ملکەچکردنی ژن بەشێوەیەکی گشتی کە لەسەردەمی راودا دەبینراو دواتر لەسەردەمی زاڵبوونی مافی دایکایەتی لەنێو خێزاندا کەمێك سووکتر بوو، ئێستا زۆر راشکاوانەترو توندتر بۆتەوە، لەروسیای کۆندا لەکاتی شووکردنی کچدا، باوکی بەقامچییەك بەنەرمی لێی دەدا، دواتریش قامچییەکەی دەدایە دەست زاواکەی[٥] وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی ئەرکی لێدانی بووکێ لەمڕۆوە ئیتر بەو دەسپێردرێ. تەنانەت هیندییەکانی ئەمریکا کە هێشتا مافی دایکایەتی تیایاندا بەرقەرارەو هەرگیز ئەو قۆناغەیان تێنەپەڕاندووە، مامەڵەیەکی رەقی ژنەکانیان دەکردو پیسترین کاریان دەخستە ئەستۆیان، زۆر جاریش بەو گفتانە دەیاندواندن کە سەگیان پێ دەدواندن[٦]، ژیانی ژنانیش لەهەموو کەلەبەرێکی ئەم زەوییەدا بەهەرزانتر لەژیانی پیاو دادەنرا، ئەگەر ژنێك منداڵی کچی ببووایە ئەو شایی‌و ئاهەنگەی بۆ نەدەکرا کە لەکاتی لەدایکبوونی کوڕاندا سازدەکرا، تەنانەت زۆرجار ژنان کۆرپە کچەکانیان دەکوشت بۆ ئەوەی لەو دەردیسەرییە رزگاریان بێت کەتووشیان دەهات. ژنانی فیجی پیاوان چۆنیان بوێت ئاوەها دەیانکڕن، زۆر

جاریش نرخەکەیان بریتیە لەتفەنگێك[47]، لەناو هەندێك هۆزیشدا پیاوو ژنەکەی لەیەك جێگەدا ناخەون، نەك ژنەکە لەبەردەم هێزو توانای پیاوەکەدا لاوازی دابگرێت، بگرە خەڵکی فیجی بەشیاوی نازانن پیاو هەموو شەوێك هەر لەماڵەوە بخەوێت. لەنیوگالیدۆنیا ژن لەتەویلە دەخەوێت‌و پیاو لەماڵەوە، هەر لەفیجی رێگە بەسەگ دەدرێ بچێتە هەندێك پەرستگاوە، بەڵام بۆ ژن ناشێت بەهیچ شێوەیەك نزیکی پەرستگا بکەوێتەوە[48]. ئەم دوورخستنەوەیەی ژنان لەکۆڕوکۆمەڵە ئایینییەکان لەناو موسڵمانانیدا تارۆژگاری ئەمڕۆ درێژەی هەیە. بەڵێ.. گومان لەوەدا نییە ژن لەهەموو سەردەمەکاندا جۆرێك لەسەروەریی بەدەستهێناوە بەهۆی بەردەوام قسەکردنییەوە، رەنگیشە جارجارە لەوەدا سەرکەوتنی بەدەستهێنابێت پیاو تەنگەتاو بکات یان تووشی پەشۆکانی بکات یان هەندێك جار بیبەزێنێت[49]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر پیاو ئاغا بووەو ژن کارەکەر. پیاوانی هۆزی (ئەلکەفیر) ژنیان بەهەمان چەشنی کۆیلە دەکڕی، بۆ ئەوەش دەیانکڕین کەتا مردن ژیانیان مسۆگەر بێت، چونکە ئەو پیاوەی ژمارەیەکی باش ژنی هەبوایە هەموو تەمەنی لەپشوودا بەسەردەبردو هیچ کارێکی نەدەکرد، دەبوو ژنەکانی هەموو کارێك ئەنجام بدەن. هەندێك هۆزی هیندی کۆن ژنانی خێزانیان وەك بەشێك لەموڵك‌و ماڵ دادەناو لەگەڵ ئاژەڵە ماڵییەکاندا ژنەکانیش بەمیرات بەجێ دەمان[50]، تەنانەت دواهەمین وەسیەتی موسا لەمبارەیەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی هەستپێکراوی لەنێوان ژن‌و ئاژەڵی ماڵیدا نەکردووە. لەسەرلەبەری وڵاتانی رەشپێستەکانی ئەفەریقاشدا، ژنان تەنها لەوەدا لەکۆیلە جیادەکرانەوە کە ئەوان بێجگە لەقازانجی ئابووری سەرچاوەی چێژی سێکسیش بوون. پرۆسەی هاوسەرگیری بۆ خۆی لەسەرەتادا نموونەیەکی ئەو یاسایانە بوو کە کاروباری موڵکدارییان لەقاڵب دەداو بەشێك بوو لەو رێکخستنە کۆمەڵایەتییەی کاروباری کۆیلەکانی رێکدەخست[51].

# باسی چوارەم
# توخمە ئیتیکییەکانی ژیار

لەحاڵێکدا مەحاڵە کۆمەڵگە بەبێ سیستم (ڕێسا) پێك بێت، هەروەها کە سیستمیش بەبێ یاسا ناگرێت، پێمان باشە ئەم یاسایەی دێینە سەر باسکردنی وەك یاسایەکی گشتی ڕەوتی مێژوو دابنێین، ئەویش ئەوەیە کە: هێزوگوڕی دابونەریتەکان پەیوەندییەکی پێچەوانەی هەیە لەگەڵ زۆروزەوەندی یاساکاندا، هەروەك هێزوگوڕی غەریزە پەیوەندیی پێچەوانە دەیبەستێتەوە بەزۆروزەوەندی بیروڕاکانەوە، هەندێك ڕێساش هەر دەبێت هەبن بۆ ئەوەی خەڵك بتوانن پێکەوە هەڵکەن. ڕەنگە ئەو ڕێسا یان پرەنسیپانە لەگروپە جیاجیاکاندا وەك یەك نەبن، بەڵام دەبێت وەك ناومرۆك لەناو یەك گروپدا یەك بن، هەروەها ئەم ڕێسایانە ڕەنگە چەند شتێکی دانراو بن کەخەڵکەکە لەسەری ڕێکەوتبن، یان دابو نەریت بن یان ئیتیك یان کۆمەڵێك یاسا، هەرچی شتە دانراوەکانە ئەوە چەند ڕواڵەتێکی ڕەفتارو هەڵسوکەوتن کە خەڵکەکە گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کەڵکیان هەیە بۆ گوزەرانیان، دابو نەریتیش ئەو شتە دانراوانەن کە نەوە بەرودواکان پەسەندیان کردوون، ئیتیکیش ئەو دابونەریتانەن کە بەبڕوای گروپەکە ناگرێ وازیان لێ بهێنرێو بەتەواوی پێویستن بۆ بەختەوەریو پێشکەوتنیان، ئەویش دوای ئەوەی لەهەڵبژاردنی سروشتییەوە فێری شت بوون، ئەو هەڵبژاردنە سروشتییەی لەمیانەی ئەزموونەکانی خەڵکدا کە لەژیانیاندا بەسەریاندا دێتو کاتێك لێرەو لەوێ دەکەونە هەڵەوە، ئەو شتە باشەکان دەهێڵێتەوەو شتە گەندەڵەکان ڕادەماڵێت. ئەم دابونەریتە کاریگەرانە یان ئەم ئیتیکانە لەگروپە سەرەتاییەکاندا کە

یاسایەکی نوسراویان نییە هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤەکان ڕێکدەخەن، بەوە سەقامگیریو بەردەوامی دەبەخشنە سیستمی کۆمەلایەتی، ئەگەر کاتێکی زۆریشیان بەسەردا بڕواتو زەمەن جادووی خۆی ببەخشێت پێیان، ئەوە بەچەندبارە بوونەوەیان دەبنە سروشتێکی دووهەم بۆ مرۆڤ ئەوسا ئەگەر مرۆڤ سنوورەکەیان ببەزێنێت هەستی ترسو دڵەڕاوکێو شەرم دایدەگرێت، ئەوەش بنەچەی ویژدان یان هەستی ئیتیکییە کە داروین وەهای دادەنێت بۆتە خەسڵەتی جیاکەرەوەی مرۆڤ لەئاژەڵ. هەر ویژدانیشە لەقۆناغە بالاکانی گەشەیدا دەبێتە هۆشیارییەکی کۆمەلایەتی، واتە دەبێتە ئەو هەستەی تاک کەوا وابەستەی گروپێکی دیاریکراوەو شتێك لەملکەچیو ڕێز قەرزدارباری ئەو گروپەیە. ئیتیکیش شتێك نییە بێجگە لە هاوکاری بەش لەگەڵ کۆ (تاك لەگەڵ کۆمەڵ)، لەهەموو حاڵێکدا ژیار بەبێ ئیتیك مەحاڵ بوو دەربکەوێت.

## بابەتی یەکەم

## هاوسەرگیری

**مانای هاوسەرگیری – بنەچە بایۆلۆژیەکانی – کۆمۆنەی سێکسی – هاوسەرگیریی ئەزموونی – هاوسەرگیریی بەکۆمەڵ – هاوسەرگیریی تاك – فرەژنی – بەهای فرەژنی لەچاککردنی وەچەکاندا – هاوسەرگیری بەبێ هۆز – هاوسەرگیری بەرامبەر خزمەتێك – بەدیلکردن – بەکڕین – خۆشەویستی سەرەتایی – ئەرکی ئابووری هاوسەرگیری**

یەکەمین ئەرکێك دابونەریت بەئەنجامی دەگەیەنێت ڕاگرتنی پایەی یاسا ئیتیکییەکانی گروپێکی دیاریکراوە، هەر ئەوە پەیوەندییەکانی نێوان دوو ڕەگەزەکە ڕێکدەخات بەو پێیەی ئەو پەیوەندییە سەرچاوەیەکی بەردەوامی

کێشەو دەستدرێژیو ئەگەری دارمانە. شکڵی بنەڕەتی ئەم ڕێکخستنە سێکسییەش بریتییە لەهاوسەرگیری کە دەکرێت بەمشێوەیە پێناسەی بکەین: بریتییە لەیەکانگیربوونی نێرومێ بەمەبەستی گرنگیدان بەوەچە. ئەم ڕێکخستنە لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی ترو لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەگۆڕێت، هەتا ئەو رادەیەی لەمێژووی خۆیدا هەموو شکڵێکو هەموو ئەزموونێکی بەخۆیەوە بینیوە کە بەئەقڵدا بێت، هەر لەو بایەخدانەوە کە هۆزە سەرەتاییەکان دەیاندا بەوەچە بەبێ هیچ یەکانگیربوونێکی نێرو مێیەکە لەلایەنی گوزەرانەوە، هەتا دەگاتە ئەم ڕواڵەتەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەیبینین کە نێرو مێ لەگوزەراندا یەکانگیر دەبن بەبێ ئەوەی وەچەیەکیان هەبێت بایەخی پێبدەن.

هاوسەرگیری داهێنانی باوانە ئاژەڵەکانمان بووە، هەندێك باڵندە وەك دەردەکەوێ ژیانێکی ژنو مێردانە بەسەر دەبەن بەپەیوەندییەکی نێوان جووتەکە کە جیابوونەوەی تێدا نییە، لەناو گۆریلاو ئۆرانتۆگانیشدا پەیوەندیی باوكو دایکەکە تەنانەت پاش تەواوبوونی وەرزی وەچەخستنەوە هەر بەردەوام دەبێت، لەم پەیوەندییەشدا گەلێك نیشانەیان هەیە کە تیایاندا لەمرۆڤ دەچن، هەر هەوڵێکی مێینەکەش بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ نێرینەیەکی تر بەرەورووی سزایەکی توندی دەکاتەوە لەسەر دەستی هاوەڵەکەی. دی کریسپینی لەبارەی ئۆرانجەکانی بۆرۆنیۆوە دەڵێت: "ئەوان لەناو خێزاندا ژیان بەسەر دەبەن، نێرینەو مێینەو بەچکەکانیان"، دکتۆر سافاگ-یش لەبارەی گۆریلاوە دەگاتە ئەوەی کە: "شتێکی ئاساییە ببینیت باوكو دایکەکە لەژێر دارێکدا دادەنیشنو خۆیان یاری بەمیوە دەکەنو دەیخۆنو یاری بە(سومر) دەکەنو خۆیانی پێوە خەریك دەکەن، لەکاتێکدا بەچکەکانیان بەوپەڕی خۆشحاڵیو بەقیژە قیژ لەم لق بۆ ئەو لق بەچواردەوریاندا بازبازێن دەکەن". کەواتە هاوسەرگیری لەمێژوودا لەمرۆڤ فووڵترە.

ئەو کۆمەڵگایانەی هاوسەرگیرییان تێدا نییە دەگمەنن، بەڵام لێکۆڵەرەوەی زۆرزان دەتوانێت بەشی ئەوەیان لێ بدۆزێتەوە بتوانێت لەڕێیانەوە وێنەی قۆناغی گواستنەوە بکێشێت لەو بێ سەرەوبەرەییە سێکسییەوە کە لەناو ئاژەڵە دواکەوتوەکاندا باوە تادەگاتە ئەو جۆرانەی هاوسەرگیری کە مرۆڤە سەرەتاییەکان دەستیان پێکرد. لەفۆتۆناو هاوای زۆربەی خەڵك هەرگیز هاوسەریان نەگرتووە، خەڵکی لۆبۆ-ش بەئیباحییەتو بەبێ هەڵبژاردنو دیاریکردن جووت دەبوون، بیرۆکەی هاوسەرگیری هەرگیز لەمێشکیاندا بوونی نەبووە، هەندێك هۆزی بۆرۆنیو هەر بەو شێوەیە بەبێ ئەوەی هاوسەرگیری ببێتە پەیوەندیی نێوان ژنو پیاو ژیانی سێکسییان بەسەربردوە، بۆیە دەبینین پەیوەندیی نێوان دوو هاوەڵەکە زۆر ئاسانتر کۆتایی دەهات لەوەی لەنێوان باڵندەکاندا هەیە، هەندێك هۆزی سەرەتاییش لەڕوسیا ژنانیان بەبێ جیاوازی بەکار دەبرد چونکە ژن مێردێکی دیاریکراوی نەبوو.

کەسانێك وەها وەسفی کورتەبنەکانی ئەفەریقا دەکەن کە بۆ ژیانی خۆیان سیستمی هاوسەرگیری داناتاشن، بەڵکو دەبینیت "غەریزە ئاژەڵییەکانیان بەتەواوی‌و بەبێ هیچ دیسپلینێك تێر دەکەن"، بەڵام ئەم بەکۆمۆنەکردنەی ژنان کە بەرامبەر کۆمۆنەی زەوی‌و خۆراکە هەر لەقۆناغێکی زۆر زوودا لەناوچوو، بەجۆرێك ئەمرۆ تەنها شوێنەوارێکی زۆر کەمی لێ بەجێماوە، بەڵام هەندێك لەیادەوەرییەکانی هێشتا بەشێوەی جیاجیا لەزەیندا ماوەتەوە: لەهەستی زۆر گەلی خۆڕسکدا کە تاك ژنی -ئەو تاکژنییەی ئەوان وەك پاوانکردنی ژنێك لەلایەن یەك پیاوەوە لێی دەڕوانن- پێچەوانەی سروشتەو دوورکەوتنەوەیە لەئیتیك، هەروەها لەو جەژنانەدا کەلەوادەی دیاریکراودا سازی دەدەین‌و بەشێوەیەکی کاتی خۆمان لەکۆت‌وبەندە سێکسییەکان قوتار دەکەین، هەتا ئێستاش ئەم هەستە لەهەندێك جەژندا بەشێوەیەکی لاواز بوونی هەیە، هەروەها لەو داوایەی لەژن دەکرێت خۆی بدات بەدەست هەر پیاوێکەوە بەر

لەوەی ڕێگەی شووکردنی پێ بدرێ، وەك ئەوەی لەپەرستگای مایلیتتا لەبابل دەبینرێ، هەروەها لەخووی بەخشینی ژن بەسوور کەخوویەکی زۆر پێویستە بۆ بەخشندەیی ئیتیك وەك ئەوەی زۆر لەخەڵکە سەرەتاییەکان پێیان وایە، هەروەها لەمافی یەکەم شەوی بووکێنی، کە مافێکی میرزا بوو لەسەرەتاکانی چاخی دەرەبەگی لەئەورووپادا، ڕەنگیشە میرزا لەو بارەیەوە مافەکانی هۆزی کۆنی بەرجەستە کردبێت، بەگوێرەی ئەو مافەش میرزا بۆی هەبوو کچێنی بووکێ بدڕێنێت بەر لەوەی ڕێگە بەزاوا بدرێ پرۆسەی هاوسەرگیرییەکەی دەست پێ بکات. دواتر پەیتا پەیتا جۆری جیاجیای یەکانگیربوونی ژن‌و پیاو کەوەك ئەزموونگەری بوون، جێگەی ئەو پەیوەندییانەیان گرتەوە کەسنووریان بۆ دیاری نەکرابوو، لەلای هۆزی ئۆرانج ساکای لەمالاگا ژن هەتا ماوەیەك لەگەڵ یەك بەیەکی پیاوانی هۆزەکەدا جووت دەبوو، کەهەمووشیان تەواو بوونایە لەسەرەوە دەستی پێ دەکردەوە، لەناو هۆزی یاکوت لەسیبیریاو هۆزی بۆتۆکۆدۆ لەباشووری ئەفەریقاو چینە نزمەکانی تیبت‌و زۆر گەلی تریش، هاوسەرگیری پرۆسەیەکی تەواو ئەزموونگەری بوو، بەو مانایەی هەریەك لەژن‌و پیاوەکە مافی ئەوەی هەبوو پەیوەندییەکە هەڵوەشێنێتەوە کەی بیەوێت بەبێ ئەوەی هیچ هۆیەك پیشان بدات یان داوای هیچ ڕوونکردەوەیەکی لێ بکرێت، لەلای هۆزی بوشمەن-یش بچووکترین ناکۆکی لەنێوان ژن‌و پیاودا بەسە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ژیانی هاوسەری، ئەوەندەش نابات هەریەکەیان هاوسەرێکی تر دەگرێت بۆ خۆی، لەلای هۆزی داماترا وەك سێر فرانسیز گالتۆن دەگێڕێتەوە "نزیکەی هەفتانە هاوسەر دەگۆڕدرێ، زۆر بەدەگمەن‌و ئەویش دوای بەدواداچوون‌و گەڕانی زۆر دەمزانی کێ مێردی کاتی ئەم خانم یان ئەو خانم بووە لەکاتێکی دیاریکراودا"، بەهەمان شێوەش لەلای هۆزی بایلا ژنان لەلای پیاوێکەوە دەچنە لای پیاوێکی ترو بەوپەڕی خواستی خۆیان هاوسەرێك بەجێ دەهێڵن‌و یەکێکی تر دەگرن، ئەو کچانەشیان کەهێشتا تەمەنیان لەبیست ساڵ تێنەپەڕیووە دەبینیت هەر

یەکێکیان لەزۆر حاڵەتدا چوار یان پێنج مێردی هەیە کەهەموویان زیندوون، وشەی هاوسەریش لەهاوای لەبنەچەدا بەمانای (ئەزموون)ە، هاوسەرگیریش لەتاهیتی هەتا پێش سەدەیەك هیچ کۆتێکی لەسەر دانەدەنراو ژن‌و پیاو دەیانتوانی تا ئەوەندەی منداڵیان نەبێت بەبێ هیچ هۆکارێك هاوسەرییەکەیان هەڵوەشێننەوە، ئەگەر منداڵیشیان هەبوایە بۆیان هەبوو بیکوژن بەبێ ئەوەی کۆمەڵگا لەسەر ئەوە هیچ سەرزەنشتییەکیان بکات، یان هەر خۆیان بەخێویان دەکردو بەوەش ژیانێکیان لەپەیوەندییەکی هەمیشەیی دەست پێدەکرد، بەشێوەیەك کەپیاوەکە بەڵێنی بەژنەکە دەدا خەرجییەکانی بکێشێت بەرامبەر بەخێوکردنی ئەو منداڵەی گرتوویەتییە ئەستۆی خۆی.

مارکۆ پۆلۆ لەسەدەی سیانزەهەمدا لەبارەی هۆزێکی ئاسیای ناوەڕاست کەنیشتەجێی هەرێمی پاین بوو، ئەمڕۆ بەو هەرێمە دەگوترێت کیریا، دەنووسێت‌و دەڵێت: "ئەگەر پیاوێکی خێزاندار گەشتێکی وەهای بکردایە بیست ڕۆژ لەوڵاتەکەی دوور بکەوتایەتەوە ژنەکەی ئەگەر خۆی بیویستایە مافی ئەوەی دەدرایە شوو بەپیاوێکی تر بکات، هەمان بنەما پیاوانیشی دەگرتەوە، ئیدی بچوونایەتە هەر جێگەیەك لەوێ هاوسەریان دەگرت"، بەم جۆرەش دەبینین ئەم شێوازانەی ئەمڕۆ خستوومانینە سەر هاوسەرگیری‌و ئیتیکەکانمان لەبنەچەدا کۆنن.

لیترنیۆ لەبارەی هاوسەرگیرییەوە دەڵێت: "هەموو جۆرەکانی هاوسەرگیری بەجۆرێك کەلەگەڵ درێژیی تەمەنی کۆمەڵگا هەمەجی‌و وەحشییەکاندا گونجابن تاقیکراونەتەوە، هەندێکیشیان هەتا ئەمڕۆ لەلای ڕەگەزو توخمی مرۆیی جیاجیا ماونەتەوە، بەبێ ئەوەی ئەوە بەبیری خەڵکەکانیاندا بێت کەچ بیرۆکەیەکی ئیتیکی هەمیشە بەسەر ئەوروپادا زاڵە"، لەپاڵ تاقیکردنەوەی ماوەی هاوسەرگیری پەیوەندییەکانی نێوان ژن‌و مێردیش تاقیکراونەتەوە، لەهەندێك حاڵەتی کەمدا هاوسەرگیریی بەکۆمەڵ دەبینین، بەو مانایەی کۆمەڵێك پیاوی

سەر بەگروپێك كۆمەڵێك ژنی سەر بەگروپێكی تر بكەنە هاوسەری خۆیان، بەجۆرێك كەهاوسەرگیرییەكە لەنێوان دوو كۆمەڵەكەدا دەستەجەمعی بێت، لەتیبت بۆ نموونە كۆمەڵێك برا دەبوونە هاوسەری كۆمەڵێك خوشكو ئیدی كۆمۆنەیەكی سێكسی دەكەوتە نێوان دوو كۆمەڵەكەوە، هەر پیاوێك بۆی دەبوو لەگەڵ هەركام لەژنەكان جووت ببێت، سیزار خوویەكی لەو جۆرە لەناو بەریتانیای كۆنیشدا باس دەكات كەهێنانی براژن پاش مردنی برا یەكێك بوو لەشوێنەوارەكانی ئەو خوە، ئەمە لەناو جوولەكە كۆنەكانداو لەناو زۆر گەلی تری كۆنیشدا هەر باو بووە، هەتا (ئۆنان) زۆر لەم خووە پەست بوو.

جا چی پاڵی بەخەڵكەوە نا ئەم حاڵەتە سەرەتاییەی كەتیایدا هاوسەرگیری لەپشێوییەوە نزیكتر بوو تا لەهەر شتێكی تر بگۆڕنەوە بەهاوسەرگیرییەكی تاكگەری؟

گومان لەوەدا نییە كەئارەزووی جەستەیی خەڵكی بەرەو سیستمی هاوسەرگیری نەبردووە، چونكە لەناو زۆرینەی هەرەزۆری گەلە خۆڕسكەكاندا تەنها كەمێكیان دەبینیت (ئەگەر ئەو كەمەش ببینیت) كۆتیان بەسەر پەیوەندییە سێكسییەكانی بەر لەهاوسەرگیری سەپاندبێت، لەبەرئەوەش كەهاوسەرگیری بەهەموو ئەو گێچەڵە دەروونییانەوە كەلێی دەكەوێتەوەو بەهەموو كۆتەكانییەوە مەحاڵە بتوانێ لەڕووی تێركردنی ئارەزووە سێكسییەكانی مرۆڤەوە، كێبەركێ لەگەڵ كۆمۆنەی سێكسیدا بكات، نەخێر، هەروەها سیستمی هاوسەرگیریی تاكگەری لەسەرەتاكانیدا بۆ ئەوە لەبار نییە كەشێك بۆ پەروەردەكردنی منداڵان بخوڵقێنێتو بەبێ ئەزموون پەی بەوە ببرێت كەباشتر بێت لەبایەخدانی دایكو خێزانو هۆزی دایك بەمنداڵ، كەواتە دەبێت پاڵنەری هاوسەرگیریو دواتر گەشەكردنی بریتی بێت لەفاكتەری ئابووری زۆر كاریگەر، بەلای زۆریشەوە (لێرەدا دەبێت جارێكی تر ئەوەمان بیر بكەوێتەوە كەئێمە شتێكی زۆر كەم لەبارەی سەرەتاكانی شتەكانەوە دەزانین) ئەو

فاکتەرانەی پاڵیان بەسیستمی هاوسەرگیرییەوە ناوە پەیوەندییان بەسەرهەڵدانی سیستمی موڵکدارییەوە هەبووە.

هاوسەرگیریی تاکگەری سەرەنجامی ئارەزووی پیاوە بۆ ئەوەی کۆیلەگەلێکی هەرزانبەها بۆ خۆی فەراهەم بکات، هەروەها ئارەزووی پیاو لەوەشدا کەموڵکەکەی بۆ کوڕانی پیاوانێکی تر بەجێ بهێڵێت، لەنێو جۆرەکانی هاوسەرگیریدا جۆرێك دەرکەوتووە کەتیایدا ڕێگە بەهاوەڵ دەدرا هاوەڵێکی زۆری هەبێت، ئەمە سەرێك لەشێوەی فرەمێردی یەك ژندا خۆی دەردەخات وەك ئەوەی لەناو هۆزی توداو چەند هۆزێکی تیبت-دا دەبینرێ، بەڵام ئەم خووە ئەو کاتە دەردەکەوێت کەژمارەی پیاوان زۆر لەژمارەی ژنان زیاتر دەبێتو هەر خێرا لەسەر دەستی پیاوی خاوەن هێزو باڵادەست دەرەوێتەوە، ئیدی لەدوو جۆری سیستمی فرەهاوەڵی تەنها بەیەك جۆری ئاشنا ماوین، ئەویش فرەژنی یەك پیاوە، پیاوە ئایینییەکانی چاخەکانی ناوەڕاست پێیان وابوو کەفرەژنی یەك پیاو سیستمێکە لەداهێنانی موحەمەدو کەس بەر لەو شتی وای نەکردووە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو سیستمە ساڵانێکی زۆر پێش ئیسلام هەبووە، چونکە ئەوە ئەو سیستمەیە کەلەجیهانی کۆندا باو بووەو هۆگەلێکی زۆر هەن ئەو سیستمەیان بڵاو کردۆتەوەو ساپاندوویانە، بەر لەهەمووشی ئەوەیە کەژیانی پیاوان لەکۆمەڵگەی سەرەتاییدا زۆر توندوتیژترو پڕ مەترسیتر بووە لەبەر ئەوەی بەڕاوو کوشتارەوە خەریك بوون، هەر بۆیە پیاوان لەژنان زیاتر دەمردن، بەردەوام زیادبوونی ژمارەی ژنانیش ژن دەخاتە بەردەم دوو ڕێگە: یان فرەژنی یەك پیاو، یان قەیرەیی‌و نەزۆکییەك کەبۆ هەندێك ژن تاکە ڕێگە بووە، بەڵام ئەم قەیرەییە لای ئەو گەلانە شتێکی پەسەند نییە کەڕێژەیەکی زۆری منداڵبوون دەخوازن، تا بەرامبەر ڕێژەی بەرزی مردن بێت، بۆیە گەلی لەو چەشنە ڕقی لەژنی قەیرەو ژنی نەزۆك دەبێتەوە،

هەر بۆیە گەلانی لەو چەشنە ژنی قەیرەو ژنی نەزۆك دەبوغزێنن، هۆکاری دووهەمیش ئەوەیە کەپیاوان حەزیان بەهەمەڕەنگییە، مەسەلەکە وەك نیگرۆکانی ئەنگۆلا دەڵێن ئەوەیە کە: "ناتوانن بەبەردەوامی یەك جۆر خواردن بخۆن"، هەروەك پیاوان حەز دەکەن ژنەهاوەڵەکانیان لەتەمەنی لاویدا بن، ئەمە لەکاتێکدا ژنان لەناو هۆزە سەرەتاییەکاندا زوو پیر دەبن، بگرە زۆر جار ژنان خۆیان حەز بەفرەژنی دەکەن، بۆ ئەوەی ماوەکانی منداڵبوون کەمێك دوور بخەنەوەو لەهەمان کاتیشدا شەهوەت و ئارەزووی وەچەخستنەوە لەلای پیاو کەم نەبێتەوە، هەندێك جاریش دەبینیت ژنی یەکەم، کەبەهۆی قورسی ئەرکەکانییەوە شەکەت بووە، پیاوەکەی هاندەدا تاژنی دووهەمی بهێنێت بۆ ئەوەی کارەکانی لەگەڵ بەش بکات و وەچەیەکیش بۆ خێزانەکە بخاتەوە کەبەرهەم و سامانی خێزانەکەیان پێ زۆرتر بێت، کوڕان لای ئەو جۆرە خەڵکانە دەستکەوتی نابوورین، پیاوانیش وەك سەرمایە کەڵك لەژنان وەردەگرن، ئەو منداڵانەیان پێ دەخەنەوە کەبەرامبەر سەرمایە دادەنرێن، لەخێزانی باوکسالاریدا تەنها کۆمەڵێك کۆیلەی سەرۆکی خێزانن کەبریتییە لەپیاو، پیاوەکەش چەندە ژنەکانی زۆرتر بن هێندەش سامانی زیاتر دەبێت، کەسانی هەژار یەك ژنیان دەهێنا، بەڵام وەك شتێکی شوورەیی سەیری ئەو حاڵەی خۆی دەکرد، هەر چاویشی لەو ڕۆژە دەبوو کەلەبەرچاوی خەڵکدا بگاتە پلەو پایەیەی کەسانی خاوەن ژنی زۆر هەیانە.

گومانیش لەوەدا نییە کەفرەژنی زۆر لەگەڵ پێداویستییەکانی کۆمەڵگای سەرەتاییدا گونجابوو، چونکە لەو کۆمەڵگایانەدا ژمارەی ژنان لەژمارەی پیاوان زۆرتر بووە، فرەژنی ڕۆڵێکی باشتریشی گێڕاوە لەچاککردنی وەچەدا وەك ئەوەی تاکژنییەکەی ئەمڕۆی ئێمە دەیگێڕێت، چونکە لەکاتێکدا دەبینین بەتواناترین و داناترین پیاوانی چاخی نوێ هەر ئەوانن لەکەسانی تر درەنگتر ژن دەهێنن، ئەوانیش کەکەمترین وەچە دەخەنەوە، پێچەوانەی ئەوە لەسایەی سیستمی

فرەژنیدا ڕوودەدات، کەئەو سیستمە وادەکات بەتواناترینی پیاوەکان -بەلای زۆرەوە- باشترین ژنیان دەست بکەوێتو زۆرترین وەچە بخەنەوە، بۆیە فرەژنی لەناو هەموو گەلە خۆڕسکەکانداو بگرە لەناو زۆربەی زۆری گروپەکانی مرۆڤی شارستێنیشدا زۆرترین ماوە هەڵدەکات، لەولاتانی ڕۆژهەلاتیشدا تەنها لەم سەردەمەی ئەمرۆماندا دەستی کردووە بەڕەوینەوە، لەبەرئەوەی چەند فاکتەرێك پێکەوە کار بۆ نەهێشتنی دەکەن، ئەوەتا ژیانی سەقامگیربووی کشتوکاڵ تاڕادەیەك توندوتیژیی ئەو ژیانەی نەهێشتوە کەپیاوان بەسەریان دەبردو مەترسییەکانی کەم کردۆتەوە، بەوەش ژمارەی دوو ڕەگەزەکە لێك نزیك بۆتەوە، لەم حاڵەتەشدا فرەژنی ئاشکرا، هەتا لەکۆمەلگا سەرەتاییەکاندا، بۆتە خەسلەتێکی کەمینەی دەولەمەند بەتەنها، خەلکە ڕەشۆکەکە لەژنێك تێی ناپەڕێنن، دواتریش بەزیناکردن ئەو بارە قورسەی سەر دەروونیان سووك دەکەن، لەکاتێکدا کەمینەیەکی تر هەن بەخواستی خۆیان بێت یان بەناچاری مانەوە بەسەلتی هەڵدەبژێرن، بەو ژن نەهێنانەش هاوکێشەکە بەرامبەر فرەژنی دەولەمەندەکان ڕێك دەکەنەوە، تا چەندەش ژمارەی دوو ڕەگەزەکە لێك نزیك بێتەوە غیرەکردنی پیاو لەژن زیاتر دەبێت، ژنیش زیاتر دەست بەپیاوەکەیەوە دەگرێت، چونکە کەژمارەکە تاڕادەیەك یەکسان بوو بۆ هەردوو ڕەگەزەکە ئەوە پیاوە بەهێزەکان ناتوانن بەئاسانی ژنی زیاتر بهێنن، لەبەرئەوەی لەم حاڵەتەدا ئەوەندە ژنیان دەست ناکەوێت مەگەر دەستدرێژی بکەنە سەر ژنی خەلکانی تر یان سەر ئەوانەی دەبنە ژنی خەلکانی تر، یان ئەگەر لەهەندێك حاڵەتدا خراپە لەگەڵ ژنەکانی خۆیاندا بکەن، جا دەڵێین لەحاڵەتێکی وەهادا فرەژنی دەبێتە کارێکی دژوارو تەنها پیاوە هەرە زۆرزانەکان دەرەقەتی دێن، دێینە سەر ئەوەی کەکاتێك سامان لەچنگی کۆمەڵێك پیاودا کەڵەکە دەبێتو ئەو پیاوانەش حەز بەوە ناکەن سەروەتەکەیان بەناو ژمارەیەکی زۆری منداڵدا پەرتەوازە بکەن کەهەر یەکێکیان تەنها بڕێکی کەمی بەربکەوێ، ئەوسا ئەو پیاوانە وەهایان پێ

باشتر دەبێت جیاوازی لەنێوان ژنەکانیاندا بکەن، "ژنێکی سەرەکیو کۆمەڵێك ژنی لاوەکی"، بۆ ئەوەی میراتەکەیان تەنها بەر کوڕانی ژنە سەرەکییەکە بکەوێت، هاوسەرگیری لەئاسیادا هەتا ئەو سەردەمەی ئەوەی ئێمە تیایدا ژیاوین هەر بەم شێوەیە ماوەتەوە، دواتر وردە وردە ئەو ژنە سەرەکییە بوو بەتاکەژن، ئەوانی تریش کەوتنە بەردەم دوو ئەگەر، یان بەدۆستی مانەوەو لەپشتی پەردەوە، یان بەیەکجاری وازیان لێ هێنرا، ئەمە بێجگە لەئایینی مەسیحی کەوەك فاکتەرێکی تر هاتە ئاراوەو لەئەورووپادا سیستمی تاکژنی لەبری فرەژنی کردە ئەو سیستمەی کەیاسا پەسەندی بکاتو ئەو شکڵەی کەپەیوەندیی سێکسی تیایدا قەراری گرت. بەڵام سیستمی تاکژنی وەك نووسینو وەك سیستمی دەوڵەت، سیستمێکی پیشەسازییە کاتێك دەرکەوتوە کەژیار لەقۆناغە ناوەڕاستەکانیدا بووەو بەو مانایە ئەو سیستمە سروشتییە نییە کە بەسترابێتەوە بەژیاروە لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە.

ئەو شکڵەی هاوسەرگیری هەیبووە هەرچۆنێك بوبێت ئەو هاوسەرگیرییە تاڕادەیەکی زۆر لەناو هەموو گەلە سەرەتاییەکاندا پرۆسەیەکی ناچاری بووە، پیاوی سەڵت هیچ پلەوپایەیەکی لەنێو کۆمەڵگەدا نەبوو، یان تەنها بەنیوەپیاوێك دانراوە، هەروەك پیاو ناچار بووە ژن لەناو تیرەکەی خۆی نەهێنێت، ئەوەش نازانین ئاخۆ ئەم خوە لەوەوە هاتوە کەئەقڵی سەرەتایی گومانێکی لەلا دروست بوبێت سەبارەت بەئاکامە خراپەکانی هاوسەرگیری لەگەڵ خزمدا، یان لەوەوە کەژنو ژنخوازی لەنێوان گروپەکاندا هاوپەیمانیی سیاسیی بەکەڵکی لێ کەوتبێتەوە لەنێوان ئەو گروپانەدا، یان هاوپەیمانییەکەیانی بەهێزتر کردبێت ئەگەر لەبنەڕەتدا هەبوبێت، بەمەش ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی زیاتر پێشکەوتوەو مەترسیی جەنگی کەمتر بۆتەوە، یان ئەو خوە گەڕاوەتەوە بۆ ئەوەی زەوتکردنی ژنی سەر بەهۆزێکی تر لەناو خەڵکدا بەنیشانەیەکی پیاوەتییەکی کامڵبوو دانراوە، یان بۆ ئەوەی گەورەبوونی منداڵ لەناو خزمە

ژنەکانیدا بەهای کەمتر کردبێتەوە لای ئەو خزمانەی، هەروەك دووریی خزمە ژنەکانی لێیەوە زیاتر نزیکیان دەخاتەوە لەدڵییەوە، بەهەرحاڵ، ئەم دیاریکردنە بەشێوەیەکی گشتیو سەرتاپایی‌و تاڕادەیەکی زۆر لەناو هەموو هۆزە سەرەتاییەکاندا بەدەستی ژن بووە، ئەگەرچی فیرعەونییەکان‌و بەتلیسییەکان‌و ئینکاییەکانیش ئەم خووەیان لەناو داوکەوتنە هاوسەرگیریی نێوان خوشك‌و برا، بەڵام خووەکە لەناو ڕۆمانەکاندا مایەوەو یاسای نوێ دانی پێدانا، ئەم دابە تائێستاش، ئەگەر بەهەستکردنەوە بێت یان لەنەستەوە، کاریگەریی بەسەر ڕەفتارەکانمانەوە هەیە.

جا چۆن ڕێگە دراوە بەپیاو کەژنێکی سەر بەهۆزێکی تر زەوت بکات؟ ئەو کاتەی خێزانی دایکسالاری سیستمی باو بوو لەزۆربەی حاڵەتدا داوا لەمێرد دەکرا لەگەڵ هۆزی ئەو ژنەدا بژی کەویستوویەتی بیکاتە هاوسەری خۆی، کەسیستمی باوکسالاریش گەشەی کرد مافی ئەوە بە خوازبێنیکەر درا کە بووکەکەی لەگەڵ خۆی بەرێتە ناو هۆزی خۆی، بەمەرجێك تا ماوەیەکی دیاریکراو لەخزمەتی باوکی بووکەکەدا بێت، بۆ نموونە یاکوب خزمەتی دوو باوکی کرد لەپێناوی خواستنی لیحەو راشیل، بەڵام هەندێك جاری تریش خوازبێنیکەرەکە لەڕێی بەکارهێنانی هێزێکی ستەمکارانەوە مەسەلەکەی یەکلایی دەکردەوە، یەکێکیش لەخەسڵەت‌و پیاوچاکییەکانی پیاو ئەوە بوو کەژنەکەی بەزۆر لەکەسوکارەکەی زەوت کردبێت، چونکە ئەوە لەلایەکەوە ئەو ژنەی دەکردە ئەممەیەکی (ئەو ژنە کۆیلەیەی تەنها بۆ کاری سێکسی بەکار دەهێنرا) بێنرخ‌و لەلایەکی تریشەوە کۆیلەی تری پێ دەخستەوە، کەئەو منداڵە کۆیلانەشی بۆ پیاوەکەی دەخستەوە کۆیلایەتییەکەی خۆیشی توندوتۆڵتر دەبۆوە، ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەی لەڕێی ئەتککردنەوە ڕوویدەدا رشێسایەکی سەرتاپاگیر نەبووە، بەڵام لەجیهانی سەرەتاییدا ناوە ناوە ڕوویدەدا، ژنانی هیندییەکانی ئەمریکای باکوور بەشێك بوون لەتاڵانییەکانی جەنگ، ئەم بەدیلی بردنەی ژنان هێندە باو بوو

کەدەبینیت لەناو هەندێك هۆزیاندا زمانی قسەکردنی ژنانو پیاوان جیایە، نەمێرد لەزمانی ژنەکەی دەگاتو نەژن لەزمانی مێردەکەی، سلاڤەکانی ڕوسیاو سربیا هەتا سەدەی پێشووش کاریان بەهاوسەرگرتنی زۆرەملێ دەکرد، شوێنەواری ئەو خوە کۆنە هەتا ئێستاش لەوەدا خۆی دەنوێنێت کەهەندێك جار لەناهەنگی هاوسەرگیریدا زاوا ڕۆڵی ئەتککاری بووکەکەی دەبینێت، بەهەر حاڵیش ئەوە سەرەنجامێکی سروشتی ئەو شەڕوشۆڕانەی نێوان هۆزەکان بووە کەخەریکە ڕاوەستانی تێ نەکەوێت، هەروەها سەرەتایەکی سروشتیی ئەو شەڕەشە کەکەوتۆتە نێوان دوو رەگەزەکەوەو تەنها ماوە ماوەیەکی زۆر کەم بەئاگربەست ڕادەوەستێتو خەوێکی پڕ لەدڵەڕاوکێی بێ خەوبینینیش نەبێت هەرگیز ناخەوێت.

کەسەروەت زیادی کرد، خوازبێنیکەر ئاسانتر توانی دیارییەکی بەنرخ یان بڕێك پارە بداتە باوکی بووك وەك نرخی کچەکەی، ئەوە لەبری ئەوەی خزمەتی تیرەیەك بکات کەهی خۆی نییە لەپێناوی بەدەستهێنانی ئەو کچەدا، یان خۆی بخاتە بەر مەترسیی ئاکامەکانی دەستدرێژی کردنە سەر کچەکە کەڕەنگە کوشتارو خوێنڕشتنی لێ بکەوێتەوە، سەرەنجامیش هاوسەرگیری بەکڕین لەژێر چاودێریی هەردوو باوکدا بوو بەڕێسای باوی کۆمەڵگا سەرەتاییەکانو لەو نێوەشدا چەند ئەڵقەیەکی ناوەندگێڕ هەبوون کەگواستنەوەکە لەو قۆناغ بۆ ئەم قۆناغ پیایاندا گوزەریان کردووە، خەڵکی مالینیزیا ژنەکانیان بەڕفاندن دەڕفاند، بەڵام دواتر دەگەڕانەوەو دزییەکەیان دەکردە دزییەکی یاسایی، بەوەی بڕێك پارەیان دەدا بەکەسوکاری ژنەکە، لای هەندێکیش لەخەڵکی نیوگانا کوڕ کچی دەڕفاندو ئەو کاتەی خۆیان لەحەشارگە توند دەکرد لەملاوە برادەرەکانی دەناردە لای باوکی کچەکە بۆ سەوداو مامەڵە لەسەر نرخەکەی. بۆ ئەوەی ڕێگەی بیرکردنەوەمان ڕۆشنتر بکەین بائەوەمان بیر بکەوێتەوە چۆن دەکرێ بەڕەنگاریکردنی خەڵکانێك بۆ بارێکی ئەخلاقی دیاریکراو ببەزێندرێ، چیرۆکی

دایکێکی هۆزی ماوری دەگێڕینەوە کە "بەدەنگی بەرز گریاوەو ئەو لاوەی داوەتە بەر نەفرەت کەکچەکەی ڕفاندوە، هەتا ئەوەی لاوەکە بەدیارییەکەوە هاتۆتەلای، دیارییەکەش بەتانییەکی خوری بووە، ئەوسا ژنەکە دەڵێت: تەنها ئەمەم دەویست، دەمویست ئەم بەتانییە خورییەم دەست بکەوێت‌و بۆ ئەوە دەستم بەگریان کردووە"، بەڵام نرخی بووك هەمیشە لەجاجمێکی خوری بەرزتر بووە، لای هۆتنتۆت بریتی بووە لەگا یان مانگایەك، لای هۆزی کرۆ سێ مانگاو بەرانێك بووە، لای کەفیر بریتی بووە لەشەش هەتا سی مانگا، ئەویش بەگوێرەی پلەوپایەی خێزانی کچەکە لەناو کۆمەڵگا گۆڕاوە، لای تۆگۆ ١٦ ریاڵی کاش پارەو بایی شەش ریاڵ شمەك بووە.

هاوسەرگیریی بەکڕین لەهەموو ناوچەکانی ئەفەریقادا باوە، هەروەك سیستمی باوی چین‌و ژاپۆنیشە، لەهیندی کۆن‌و لەنێو جوولەکە کۆنەکانیشدا هەر باو بووە، لەسەردەمی کۆلۆمبس-یشدا لەئەمریکای ناوەڕاستدا باو بووە، لەپیرۆ-ش، بەڵکو لەئەوروپای ئەم ڕۆژگارەشدا نموونەی دەبینین، ئەمەش گەشەکردنێکی سروشتیی خێزانی باوکسالارییە، چونکە باوك خاوەنی کچی خۆیەتی، بۆی هەیە چۆن بەشیاوی بزانێت ئاوا هەڵیسووڕێنێت، تەنها سنوورێکی کەمیش هەیە ئەم مافەی سنوردار بکات، هیندییەکانی ئۆرنۆکۆ بەقسەیەك گوزارشت لەم حاڵەتە دەکەن دەڵێن دەبێت خوازبێنیکار شتێك بدات بەباوکە وەك نرخی پەروەردەکردنی ئەو کچەی سوودی لێ دەبینێت، هەندێك جاریش ڕوودەدا کەکچ لەپیشانگای بووکانداو لەبەردەم کۆمەڵێك پیاودا نمایش بکرێت کەرەنگە یەکێکیان ببێتە دەزگیرانی، هەروەها دابی خەڵکی سۆماڵ وەها بووە کەبەجوانترین شێوە ئارایشتی بووکەکە بکەن، دواتریش لەسەر پشتی ئەسپێك نمایشی بکەن یان بەپێی خۆی بڕوات، ئەو نمایشە لەکەشێکی پڕ لەبۆن‌و بەرامەدا بەڕێوە دەچێت بەو هیوایەی خوازبێنیکاران بوروووژێن‌و یەکێکیان پارەیەکی زیاتر بدات، هیچ شتێکی نوسراویشمان لەبەردەستدا نییە سەبارەت

بەوەی تەنها ژنێکیش دژی بەشوودانی ڕاوەستابێت بەپارە، بگرە بەپێچەوانەی ئەوەوە، ژنان شانازییان بەو پارەیەوە کردووە کەلەنرخیاندا دراوە، ئەو ژنەشیان بوغزاندوە کەبەبێ هیچ نرخێك خۆی داوە بەدەستەوە، چونکە ئەو ژنانە پێیان وایە کەهاوسەرگیرییەك کە بەخۆشەویستی ببەسترێتەوەو نرخێکی تێدا نەدرابێت، مێردی خراپەکار تیایدا دەستکەوتێکی مەزن دەباتەوە بەبێ ئەوەی نرخەکەی دابێت، بەسەرێکی تر وەها باو بوو باوکی بووکێ لەبەرامبەر ئەوەی زاوا دەیدایە ئەمیش دیارییەك بدات کە ڕۆژ بەڕۆژ نرخی ئەو دیارییە بەرزتر بۆوە تا نزیکی بەخششەکەی زاوا خۆی بۆوە، پاشان باوکە دەوڵەمەندەکان ئەم دیارییانەیان زیاتر کرد بۆ ئەوەی شووکردنی کچەکانیان ئاسانتر بکەن، تا وای لێهات سیستمی ئەو مارەییە داهات کەبووك دەیدا بەخوازبێنیکارەکەی، بەمەش کڕینی زاوا لەلایەن باوکی کچەوە جێگەی کڕینی بووکی گرتەوە لەلایەن زاواوە، یان تۆ بڵێ هەردوو جۆرەکەی کڕین شانبەشانی یەکتری دەڕۆیشتن.

لەهەموو ئەم شکڵو جۆرانەدا کەهاوسەرگیری بەخۆیەوە بینیوە، شتێکی ئەوتۆ لەخۆشەویستیو سۆز بەدی ناکرێت، بەڵێ چەند حاڵەتێکی کەم لەهاوسەرگیریی خۆشەویستی لەناو هۆزی بابوادا هەیە لەنیوگینیا، هەروەك هەندێك حاڵەتی تری خۆشەویستی لەناو گەلە سەرەتاییەکانی تردا هەبووە، خۆشەویستیش لێرەدا بەواتای بەئەمەکییەکی دووسەرە لەبری سوودێکی دووسەرە، بەڵام ئەم حاڵەتە دەگمەنانەی لەو بارەیەوە دەبینرێن پەیوەندییان بەپرۆسەی هاوسەرگیرییەوە نییە، چونکە لەڕۆژگاری سادەی کۆندا پیاوان بۆ ئەوە ژنیان دەهێنا بۆ ئەوەی کارێکی هەرزانو باوکایەتییەکی قازانجدار بکرنو ژەمە خۆراکی ڕێکوپێك مسۆگەر بکەن، لاندەر دەڵێت: "خەڵکی یاریبا بەبێ کەمترین بایەخدان ئاهەنگی هاوسەرگیری دەگێڕن، چونکە بیرکردنەوەی پیاو لەوەی ژنێکی هەبێت لەو بیرکردنەوەیەی زۆرتر نییە کەبیر لەلێکردنەوەی گوڵەگەنمێك بکات، چونکە خۆشەویستی هیچ بوونێکی نییە، لەبەرئەوەی ئەگەر

پەیوەندیی سێکسی بەر لەهاوسەرگیری کراوە بێت، ئەوە سۆزی پیاو بەربەستێکی نابێت هەتا مۆڵ بخوات لەپشتییەوە، زۆر بەکەمیش کاریگەریی بەسەر هاوسەرگیرییەوە دەبێت، لەبەر هەمان هۆکاریش، مەبەستم ڕشتنی شەهوەتو دەرکردنی بێ ئەوەی کاتی ڕاوەستانی تێ بکەوێت، پاساوێك نامێنێتەوە بۆ ئەوەی لاو دابنیشێتو لەدڵی خۆیدا بیر لەسۆزێك بکاتەوە کەلەسنگیدا پەنگی خواردبێتەوەو، بەهۆی پەنگ خواردنەوەکەش خۆشەویستەکەی لەلا جوانترو جوانتر ببێت، کەئەمەیە دەبێتە خۆشەویستیی سۆزدارانە لەلای لاو، خۆشەویستی لەم چەشنەو دەرکەوتنی بەژیارەوە بەستراوەتەوە، ئەو ژیارەی سنوورێکی لەبەردەم شەهوەتدا داناوە، ئەمەو سامانو زیاتربوونی سامان توانای ئەوەیدا بەهەندێك پیاو کەپارە لەو پێناوەدا خەرج بکەنو بەهەندێ ژنیش کەبۆ خۆشەویستی پێویستە لەنیشانەی ڕابواردنو ناسکی لەخۆیاندا دروستیان بکەن، خەڵکە سەرەتاییەکان لەوە هەژارتر بوون کەسۆزی خۆشەویستی بزانن، بۆیە زۆر بەکەمی لەگۆرانییەکانیاندا هۆنراوەیەکت بەر گوێ دەکەوێت باسی خۆشەویستی بکات، کەمژدەبەشخە مەسیحییەکان ئینجیلیان وەرگێڕایە سەر زمانی هۆزی جۆنکۆن، ئەوان وشەیەکیان لەزمانەکەی خۆیاندا نەدۆزییەوە کەبەرامبەرخۆشەویستی بێت، خەڵکانێك وەها وەسفی هۆزی هۆتنتۆت دەکەن کە "ساردن لەژیانی هاوسەریداو هیچ کام لەدوو هاوسەرەکە گوێ بەوی تر نادات"، بەهەمان شێوە لەکەناری زێڕ "هیچ نیشانەیەکی خۆشەویستی لەنێوان ژنو مێرددا بەنیشانە دەرەکییەکانیشەوە بوونی نییە"، هەمان شت لەبارەی خەڵکە سەرەتاییەکەی ئوسترالیاوە دەشێت بگوترێ، گایلێ لەباسی نیگرۆیەکی خەڵکی سەنیگالدا دەڵێت: "لەپیاوێکم پرسی بۆ جارجارە گەمە لەگەڵ ژنەکانیدا ناکات گوتی ئەگەر شتی وا بکات ئیدی جڵەویانی بۆ ناگیرێت"، کەلە زەلامێکی خەڵکی ڕەسەنی ئوسترالیاش پرسیاریان کرد بۆچی ویستوویەتی ژن بهێنێت، لەوەڵامدا بەڕاستگۆییەوە گوتوویەتی بۆئەوە داوای ژنی کردووە هەتا ژنەکەی خۆراكو

خواردنەوەو داری سووتاندنی بۆ ئامادە بکات، هەروەها بۆ ئەوەی لەکاتی کۆچو باردا شمەکەکانی بۆ هەڵگرێت، ئەو ماچەش کەئەمریکاییەکان وەك دەردەکەوێت ناتوانن وازی لێ بهێنن، گەلە سەرەتاییەکان پێی ئاشنا نین یان دەیزانن بەڵام وەك شتێکی قێزەون.

بەگشتی، دەڵێین (هەمەجی) بەگیانێکی فەلسەفییەوە کاروباری سێکسی خۆی مومارەسە دەکات کەهێندە لەهی ئاژەڵ بالاتر نییە لەڕووی ئەو نیگەرانییە میتافیزیکی یان ئاینییەی دایدەگرێت، ئەو لەگەڵ خۆیدا بیر لەمەسەلەکە ناکاتەوە، نەخێر، لەئاسمانی سۆزی خۆشیدا نافڕێت، بەڵکو سێکس بەلای ئەوەوە وەك خواردن کارێکی سروشتییە، هەرگیز هەوڵی ئەوەش نادات فاکتەرەکان لەلای خۆیەوە جوان بکات، هاوسەرگیری بەلایەوە هیچ پیرۆزییەکی نییە، زۆر بەکەمیش ئاهەنگی زۆری بۆ دەگێڕێت، بەڵکو بەلایەوە هاوسەرگیری کردەیەکی بازرگانیی ڕاشکاوە، هەرگیز ئەوەشی بەبیردا نەهاتوە کەئەوە جێگەی شەرم بێت سۆزەکانی ملکەچی ئیعتباراتی عەمەلی بکات لەکاتی هەڵبژاردنی هاوسەرەکەیدا، بەڵکو پێچەوانەی ئەوە مایەی شەرم بووە لەلای، ئەگەر ڕێگەی ئەو لەخۆباییبوونەشی بەخۆی بدایە کەئێمە دەیدەینە خۆمان، ئەو کاتە ئەو لەئێمەی دەپرسیو دەیگوت: چ پاساوێکتان بۆ ئەو نەریتە هەیە کەژنو پیاوێك بەدرێژایی هەموو تەمەنیان پێکەوە ببەستنەوە تەنها لەبەر ئارەزوویەکی سێکسی کورتخایەن کەبەخێرایی بروسکەیەك لەنێوانیاندا بووە، هاوسەرگیری لای پیاوی سەرەتایی وەك بناغەیەك بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی سێکسی سەیر ناکرێت، بەڵکو هاوکارییەکی ئابوورییە، هەر بۆیە داوای ئەوەی لەژن دەکرد، بەڵکو ژن داوای ئەوەی لەخۆی دەکرد کەبەکەڵكو چوستو چالاك بێت نەك بالاڕێكو جوان "ئەگەرچی حسابی بۆ ئەو سیفەتانەشی دەکرد"، چونکە دەبوو دەستکەوتێکی ئابووری بێت بۆی، نەك زەرەرێك کەهیچ قازانجێکی تێدا نەبێت، ئەگینا هەمەجییەکی واقیعبین هەرگیز بیری لەهاوسەرگرتن نەدەکردەوە،

هاوسەرگیری بەلای ئەوەوە کۆمپانیایەکە قازانجی لێ دەگرێت، نەک جۆرێک لەسۆزانێتیی تایبەت بەخۆی، شێوازێک بووە وای لەپیاوو ژن کردووە ئەگەر پێکەوە کار بکەن سەرکەوتنی باشتر لەژیانیاندا بەدەست بهێنن لەوەی هەریەکەیان بەجیا لەهاوەڵەکەی کار بکات، جا لەهەر کوێیەکی مێژووی ژیارتیدا قۆناغێکت بەرچاو کەوت تیایدا ژن دەستکەوتێکی ئابووری نەبوو بۆ پیاو ئەوە بزانە بونیادی هاوسەرگیری هەرەسی هێناوەو هەندێک جاریش هەرەسی ئەو هەرەسی ژیارە.

## بابەتی دووهەم

## ئیتیکی سێکس

**پەیوەندییەکانی بەر لەهاوسەرگیری – سۆزانێتی – پاکی – کچێنی – پێوەری دووفاقە – شاردنەوەی ئەندامەکان – ڕێژەیی لەئیتیکدا – ئەو ڕۆڵەی شاردنەوەی ئەندامەکان دەیگێڕێ لەڕووی بایۆلۆژییەوە – زینا – جودابوونەوە – لەباربردنی منداڵ – زیندەبەچاڵکردنی منداڵ – منداڵی تاک**

گرنگترین ئەرکی ئیتیک هەمیشە ڕێکخستنی پەیوەندیی سێکسییە، چونکە غەریزەی زاووزێ بەر لەهاوسەرگیریو پاش هاوسەرگیریو لەکاتی هاوسەریدا گرفت دەنێتەوە، هەموو چرکەیەکیش هەڕەشەی نانەوەی پشێوی لەسیستمی کۆمەڵایەتی دەکات لەبەر پێداگیریو توندیو ڤینی لەیاساو لادانی لەڕێگەی سروشت، یەکەمین گرفتیشی بەر لەهاوسەرگیری دەست پێدەکاتو بریتییە لەوەی: پەیوەندییە سێکسییەکان لەقاڵب بدرێن یان سەربەست بن؟ ژیانی سێکسی لەلای ئاژەڵانیش بەبێ کۆتو بەند نیە بەتەواوی، چونکە ڕێگەنەدان

بەنێرینە لەلایەن مێینەوە تەنها لەماوەی وڕووژاندا نەبێت وەها دەکات ژیانی سێکسی ئاژەڵ لەبازنەیەکی زۆر تەسکدا گیر بخوات لەوەی لەناو مرۆڤدا هەیە، ئەو مرۆڤەی شەهوەتێکی لەڕادەبەدەری هەیە، مرۆڤ وەك بیومارشێ دەڵێ بەوە لەئاژەڵ جیادەکرێتەوە کەبرسیشی نەبێت دەخوات و تینووشی نەبێت دەخواتەوەو لەهەموو وەرزەکانی ساڵدا پەیوەندیی بەرەگەزی بەرامبەرییەوە دەکات، لەنێو گەلە سەرەتاییەکاندا کۆت و بەندی وەك ئەوەی ئاژەڵان یان پێچەوانەی ئەوان دەبینیت، وەك حەرامکردنی پەیوەندیکردن بەژنانەوە لەکاتی حەیزیاندا، ئەگەر ئەم کۆتە گشتییە واز لێ بهێنین ئەوە دەبینین پەیوەندیی سێکسی بەر لەهاوسەرگیری لەناو گروپە سەرەتاییە زۆر کۆنەکاندا تاڕادەیەکی زۆر ئازادە، لەلای هیندییەکانی ئەمریکای باکووردا لاوانی کوڕو کچ پەیوەندیی ئازاد دەبەستن بەبێ ئەوەی ئەوە هیچ کۆسپێك لەبەردەم پرۆسەی هاوسەرگیریدا دروست بکات، هۆزی بابواش لەنیوگینیا بەهەمان شێوەو ژیانی سێکسییان لەتەمەنێکی زۆر زووەوە دەست پێدەکات، یاسای بەر لەسیستمی هاوسەری بریتی بوو لەکۆمۆنەی سێکسی، هەمان ئازادیی بەر لەهاوسەرگیری لەلای هۆزی سۆیۆت لەسیبیریاو لای هۆزی ئیگۆرۆت لەفلیپین و لای خەڵکی بۆرمای سەروو و کەفیرو بوشمەن لەئەفەریقاو هۆزەکانی نایجیریاو یۆگەنداو نیوجۆرجیاو دورگەکانی مەری و دورگەکانی ئیندمان و تاهیتی و پۆلینیزیاو ئەسام و جێگەی تریش هەیە.

لەبارودۆخی لەم چەشنەدا چاوەڕێی ئەوە ناکرێت کاری سۆزانێتیی لەکۆمەڵگای سەرەتاییدا بەڕادەیەکی زۆر ببینین، ئەم پیشەیە کە(کۆنترین پیشەیە) تاڕادەیەك بەنوێ دادەنرێت و تەنها لەگەڵ ژیارتیداو لەگەڵ دەرکەوتنی موڵکداری و نەمانی ئازادیی سێکسی بەر لەهاوسەرگیری سەری هەڵداوە، بەڵێ لێرەو لەوێ ڕەنگە کچانێك ببینین خۆیان بەشێوەیەکی کاتی بفرۆشن بەمەبەستی ئەوەی مارەیی خۆیان کۆبکەنەوە یان بۆ ئەوەی بڕێك پارەیان دەست بکەوێت پێشکەشی پەرستگای بکەن، بەلام ئەوە تەنها کاتێك دەبێت کەیاسای

ئیتیکیی هەرێمەکە رێگای پێ بدات، بەو پێیەی قوربانیدانێکی خوداپەرستانەیە بۆ یارمەتیدانی باوكودایكێكی كەمدەست یان بۆ تێرکردنی خوداگەلێکی برسی.

هەرچی پاکییە، ئەمیش هەر لەقۆناغێکی درەنگی رەوتی گەشەکردندا سەری هەڵداوە، ئەوەی پاکیزەییەکی سەرەتایی لێی دەترسا لەدەستدانی کچێنیی نەبوو، بەڵکو ئەوە بوو کەبەنەزۆك ناوی دەرچێ، ئەگەر ژن بەر لەشووکردنی سکپڕ بوایە ئەوە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا شووی دەست دەخست نەك ببێتە کۆسپ لەبەردەم شووکردنیدا، چونکە ئەو سکپڕییە هەموو گومانێکی لەبارەی نەزۆکییەوە دەبڕی، مژدەی منداڵگەلێکیشی پێوە دەبوو کەپارە بۆ باوکیان پەیدا بکەن، بگرە گروپە سەرەتاییەکانی بەر لەدەرکەوتنی موڵکداری بە رقەوە سەیری کچێنیی کیژیان دەکرد لەبەرئەوەی مانای وابوو کەئەو کچە پیاوان بەلای خۆیدا بەکێش ناکات، تەنانەت زاوا لای هۆزی کامشادال ئەگەر بووکەکەی بەپاکیزەیی ببینایە تووڕە دەبوو و دەکەوتە "جنێودانی ئاشکرا بەدایکی لەبەر ئەوەی کەمتەرخەمانە کچەکەی خۆی پێشکەش کردووە"، لەزۆر حاڵەتیشدا کچێنی دەبووە بەربەست لەبەردەم شووکردندا، چونکە ئەرکێکی دەخستە ئەستۆی مێردەکەوە کەزۆر لەبەر شانی گران دەبوو، ئەو ئەرکەش بریتی بوو لەسەرپێچیکردن لەفەرمانی ئەوەی خوێنی ئەندامێکی هۆزەکەی خۆی نەڕژێ، هەندێك جار روویدەدا کچان خۆیان تەسلیمی کەسێکی نامۆ لەدەرەوەی هۆزەکەی خۆیان بکەن هەتا ئەو بەربەستەیان بۆ لەناو بەرێت کەرێی شووکردنیان دەگرێت، لەتیبت دایکان بەجیددی بۆ پیاوانێك دەگەڕێن کچێنیی کچەکانیان هەڵگرن، لەملباریش کچان کاتێك بەخۆیان دەزانن لە رێبواران دەپاڕێنەوە ئەو چاکەیەیان لەگەڵ بکەن "چونکە هەتا بەکچی بمێننەوە شوویان دەست ناکەوێت"، لەناو هەندێك هۆزیشدا بووك ناچارە خۆی تەسلیم بەمیوانەکانی ئاهەنگی شووکردنەکەی بکات بەر لەوەی بچێتە لای زاوا، لای هەندێکی تریش زاوا پیاوێك بەکرێ دەگرێ بۆ کردنەوەی کچێنیی بووکەکەی، هۆزی تر لەفلیپین

هەن فەرمانبەری تایبەت هەن کەمووچەی زۆر وەردەگرن‌و ئەرکەکەشیان ئەوەیە لەبری ئەو پیاوانە ژن دەهێنن ئەو کارە دەکەن.

جا چ شتێك تێڕوانینی خەڵکی بەرامبەر کچێنی گۆڕیوەو بەشێوەیەك کردوویەتی بەچاکە دوای ئەوەی بەخراپە سەیر دەکرا؟ بەوەش کردییە توخمێك توخمەکانی هەموو یاسا ئیتیکییەکانی ژیارە باڵاکان؟ بێگومان موڵکداری ئەمەی کردووە، ئەو کاتەی سیستمی موڵکداری کەوتە ناو خەڵکەوە ئەو گۆڕانکارییە ڕوویدا، پاکیی سێکسی کچان بەر لەشووکردنیان درێژکراوەی هەستکردنی پیاوان بوو بەموڵکداری بەرامبەر بەژنەکانیان، دوای ئەوەی خێزان بوو بەباوکسالارییەك کەپیاو سەرۆکی بوو. بەهای کچێنیی زیاتری کرد چونکە بووك لەسایەی سیستمی هاوسەرگیریدا ئەگەر کچێنیی بمایە نرخێکی گرانتری دەکرد لەنرخی ئەو خوشکەی کەئیرادەی تووشی لاوازی هاتبوو، چونکە کچی پاکیزە، ڕابردووەکەی دەبووە مژدەی ئەمانەتی ژن‌ومێردایەتی، ئەو ئەمانەتەش لەوەودوا بووە بەهایەکی گەورە لای پیاوانێك خەمی ئەوە بێتاقەتی کردبوون کەسامانەکانیان بەمیرات بۆ کۆمەڵێك کوڕە بیزوو بەجێ بهێڵن.

هەرچی پیاوان خۆیانە ئەوە بەمێشکیاندا نەهاتوە ئەو کۆتە بۆ خۆیان دابنێن، لەسەرلەبەری مێژووشدا هیچ گروپێکت بەرچاو ناکەوێت کەپێی لەسەر پاکیی کوڕ داگرتبێت بەر لەژن هێنان، بگرە لەهیچ زمانێکی جیهاندا وشەیەك نادۆزیتەوە بەمانای پاکیزەیی پیاو بێت.

بەمەش تەنها لەچارەی کچاندا نووسرا کەلەکچێنییان بترسن، ئەم بارەش بەزۆر شێوە کارێگەریی بەسەریانەوە هەبوو. هۆزی توارج بەکوشتن سزای کچ یان خوشکیان دەدا ئەگەر لەرێی ڕاست لایدایە، نیگرۆکانی نوبەو حەبەشەو سۆماڵ‌و چەند شوێنی تریش ئەڵقە یان قفڵیان لەئەندامی زاووزێی کچان دەدات بۆ رێگرتن لەکردەی سێکسی، هەتا ڕۆژگاری ئەمرشۆش لەبۆرماو سیلان شتێکی لەو بابەتە هەیە، هەروەك چەندین جۆری دابڕکردنی کچان دەرکەوتن کەرێگەی

ئەوەیان پێ نەدرێ پیاوان بوروژێنن یان پیاوان ئەمان بورووژێنن، پیاوە دەوڵەمەندەکانی بەریتانیای نوێش کچەکانیان لەپێنج ساڵە هەستیارەکەی تەمەنیاندا لەکەپرگەلێکدا دەستبەسەر دەکەن‌و پیرێژنی جوانرەفتار دەکەنە ئێشکگر بەدیاریانەوە، ئەوسا بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی چوونە دەرەوەی کچەکە نادرێت‌و کەسیش بۆی نییە بچێتە لایان بێجگە لەکەسوکاری خۆیان، هەموو ئەم ڕەفتارانەو ئەو پەچەیەی ژنانی موسڵمان‌و هندۆس دەیانپۆشن تەنها هەنگاوێکیان لەنێویاندایەو ئەم ڕاستییەش جارێکی تر ئەوەمان بیردەخاتەوە کەماوەی نێوان ژیاری‌و هەمەجییەت زۆر کەمە.

شاردنەوەی ئەندامەکان لەگەڵ نەریتی پاکیزەیی‌و باوکسالاریدا سەری هەڵدا، تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش هۆزگەلێك هەن شەرم ناکەن لەوەی هەموو جەستەیان بەدەرەوە بێت، بگرە هەندێکیان پۆشاك پۆشینیان پێ شەرمە، کاتێك لیڤینگستۆن داوای لەخانەخوێ ڕەشپێستەکانی کرد شتێك لەسەر جەستەیان دابنێن پێش ئەوەی ژنەکەی بێتەژووری، ئەفەریقا هەمووی هاتە پێکەنین، شاژنی باڵۆندا-ش ئەو کاتەی ئەنجومەنی بۆ لیڤینکستۆن بەست لەتەوقی سەرییەوە هەتا نووکی پێی ڕووت‌و قووت بوو، لەنێو هۆزەکاندا کەمینەیەکیش هەن کەبەئاشکرا کاری سێکسی دەکەن‌و هیچ شەرمێك لەوە دایان ناگرێ، یەکەم دەرکەوتنی شەرم لای ژنان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی هەستی کرد لەڕۆژانی حەیزیدا حەرامکراوە، هەروەها بۆ ئەو کاتەی سیستمی هاوسەرگیری بەکڕین سەری هەڵدا، دواتر مانەوەی کچ بەکچی دەبووە مایەی سوود بۆ باوکی، بەوەش دابڕکردنی کچ‌و ناچارکردنی بەوەی کچێنی لەدەست نەدات بوو بەهۆی دروستبوونی هەستێك لای ئەو کچە کەدەبێت پاکیزەیی خۆی بپارێزێت، ئەوەش بڵێین کەشەرمی ژنی شووکردوو لەسایەی سیستمی هاوسەرگیری بەکڕین، هەستکردنی ئەو ژنەیە بەوەی لەڕووی داراییەوە سەر بەمێردەکەیەتی‌و بەوەش نابێت هیچ پەیوەندییەکی سێکسی دەرەکی وەهای هەبێت بەقازانج نەگەڕێتەوە

بۆ مێردەکەی، هەر لێرەوە پۆشاك داهات، چونکە پاڵنەرەکانی خۆجوانکردن‌و خۆپارێزی لەوەوپێش نەیان هێنابووە کایەوە، ئەوەتا لەناو هۆزگەلێکی زۆردا ژن تەنها دوای شووکردنی پۆشاك دەپۆشێت، وەك نیشانەیەکی ئەوەی بەتەواوی بۆتە موڵکێکی ئەو مێردەو وەك بەربەستێکیش لەبەردەم پیاوانی تردا هەتا شەهامەتی پیاوەتی نەیانگرێت، پیاوی سەرەتایی لەگەڵ بۆچوونەکەی دانەری کتێبی (دورگەی بەتریك)دا نییە کەدەڵێت پۆشاك هانی سوزانێتی دەدا، بەهەر حاڵ مەرج نییە پاکیزەیی بەسترابێتەوە بەپۆشاکەوە، گەڕیدەکانی ئەفەریقا هەمیشە باسی ئەوەمان بۆ دەکەن کەئیتیکی ئەوێ پەیوەندییەکی پێچەوانەی لەگەڵ بڕی پۆشینی پۆشاکدا هەیە، چونکە بەڕوونی دیارە کەئەو کارەی خەڵکێك شەرم دەکەن بیکەن پشت بەیاساغکردنی کۆمەڵایەتی‌و ئەو داب‌ونەریتانە دەبەستێت کەلەناو گروپەکەیاندا باوە، تا ماوەیەکی کەم بەر لەئێستا ژنی چینی پێی شەرم بوو قاچی ڕووت بکات، ژنی عەرەبیش پێی شەرم بوو ڕوخساری دەربکەوێت، ژنانی هۆزی تاورژ-یش پێیان شەرم بوو دەمیان ببینرێ، لەکاتێکدا ژنانی میسری کۆن‌و هەروەها هیندی سەدەی نۆزدەهەم‌و بالی-ی سەدەی بیستەم هەرگیز شەرمیان لەدەرخستنی مەمکیان نەدەکرد تا ئەو کاتەی گەشتیارە شەهوانییەکان ڕوویان تێکردن.

بەڵام دەبێت ئەم قسانە نەمانگەیەننە ئەوەی ئیتیك مادام لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی ترو لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەگۆڕێ ئیدی بەهایەکی نییە، ئەوپەڕی داناییش دەبێت ئەگەر ئاگاداریمان لەبارەی مێژووەوە بکەینە بەڵگەو پاساو بۆ تووڕدانی دەستبەجێی دابونەریتە ئیتیکیەکانی کۆمەڵگەکەمان، ئەو زانیارییە کەمەی هەیە لەبارەی ڕەگەزی مرۆییەوە دەمانخاتە مەترسییەوە. بەڵێ لەبنەڕەتەوە ئەوە ڕاستە کەوە ئەناتۆڵ فرانس دەڵێت "ئیتیك کۆی ئارەزووەکانی کۆمەڵگایە"، وەك ئاناچارسیس-ی گریکیش دەڵێت "ئەگەر هەموو ئەو داب‌و نەریتانە کۆبکەینەوە کەگروپێك پیرۆزیان کردوون‌و دوایی هەموو ئەوانەیان لێ

دەربکەین کەلای گروپێکی تر پیرۆزکراون ئەوە هیچمان بەدەستەوە نامێنێتەوە، بەلام ئەمە نابێتە بەلگەی ئەوەی ئیتیك بەهایەكی نەبێت، بەلکو دەبێتە بەلگەی ئەوەی سیستمی کۆمەلایەتی گەلێك رێگەی گرتۆتەبەر بۆ پاراستنی خۆی، بەلام جیاوازی ئەو رێگانە لەزەرووورەتی سیستمی کۆمەلایەتی داناشکێنێت. دەبێت رێساگەلێك هەبن خەلك لەگردبوونەوەیاندا رەچاویان بکەن، مەسەلەکە وەك ئەوەیە گردبوونەوەکە گەمەیەك بێتو یاریزانەکان ناچاربن رێساکانی گەمەکە رەچاو بکەن ئەگەر بیانەوێ تیایدا بەردەوام بن ، دەبێت خەلك بزانن هاوەلەکانیان لەبارودۆخە جیاوازەکانی ژیاندا چۆن رەفتار دەکەن، بۆیە خەلکانی یەك کۆمەلگا چەند ئیتیکێکی دیاریکراویان خولقاندوە بۆ رەفتاری خۆیان کەبایەخیان لەناوەرۆکی خودی ئەو ئیتیکە کەمتر نییە. ئەگەر بەیاخیبوونو لێ لادان بەرەورووی دابونەریتو ئیتیکی گروپەکەمان ببینەوە، ئەو کاتەی بەدلودەروونی گەنجانەوە دەگەینە ئەوەی ئەو دابونەریتو ئیتیکانە رێژەیین، ئەوە سادەیی ئەقلی خۆمان دەردەخەین، ئەگەر دە سالێکی تری تەمەن دەرفەت بدەینە خۆمان ئەوسا بۆمان دەردەکەوێت ئەو یاسا ئیتیکییانەی گروپ پەسەندیان کردوون –کەپوختەی ئەزموونی نەوە بەرودواکانن- ئەوەندە داناییان تێدایە زۆر زیاتر لەوەی مامۆستایەك بتوانێت لەهەموو موحازەرەکانی زانکۆیدا بۆ خوێندکارەکانی باس بکات، زوو بێت یان درەنگ هۆکاری نیگەرانی خۆشمان بۆ روون دەبێتەوە، کەبریتییە لەوەی: تەنانەت ئەو شتەش کەلێی حالی نابین رەنگە دروست بێت. ئەو سیستەمو رێکەوتنو دابونەریتو یاسایانەی پایە فرەلایەنەکانی کۆمەلگە پێکدەهێنن، لەراستیدا دروستکراوی سەدان نەوەو بلیۆنەها ئەقلن، ناشکرێت تەنها ئەقلێك لەماوەی ژیانێکی کورتدا، جا نەخوازەلا لەماوەی بیست سالدا، وابزانێت دەتوانێت لەهەمووی تێ بگات، کەواتە دەتوانین قسەکەمان بەوە کۆتایی پێ بهێنین بلێین ئیتیك شتێکی رێژەییە، بەلام پێویستییەکە ناتوانین دەستبەرداری ببین.

جا ئەگەر دابونەریتە کۆنە بنەڕەتییەکان هەڵبژاردنی سروشتی بەرجەستە بکەن لەشێوازەکانی ژیانی کۆمەڵگادا، پاش چەندین سەدە کەمرۆڤ لەهەوڵدان‌و هەڵەکردندا بەسەری بردن، ئەوە دەبێت ئەگەری ئەوە دابنێین کەمانەوەی کچێنی‌و شەرم ئەگەرچی دوو بەهای ڕێژەیین بەڵام هەندێك کەڵکی کۆمەڵایەتیان هەبووە، یان کەمێك بەهایان هەبووە لەیارمەتیدانی توخمەکە لەمانەوەیدا، هەردووکیشیان بەسیستمی هاوسەرگیری بەکڕین‌ەوە پەیوەستن، هەروەك هەردووکیان هۆکاری نەخۆشییەکانی دەمارن. شەرم‌و پۆشینی ئەندام وەك ئەو کەمینە وەهان کەلەگۆڕەپانی جەنگدا هەیە، کچ کەخوازبێنیکاری هاتوون خۆی داوەتە پاڵ ئەو کەمینەو لەوێوە باشترینی خوازبێنیکارەکانی هەڵبژاردوە، هەڵبژاردنێکی لەسەرخۆ، یان بۆ ئەوەی خوازبێنیکارەکە ناچار بکات کەمێك لەخەسڵەتەکانی خۆی جوان بکات بەر لەوەی ئەمی چنگ بکەوێت، بەڵام هەر ئەو بەربەستانەش کەئەندام پۆشینی ژنان لەڕووی شەهوەتی پیاواندا دروستیانکرد، هەر ئەوانە بوونە هۆی لەدایکبوونی سۆزی خۆشەویستیی شاعیرانە کەبەهای پۆشاکەکەی لەبەرچاوی پیاودا بەنرختر کرد، داهێنانی ئەو سیستمەش کەبایەخی بەپاکیزەیی دەدا بووە هۆی دارمانی ئەو ئاسانی‌و سادەییە خۆڕسکەی ژیانی سێکسی سەرەتایی پێی جیادەکرایەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە، بەهۆی ئەوەی بوو بەڕێگر لەبەردەم گەشەی سێکسی لەتەمەنە بچووکەکانداو گەشەی دایکایەتی بەر لەوادەی خۆی، بۆیە کەلێنی نێوان کامڵبوونی ئابووری‌و کامڵبوونیی سێکسی بەرتەسکتر کردەوە –ئەگەرچی ئەم کەلێنە پێ بەپێی گەشەی ژیار ئارەزووی فراوانبوون دەکات، ڕەنگیشە سیستمی پاکیزەیی لەڕێی ئەو دواخستنەی ژیانی سێکسییەوە یارمەتی بەهێزبوونی تاکی دابێت لەجەستەو ژیریداو لەدرێژکردنەوەی ماوەی هەرزەکاری‌و مەشقداو بەوەش ئاکامەکەی بەرزکردنەوەی ئاستی ڕەگەزی مرۆیی لێ کەوتبێتەوە.

کەموڵکداری گەشەی کرد، زیناکردن بەرە بەرە پلەی بەرز بۆوەو بوو بەیەکێك لەگوناهە گەورەکان، پاش ئەوەی پێشتر بەگوناهی بچووك دادەنرا. نیوەی ئەو گەلە سەرەتاییانەی ئێمە دەیانناسین بایەخێکی ئەوتۆ بەزیناکردن نادەن، بەمە سەرهەڵدانی موڵکداری تەنها نەبووە هۆکاری ئەوەی داوا لەژن بکرێت بەئەمەك بێت بەرامبەر مێردەکەی، بەڵکو هەستێکی خاوەن موڵکیشی لەپیاودا دروست کرد بەرامبەر ژنەکەی، تەنانەت لەو کاتەشدا کەبۆ ماوەیەك دەیبەخشییە میوانەکەی، ئەوە لەو ڕوانگەیەوە بوو کەبەجەستەو بەڕۆح هەر بەموڵکی خۆی دەزانی، دواتریش ئەم تێڕوانینە دەرهەق بەژن بەوە گەیشت کەناچاریان دەکرد لەگەڵ هەموو کەرەستەکانی مێردەکەیدا بچێتە گۆڕەکەیەوە، زیناکردنیش لەخێزانی باوکسالاریدا بەرامبەر دزی دانرا وەك ئەوەی لەبنەڕەتدا دەستدرێژیکردن بێت بۆ سەر موڵکی کەسێکی تر، سزای زیناکردنیش لەسووکترین سزاوە هەتا قورسترین سزا ناستی جیاجیای بەخۆیەوە بینیوە، لەگوێ پێنەدانی هۆزە سەرەتاییەکانەوە تادەگاتە ورگ هەڵدڕین و دەرهێنانی ریخۆڵەکان وەك هۆزە هیندییەکانی کالیفۆرنیا دەیانکرد. پاش ئەوەش کەتاوانەکە چەندین سەدەی سزادانی بەسەردا ڕەتبوو، لەنێو دەروونی خەڵکدا ئیدی چاکەی بەئەمەکیی ژن بەرامبەر مێرد قەراری گرت و بوو بەمەسەلەیەکی ویژدانیی لەبەرچاوگیراو لەهەناوی ژناندا، تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لە هۆزە هیندییەکان ببوونە مایەی سەرسوڕمانی لەشکرکێشەکانیان بەو بەئەمەکییەی ژنەکانیان هەیانبوو، کە مەحاڵبوو لەدەستی بدەن، زۆرێك لەگەڕیدەکان ئاواتیان بەوە دەخواست ڕۆژێك دابێت ژنانی ئەوروپاو ئەمریکاش هاوتای ژنانی زۆلۆو بابوا ببنەوە لەبەئەمەکییاندا بۆ مێردەکانیان.

بەئەمەکی بۆ هاوسەر لای خەڵکی بابوا ئاسانتر بوو، چونکە وەك زۆرینەی گەلە سەرەتاییەکان ڕێگیرییەکی ئەوتۆیان لەجیابوونەوەی ژن و مێرد نەدەکرد، تا گەیشتە ئەوەی یەکانگیربوونی ژن و مێرد لەناو هیندییەکانی ئەمریکادا

سالآنێکی کەم تێپەڕی نەدەکرد، سکوولگرافت لەو بارەیەوە دەڵێت: "ڕێژەیەکی زۆری پیاوە بەتەمەن‌و پیرەکان ئەوەندەیان ژن هێنابوو کوڕەکانی خۆیان نەدەناسییەوە کەبەهەرێمەکەیاندا بلاوەیان کردبوو"، گاڵتەیان بە ئەوروپایی دەکرد کەدەیانزانی بەهەموو تەمەنی تەنها ژنێك دەهێنێت، بڕوایان وەهابوو کەگیانی پاك بۆیە دوو کەسی بەیەك گەیاندوە تابەختەوەر بن، بۆیە نابێت بەیەکەوە بمێنن ئەگەر بیرکردنەوەو ئارەزوویان بەیەکەوە نەگونجێت، بۆیە دەبینین پیاوانی هۆزی چیرۆکی سالآنە سێ تا چوار جار ژنەکانیان دەگۆڕن، هەرچی خەڵکی ساموایە ئەوە سێ ساڵ ژنەکانیان دەهێشتەوە چونکە ئارەزوویەکی موحافیزکارانەیان هەبوو. بەلآم کەکشتوکاڵ داهات‌و کشتوکاڵیش پێویستی بەسەقامگیربوون هەیە، تەمەنی پەیوەندیی ژن‌ومێردایەتیش درێژتر بووەوە، ئەوەبوو لەسایەی سیستمی خێزانی باوکسالاریدا جیابوونەوە لەژن بەبۆچوونی پیاو لەگەڵ ڕێساکانی ئابووریدا نەدەگونجا، چونکە تەلآقدانی ژن لەڕاستیدا لەدەستدانی کۆیلەیەك بوو کەئاغاکەی قازانجی لێ دەست دەکەوت، کاتێکیش خێزان بوو بەناوکی بەرهەمهێنان لەکۆمەڵگادا، بەهاوکاری زەوی دەکێلآو چاودێری دەکرد، ئەوسا تازمارەی ئەندامانی خێزانەکە زیاترو یەکانگیرتر بوایە دەوڵەمەندتریش دەبوو، بەگریمانەی ئەوەی لەبارەکانی تردا لەگەڵ خێزانە بچووکترەکاندا چونیەك بوونایە. خەڵك ئەوەیان بۆ دەرکەوت کەقازانجی کۆمەڵگە لەوەدایە کە هەتا ژن‌و مێردەکە لەپەروەردەکردنی بچووکترین منداڵیان دەبنەوە پێکەوە بمێننەوە، بەلآم ئەگەر تا ئەو تەمەنە پێکەوە بمێننەوە لەدوای ئەوە چالاکییەکی ژیانی ئەوتۆیان نامێنێت پاڵیان پێوە بنێت بۆ خۆشەویستییەکی نوێ. ژیانی ژن‌و مێردیش وەك یەك گیانی لێ دێت هێندە کارو نارەحەتی هاوبەشیان لەنێویاندا بووە. تەلآقدان ئەو کاتە جارێکی تر بەرفراوان بۆوە کەمرۆڤ بەرەو پیشەسازی‌و بەرەو شاری گەورە هەنگاوی ناو

کەئاکامەکانی ئەو گواستنەوەیەش کەمبوونەوەی ژمارەی ئەندامانی خێزان‌و کەمبوونەوەی مەترسیەکانی لێکەوتەوە.

دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی بڵێین پیاوان لەهەموو چاخەکاندا حەزیان لە منداڵی زۆر بووە، بۆیە دایکایەتییان کردۆتە شتێکی پیرۆز، لەکاتێکدا ژنان کەتاڵی‌و دژواریی منداڵبوون بەرۆکی ئەوان دەگرێت، شۆڕشێکی حەشاردراو لەدەروونیاندا وروژا بەرامبەر ئەو داواکارییە قورسە، بۆیە چەندین ڕێگایان گرتەبەر بۆ سووککردنی ئەرکەکانی دایکایەتی لەسەر شانی خۆیان، پیاوانی سەرەتایی بەگشتی گوێ نادەن بەژمارەی دانیشتوان کەبەبێ سنووردانان زۆر بێت، چونکە منداڵان لەهەلومەرجی گوزەرانی چونیەکدا قازانجیان پێ دەگەیەنن، ئەگەر پیاو داخێکی لەدڵدا بوو وایە بۆ ئەوە بووە کەمەحاڵ بووە بتوانێت وا لەژنەکەی بکات تەنها کوڕی ببێت‌و کچی نەبێت، هەرچی ژنە ئەوە بەلەباربردن‌و زیندەبەچاڵکردنی منداڵ‌و ڕێگرتن لەمنداڵبوون بەرامبەر ئەو حاڵەتە دەبۆوە، تەنانەت ئەمەی دواییان (ڕێگرتن لەمنداڵبوون) ناوە ناوە لەناو گەلە سەرەتاییەکاندا ڕوویداوە، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کەهۆکارەکانی ژنی هەمەجی زۆر لەهۆکارەکانی ژنی شارستێن دەچێت لەمەسەلەی خۆپاراستن لەمنداڵبوون، ئەویش ئەوەیە کەکۆنترۆڵی پەروەردەکردنی منداڵەکانی پێ بکرێت‌و لەش‌ولارێکی گەنجانەی بمێنێت‌و خۆی لەو شوورەییە بپارێزێت کەبەرۆکی دەگرێت ئەگەر منداڵێکی لەپیاوێکی تر ببێت غەیری مێردەکەی خۆی‌و هەروەها خۆی لەمردن بپارێزێت‌و هەموو پاڵنەرەکانی تریش، سادەترین ڕێگەی ژنانیش بۆ سنووردانان بۆ دایکایەتی بریتییە لەوەی لەماوەی شیرداندا پیاوەکانیان ڕەت بکەنەوە، کەئەو خۆپارێزییە ڕەنگە چەند ساڵێك بخایەنێت، هەندێك جاریش —وەك ئەوەی لەناو هیندییەکانی چینیدا هەیە- ژن هەتا منداڵەکەی نەگاتە دە ساڵ ناهێڵێت منداڵی دووهەمی ببێت، لەبەریتانیای نوێشدا ژن تادوو یان چوار ساڵ بەسەر شووکردنیدا تێپەڕی نەکردایە نەیدەهێشت منداڵی ببێت. بڕوانە هۆزی جوایکۆرۆ لەبەرازیل کەبێ وچان ژمارەیان کەمی دەکرد

چونکه ژنەکانیان هەتا نەگەیشتنایەتە سی ساڵی نەیاندەهێشت منداڵیان ببێت، لەباربردنیش لەناو هۆزی بابوادا باو بوو، ژنەکانیان لەوبارەیەوە دەڵێن: "ئەرکی منداڵ قورسە، بێزار بووین لێیان، چونکە شەکەتمان دەکەن، ژنانی هەندێك هۆزە ماوری-یش بەهەندێك گژوگیا یان سەقەتکردنی ڕەحمیان خۆیان لەمنداڵبوون دەپاراست.

ئەگەر ژن نەیتوانیایە منداڵەکەی لەباربەرێت، تەنها ئەوەی لەبەردەمدا دەمایەوە کەزیندەبەچاڵی بکات، زۆربەی گەلانی خۆڕسکیش ڕێگە بەکوشتنی منداڵی تازەلەدایکبوو دەدەن ئەگەر منداڵەکە شێواو یان نەخۆش یان زۆڵ بێت، یان ئەگەر دایکی بەسەرییەوە بمرێت، ڕێك وەك ئەوەی مرۆڤ توانای هەبێت هەردەم پاساوی شیاو بدۆزێتەوە بۆ سنووردانان لەبەردەم زۆربوونی دانیشتواندا بەجۆرێك کەلەگەڵ سەرچاوەکانی ساماندا بگونجێت. هۆزگەلێکی زۆر هەن ئەگەر لەهەلومەرجێکدا منداڵ لەدایك ببێت وابزانن بەختی بەناوچاوەوە نییە ئەو منداڵانە دەکوژن. هۆزی بۆندی ئەگەر منداڵەکە یەکەمجار سەری بێتە دەرەوە دەیکوژن، هۆزی کامشاداڵ ئەو منداڵە دەکوژن کە لەکەشی زریاناویدا لەدایك ببێت، هۆزەکانی مەدەغەشقەریش ئەگەر منداڵ مانگی مارس یان ئەپریل یان ڕۆژی چوارشەممە یان هەینی یان دواهەمین هەفتەی هەر مانگێك لەدایك بێت ئەوە لەچۆڵەوانییەکی بەجێی دەهێڵن هەتا دەمرێت یان فڕێی دەدەنە ئاوەوە یان زیندەبەچاڵی دەکەن، ئەگەر ژنیش لەناو هەندێك هۆزدا دوانەی ببێت ئەوە دەگرێتە بەڵگەی زیناکاری لەسەری، چونکە مەحاڵە پیاوێك بەیەك جار دوو منداڵی ببێت، ئەوسا یان یەکێکیان یان هەردووکیان لەناودەبەن، زیندەبەچاڵکردنی منداڵان بەتایبەتی لەناو دەوارنشینەکاندا باو بووە، چونکە منداڵ لەکاتی کۆچوباری هەمیشەییاندا گرفتی بۆ دروست دەکردن، هۆزی بانگەرانگ لەڤیکتۆریا نیوەی منداڵەکانیان لەکاتی لەدایکبووندا لەناو دەبرد، هۆزی لەنگووس-یش لەهەرێمی شاکۆی وڵاتی پاراگوای ڕێگەی نەدەدا هیچ

خێزانێك لەماوەی حەوت ساڵدا منداڵێك پتری ببێت، ئەوەی لەوە زیاتری ببوایە لەناوی دەبرد، هۆزی ئابیپۆن ژمارەکەیان وەك فەرەنسییەکان دیاری کردبوو، دەبوو هەر خێزانێك کوڕێك‌و کچێك گەورە بکەن، هەر منداڵێکی تر دەبوو خێرا بکوژرێ، هەندێك هۆزیش ئەگەر تووشی برسێتی بوونایە یان برسێتی هەرەشەی لێ بکردنایە هەموو منداڵە تازە لەدایکبووەکانیان دەکوشت‌و دەشیان خواردن، زیاتریش کچان تووشی زیندەبەچاڵکردن دەبوون، هەندێك جاریش تا گیانی دەردەچوو ئەشکەنجە دەدرا بەبیانووی ئەوەی بەو ئەشکەنجەیە ئەگەر روحی بگەڕێتەوە بۆ دنیا دەچێتە جەستەی کوڕەوە، زیندەبەچاڵکردنی منداڵان لەپێش چاویان نەقێزەون بوو نەدەماری ویژدانی دەجووڵاندن، ، چونکە وەك دەردەکەوێت دایك دەستبەجێ لەگەڵ بوونی منداڵەکەیدا هەستی بەخۆشەویستی غەریزی نەدەکرد بەرامبەری.

ئەگەر ڕێگاش بدرایە بەمنداڵەکە چەند ڕۆژێکی کەم بژی، ئەوە لەمردن رزگاری دەبوو، چونکە هەر خێرا بەهۆی لاوازی‌و سادەییەوە سۆزی باوکایەتی‌و دایکایەتی لەباوك‌و دایکیدا دەوروژا، لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا ئەو خۆشەویستەی منداڵ لەدایك‌و باوکە سەرەتاییەکەیەوە وەری دەگرت زۆر زیاتر بوو لەوەی منداڵی خەڵکی باڵاتر لەرووی زیارەوە دەستیان دەکەوێت، لەبەرئەوەش کەماست‌و خواردنە تەڕەکانی تر لای ئەوان نەبوو، دایك لەدوو ساڵەوە هەتا چوار ساڵ خۆی شیری منداڵەکەی دەدا، بگرە هەندێك جار شیردان دوانزە ساڵی دەخایاند، گەڕیدەکان باسی کوڕێك دەکەن هێشتا شیری لێ نەگیرابۆیەوە دەستی بەجگەرەکێشان کردبوو، زۆر جاریش منداڵەکە لەیاریکردن رادەوەستا بۆ شیر خواردن، یان دەوەستا بزانێت چ کارێکی پێ دەسپێرن بۆ ئەوەی دایکی شیری بداتێ، ژنی نیگرۆش لەکاتی کارکردندا منداڵەکەی لەسەر پشتی هەڵدەگرت، ئەگەر بیویستایە شیری بداتێ مەمکی لەسەر شانییەوە فڕێ دەدا بۆی، پەروەردەی باوکانیش بۆ کوڕەکانیان خراپ نەبوو ئەگەرچی زۆر

پشتگوێیان دەخستن، چونکە لەتەمەنێکی زۆر زووەوە لەمنداڵ دەگەڕان خۆی ئاکامی گەمژەیی‌و هاری‌و چەڵەمەنانەوەکانی خۆی بچنێتەوە، ئیدی منداڵەکە پێ بەپێی زۆربوونی ئەزموونەکانی زانیارییەکانیشی زیادیان دەکرد، لەکۆمەڵگای خۆڕسکیشدا خۆشەویستی باوك بۆ کوڕو کوڕ بۆ باوك زیاترە.

منداڵی لەگروپی سەرەتاییدا دووچاری مەترسی‌و نەخۆشی زۆر دەبێتەوە، ڕێژەی مردنیش لەناو منداڵاندا زۆر بەرزە، تەمەنی لاویش لەو گروپانەدا زۆر کورتە، چونکە هاوسەرگیری زوو دەست پێدەکات‌و بەوەش دەرهاویشتەکانی ئەو پرۆسەیە دەست پێدەکەن، هەر خێراش تاکی ئەو گروپانە لەنێو قورسایی ئەو ئەرکانەدا نوقم دەبێت کەدەخرێنە ئەستۆی، ئیدی لەپەیداکردنی خۆراك بۆ گروپەکە هەتا بەرگریکردن لێی. ژنان بەهەڵگرتنی منداڵەکانەوەو پیاوان بەپەیداکردنی پێداویستییەکانی ژیان بۆیان سەرقاڵ دەبن، ئیدی هەتا لەگەورەکردنی دواهەمین منداڵ دەبنەوە هێزیان لێ دەبڕێت، واتە دەرفەتی ئەوەیان نابێت نە لەسەرەتای ژیانیانداو نەلەکۆتایی ژیانیاندا کەسێتی خۆیان دەربخەن، تاکگەرایی (وەك ئازادی) خۆش ڕابواردنێکە ژیار لەگەڵ خۆیدا هێناوە، تەنها لەبەرەبەیانی مێژوودا کۆمەڵێك ژن‌و پیاو لەدەست برسێتی‌و وەچەنانەوەو کوشتار رزگاربوون‌و دەستیان بۆ داهێنانی ئیتیکە ڕۆحییەکانی دەستبەتاڵی واڵا بوو لەڕۆشنبیری‌و لەهونەر برد.

## بابەتی سێهەم

## ئیتیکی کۆمەڵایەتی

**سروشتی چاکەو خراپە – چاوبرسێتی – بێئەمەکی – توندوتیژی – کوشتن – خوکوژی – ئامێتەبوونی تاك لەکۆمەڵدا – بەخشندەیی – بارەکانی هەڵسوکەوت – دیاریکردنی هۆز بۆ ئیتیك – ئیتیکی سەرەتایی بەبەراورد لەگەڵ ئیتیکی مۆدێرن – ئاین و ئیتیك**

یەکێك لەئەرکەکانی دایكو باوك ئەوەیە یاساکانی ئیتیك بۆ منداڵەکانیان بگوازنەوە، چونکە منداڵ لەئاژەڵەوە نزیکترە تا لەمرۆڤو مرۆڤایەتییەکەی وردە وردە وەردەگرێت هەروەك چۆن بەشێکی ئەو کەلەپوورە ئیتیکیو ئەقڵییە وەردەگرێت کە لەباووباپیرانییەوە بۆی ماوەتەوە، منداڵ لەڕووی بایۆلۆژیشەوە باش ئامادە نییە بۆ وەرگرتنی ژیار، چونکە غەریزەکانی بۆ هەڵوێستە سەرەکیو کلاسیکییەکان تەیاری دەکەنو تەنها بەدەمەوەچوونی شتە وروژێنەرەکان لەخۆ دەگرن کەئەمە لەگەڵ جەنگەڵدا زیاتر دەگونجێت هەتا لەگەڵ شارستێندا لەململانێی مانەوەدا، هەر خراپەیەك لەخۆیدا ڕۆژێك لەڕۆژان چاکەیەکی پێویست بووە ، تەنها کاتێکیش ناومان ناوە خراپە کەبەرەو نەمان چوون، لەبەر نەمانی ئەو هەلومەرجەی کردبوویانە پێویست، کەواتە خراپە جۆرێك نییە لەرەفتاری باڵاو گەشەکردوو، بەڵکو هەمیشە گەڕانەوەی مرۆڤە بەرەو ئەو ڕەفتارە کۆنەی ئێستا ڕەفتاری تر جێگەیان گرتۆتەوە، کەواتە یەکێك لەو ئامانجانەی یاسای ئیتیکی دەیەوێت بیانپێکێ بریتییە لەگونجاندنی ئەو خولیا سروشتییانەی مرۆڤ کەناگۆڕێن، یان بەخاوی دەگۆڕێن، لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتیو هەلومەرجە گۆڕاوەکانی ئەو ژیانەدا.

چاوبرسێتیو ئارەزووی دەست بەسەرداگرتنو بێئەمەکیو توندوتیژیو دڵڕەقی بەدرێژایی چەندین نەوە وەك کۆمەڵێك کاروباری بەکەڵك ماونەتەوە بۆ ئاژەڵو بۆ مرۆڤ کەئیدی ئەو ماوەیە ئەوەندە دووروودرێژە ئێستا بەهەرچی یاساو پەروەردەو ئیتیكو ئایینێکەوە کەهەمانە ناتوانین بەتەواوی شوێنەواریان بسڕینەوە، بێگومانیش هەندێکیان هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ بەهایەکیان ماوە کەخۆیانی پێ بهێڵنەوە، ئەوەتا ئاژەڵ تابتوانێت خۆراك دەخواتو خۆی دەئاوسێنێت چونکە نازانێت گەی جارێکی تر خۆراکی چنگ دەکەوێت، ئەم بەگومانبوونە لەبارودۆخی پاشەڕۆژ هەر خۆی سەرچاوەی بەرچاوبرسێتییە، هەر پیاوێکی هۆزی (یاقووت) لەڕۆژێکدا چل ڕەتڵ گۆشت دەخوات، چیرۆکی لەم بابەتە -با قارەمانێتییەکە کەمتریش بێت- لەبارەی ئەسکیمۆکانو دانیشتوانە ڕەسەنەکەی ئوستڕالیاشەوە دەگێڕنەوە. دڵنیایی نابووری کەبەرهەمێکی ژیاریە ئەوەندە نوێیە کەناتوانێت ئەو چاوبرسێتییە سروشتییەی مرۆڤ بسڕێتەوە، ئەو چاوبرسێتییەی لەئارەزووی تێرنەخواردوی دەست بەسەرداگرتندا خۆی دەنوێنێت، هەتا دەبینیت پاڵ بەپیاو یان ژنی مۆدێرنەوە دەنێت لەترسو دڵەڕاوکێی ژیاندا ئاڵتوونو شتی تر بشارنەوە بەمەبەستی ئەوەی لەڕۆژی ڕەشدا بیکەنە خۆراكو بیخۆن. دەبینین نەوسنیش بۆ خواردنەوە وەك ئەو نەوسنییە نییە کەبۆ خۆراك هەیە، چونکە زۆرینەی گروپە مرۆییەکان لەدەوری سەرچاوەکانی ئاو کۆبوونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خەریکە خۆ سەرخۆشکردن هەموو خەڵك بگرێتەوە، کەخەڵکیش مەی دەخۆنەوە ئەوە پەیوەندیی بەوەوە نییە بەرچاویان برسییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ساردییەکی ناخی خۆیانی پێ گەرم بکەنەوە، یان شتێکی پەژاراوی لەبیر خۆیان ببەنەوە، ڕەنگیشە تەنها لەبەر ئەوە بیخۆنەوە کەئەو ئاوەی هەیانە بەکەڵکی خواردنەوە نەیەت.

بێئەمەکی هێندەی بەرچاوبرسێتی کۆن نییە، چونکە برسێتی بەر لەموڵك هاتۆتەئاراوە، ڕەنگیشە سادەترین خەڵکی هەمەجی سەرەتایی بەئەمەکترین

خەڵك بووبن "چونکە ئەو وشەیە دەڵێن پیرۆزە" وەك گۆڵبن لەبارەی هۆزی هۆتنتۆت-ەوە دەڵێت "هیچ ئامرازێکی گەندەڵیو بێئەمەکی تاخولقێنن لەو ئامرازانەی ئەوروپا پێیان ئاشنایە"، بەڵام ئەم ئەمەکە ساویلکانەیە پێ بەپێی گەشەکردنی ئامرازەکانی گواستنەوەو گرێدانەوەی هەموو زەوی بەیەکەوە، وردە وردە ڕەوییەوە، چونکە ئامرازەکانی ئەوروپا دواتر توانییان ئەم هونەرە پرسەلیقەیە فێری هۆتنتۆتەکانیش بکەن، بێئەمەکی بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ ژیاردا دەردەکەوێت، چونکە لەسایەی ژیاردا ئەم بوارانە زیاتر دەبن کەپێویستیان بەزیرەکی سیاسییانە هەیە، چونکە ئەو شتانە زۆر دەبن کەمرۆڤ دەوروژێنن بۆ دزینیان، خۆشمان منداڵەکانمان لەسەر ئەوە پەروەردە دەکەین کەلەو بوارەدا کارامەبن، جا ئەو کاتەی مولکداری لەناو سەرەتاییەکاندا گەشەی کرد لەگەڵ خۆیدا درۆو دزییان بۆ دەهێنێت.

بەڵام تاوانەکانی سنگ بەسەر خەڵکدا دەرپەڕاندنو دەستدرێژیکردن ئەوە هێندەی چاوبرسێتی کۆنن، خەڵك لەسەر خۆراكو لەسەر خاكو ژن شەڕیان دەکردو زەوییان بەخوێنی مرۆڤ ئاو دەدا، تەنها نەوەیەکیش نەبوون لەو حاڵەتە ڕزگار بنو نەیانگرێتەوە، هەر ئەمەش ڕووناکیی لاوازو بچڕبچڕی ژیاری بەپەردەیەکی تاریك داپۆشیوە. مرۆڤی سەرەتایی دڵڕەقبوو، چونکە هەر دەبوو وەهابێت، ژیان فێری ئەوەی دەکرد کەهەردەم فۆڵی لەئامادەییدا بێت بۆ لێدانی بەرامبەر، دڵێکیشی هەبێت حەز بەکوشتنی سروشتی بکات،

ڕەشترین لاپەڕەکانی زانستی ڕەگەزە مرۆییەکانیش کاتێك ئەو لاپەڕانە بەسەر دەکەیتەوە ئەوانەن کەباس لەکردەکانی ئەشکەنجەدان دەکەن لەناو هۆزە سەرەتاییەکاندا، هەروەها باسی ئەو خۆشحاڵییەی زۆربەی پیاوو ژنە سەرەتاییەکان دادەگرێت لەو کاتەدا کەئازار بەیەکێك دەگەیەنن، بەشی زۆری ئەو دڵڕەقییەش وەك پێداویستییەکی جەنگ وەهابوو، چونکە دەبینیت لەچوارچێوەی هۆزێکدا مامەڵەکردنەکان کەمتر دڕندەیان پێوە دیارە، مامەڵەی

یەکتری‌و بگرە مامەڵەی کۆیلەکانیش بەنەرم‌و نیانییەك دەکەن زۆر لەو نەرم‌و نیانییە کەمتر نییە کە لە ژیاردا هەیە، بەڵام چونکە خەڵك ناچار بوون لەکاتی کوشتاردا یەکتری بکوژن، ئەوە فێری ئەوەی کردن لەکاتی ئاشتیشدا هەر خەڵك بکوژن، چەندین خەڵکی سەرەتایی هیچ ڕێگەیەکیان شك نەبردوە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی ئەو ڕێگەیە نەبێت کەیەکێك لەدوو لایەنەکەی ناکۆکییەکە بمرێت، زۆر هۆزیش ئەندامەکانی هیچ وەك ئێمەی مۆدێرن نیگەران نەدەبوون بەوەی کەسێك کەسێکی تر بکوژێت، با کوژراوەکە لەڕۆڵەکانی هەمان تیرەی خۆشیان بوایە، خەڵکی فویجی "تەنها بەدوورخستنەوە سزای بکوژیان دەدا، ئەویش بۆ ئەوەی برادەرەکانی تاوانەکەیان لەبیر چوایەتەوە، هۆزەکانی نەفیر-یش بکوژ بە(گڵاو) دادەنێن، داوای ئەوەی لێدەکەن دەموچاوی خۆی بەخەڵووز ڕەش بکات، بەڵام ئەگەر دوای ئەوە خۆی بشوات‌و دەمی پاك بکاتەوەو جەستەی بەڕەنگێکی قاوەیی ڕەنگ بکات، ئەوە سەرلەنوێ لەگروپەکەدا وەك ئەندام وەری دەگرنەوە، هەرچی هەمەجییەکانی (فۆتۆنا)یە ئەوە وەك ئێمە بکوژ بەقارەمان دەزانن، لەناو هەندێك هۆزیشدا ژن قایل نابێت شووبکات بەپیاوێك کەسی لەجەنگدا نەکوشتبێت، ئیدی کوشتارەکە لەسەر بناغەیەکی دروست بووبێت یان پووچەڵ بەلایەوە گرنگ نییە، هەر لەوەشەوە خووی (ڕاوە زەلام) سەری هەڵداوە کە تا ئێستاش لەفیلیپیندا ماوە، لەلای هۆزی دیاك-یش هەر پیاوێك زۆرترین سەر لەگەڵ خۆیدا لەو ڕاوە بهێنێتەوە بۆی هەیە کام کچی گوندەکەی بەدڵە بیبات بۆ خۆی، کچانیش پێیان خۆش دەبێت ببێتە مێردیان چونکە دەزانن لەسایەی مێردێکی وەهادا دەبنە دایکی پیاوی بەجەرگ.

کە خۆراك گرانتر دەبێت ژیان بێنرخ دەبێت، ئەندامانی ئەسکیمۆکان هیچ ڕێگەیەکیان نییە بۆ خۆلادان لەکوشتنی دایك‌و باوکیان ئەو کاتەی هێندە پیر دەبن توانای هیچیان نامێنێت‌و بەکەڵکی هیچ نامێنن، نەکوشتنیان لەو حاڵەتەدا بەجێنەگەیاندنی ئەرکی ڕۆڵەیە بەرامبەر دایك‌و باوك، ژیانی پیاوی سەرەتاییش

بەلای خۆیەوە هێندە بێبایەخە کەلەسەر کەمترین هەڵچوون خۆی دەکوژێتو لەم خوەیدا تەنها ژاپۆنییەکان شان دەدەن لەشانی، ئەگەر کەسێکیش خراپەی لەگەڵ بکرێتو خۆی بکوژێت یان ئازار بەخۆی بگەیەنێت ئەوە دەبێت خراپەکارەکەش هەمان ڕێگەی ئەو بگرێتەبەر ئەگینا دەبێتە کەسێکی بێزراو، خۆ کوشتنیش بۆ رزگاربوون لەشوورەیی‌و لەئاکاری خراپە زۆر کۆنە، هەموو شتێك بۆ ئەوە دەشێت ببێتە هۆکارێك بۆ خۆکوشتن، هەندێك ژنی هیندی لەباکووری ئەمریکا لەسەر ئەوە خۆیان کوشت کەپیاوەکانیان ڕێگەیان بەخۆیان داوە سەرزەنشتیان بکەن، لاوێکیش لەدورگەی ترۆبریاند لەسەر ئەوە خۆی کوشت کەژنەکەی چی تووتن لەماڵەکەدا بوو هەمووی کێشابوو.

ژیار ئەوەی خستە سەرشانی خۆی کەبەرچاوبرسێتی مرۆڤەکان بگۆڕێت بۆ ئابووری، دەستدرێژیش بگۆڕێت بۆ نارەزایی، کوشتنیش بۆ دادوەری، خۆکوشتنیش بۆ فەلسەفە، ئای چ گەشەیەکی مەزنیشە مرۆڤ گەشەی کردووە کەبەوە قایل بووە بەهێز لەژێر چەتری یاسادا لاواز لووش بدات!!. ئەو گرووپەی ڕێگە بدات بەئەندامەکانی هەمان هەڵوێست وەربگرن لەیەکتری کەوەك گروپ لەگروپەکانی تر وەری دەگرن، ئەوە لەناودەچێت، چونکە هاوکاری ناوخۆیی یەکەمین یاسای کێبەرکێی دەرەکییە، ململانێش لەپێناوی مانەوەدا بەوە کۆتایی نایەت کەتاکەکان هاوکاری یەکتری بکەن، بەڵکو بەوە کۆتایی دێت کەدەبێتە ململانێی نێوان گروپەکان پاش ئەوەی لەنێوان تاکەکاندا بوو، ئەگەر هەلومەرجی دوو گروپیش چونیەك بن تەنها لەوەدا نەبێت کەیەکێکیان ئەندامەکانی چ وەك خێزان‌و چ وەك تاك توانای یەکگرتنیان هەیە، ئەوکاتە ئەمیان لەگۆڕەپانی کێبەرکێکداو بەگوێرەی قەبارەی ئەو هاوکارییەی لەناو ئەندامەکانیدا هەیە دەتوانێت پێش ئەوی تر بکەوێتەوە، لێرەوە هەر گروپێك یاسایەکی ئیتیکی هەیە کەفێری ئەندامەکانی خۆی دەکات، لەناو دڵ‌و ناخیشیاندا کۆمەڵێك خولیای کۆمەڵایەتییان بۆ دروست دەکات کەکوشتارە

سروشتییەکانیان لەلا کەم بکاتەوە، ئەو گوشتارانەی کاری زیندووەکانە، گروپیش کەئەمە دەکات لەبەرئەوەیە کەئەو تاکانە پشتیوانو پایە شاردراوەکانی خۆی پێکدەهێنن، گروپ پشتگیری لەکۆمەڵێك خەسڵەتو خووی تاك دەکات کەبەکەڵك بۆ خۆی بگەڕێنەوە، هەر بۆیەش ناویان دەنێت (چاکە)، پێچەوانەی ئەو خووانەش لەدەروونی خەڵکدا قێزەون دەکاتو ناویان دەنێت (خراپە)، بەم شێوازە تاك —تاڕادەیەك لەڕواڵەتدا- ئامێتەی گروپ دەبێتو ئاژەڵ تیایدا دەبێتە هاوڵاتی.

دروستکردنی ئەو سۆزە کۆمەڵایەتییانە لەدەروونی مرۆڤی هەمەجیدا (تاڕادەیەکی زۆر) دژوارتر نەبووە لەوڕووژاندنیان لەدەروونی مرۆڤی مۆدێرندا، ئەگەر هەر ململانێی ژیان هانی پێکهاتنی کۆمۆنەی دابێت، ئەوە ململانێ لەسەر موڵك هەستی تاکگەرایی بەهێزتر کردووە، ڕەنگە مرۆڤی سەرەتایی لەمرۆڤی ئێستا خێراتر ئامادە بووبێت بۆ هاوکاریکردنی هاوەڵەکانی، بۆ ئەو ئاسانتر بووە تا بۆ مرۆڤی هاوچەرخ کەلەڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەگەڵ هاوەڵەکانی یەکانگیر بێت، چونکە ئەو مەترسیو بەرژەوەندییانەی گروپیان پێکەوە دەبەستەوە لەوانەی ئێستا بەهێزتر بوون، هەروەك موڵکەکانیشی کەمتر بوون لەوەی ببێتە خاوەنی بەرژەوەندییەکی دابڕاو لەبەرژەوەندییەکانی هاوەڵەکانی، مرۆڤی سەرەتایی دڵڕەقو بەرچاوبرسی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەبەزەییو بەخشندەش بوو، ئامادەبوو ئەوەی هەیەتی تەنانەت لەگەڵ خەڵکی نەناسیشدا بەشی بکات، دیاریش ببەخشێتە میوانەکانی، هەموو خوێنەرێك ئەو ڕاستییە دەزانێت کەچۆن بەخشندەیی سەرەتاییەکان لەناو زۆر هۆزدا وەهای لێدەکردن ژنەکانیان یان کچەکانیان پێشکەش بەمیوانەکانیان بکەن، ڕەتدانەوەی ئەو ڕێزلێنانەش لەکاتی میوانداریدا ئازارێکی زۆری هەستی دەدان، ئازاری هەستی خانەخوێکەو هەروەها ژنەکەیشی لەهەمان کاتدا، ئەوەش یەکێکە لەو گرفتانەی موژدەبەخشەکان تووشی دەبنەوە، ئەو مامەڵەیەش کەلەگەڵ میواندا دەکرێت

لەکاتی میوانییەکەیدا پەیوەستە بەو شێوازەی پێشترو لەسەرەتای هاتنیدا ئەو جۆرە هەڵوێستانەی پێ چارەسەر کردووە. پێدەچێت مرۆڤی سەرەتایی وەك مولك هەستی بەئیرەیی کردبێت بەرامبەر ژنەکەی نەك ئیرەییەکی سێکسی، پێی ناخۆش نییە ئەگەر ژنەکەی پێش ئەم پیاوی تری ناسیبێتو ئەوەش ئازاری نادات کەئێستا لەگەڵ میوانەکەیدا رابوێرێت، بەڵام زۆر تووڕە دەبێت (وەك خاوەن مولك نەك وەك عاشق) ئەگەر ببینێت بەبێ مۆڵەت خواستن لەم لەگەڵ پیاوێکدا رابوێرێت، هەندێك مێردیش لەئەفریقا ژنەکانیان دەبەن بۆ خەڵکی نەناس تەنها بۆ ئەوەی لەکاروبارەکانیاندا هەندێك ئاسانکارییان بۆ بکەن.

ڕێساکانی موجامەلەکردن لای زۆرینەی گەلە ساویلکەکان هێندە ئاڵۆز بوون وەك ئەوەی لای نەتەوە باڵاکان دەیبینین، هەموو گروپێك دەبینیت ڕێگەی فەرمیی خۆی هەیە بۆ پێشوازیکردنو بۆ ماڵئاواییکردن، ئەگەر دوو کەس یەك ببینن لوت لەلوتی یەکتری دەخشێننو دواتر بۆنی یەکتری دەکەن، یان هەر یەکێکیان بەناسکی دەکێشێت بەوی تردا، بەڵام ئەو خەڵکە –وەك پێشتر باسمان کرد- مەحاڵە یەکێکیان ئەوی تر ماچ بکات، هەندێك هۆزی دواکەوتوو لەو ڕووەوە ئەدەبێکی باشتریان لە مرۆڤێکی هاوچەرخی مام ناونجی هەبووە، ڕاوچیی مرۆییەکانی هۆزی دیاك وەك باسیان دەکەن لەناو ماڵدا زۆر نەرمو نیانو بێوەی بوون، هیندییەکانی ئەمریکای ناوەڕاستیش ئەگەر پیاوێکی سپی پێست بەدەنگی بەرز قسە بکاتو ڕەفتاری ناقۆڵا بنوێنێت وەك نیشانەیەکی خراپی پەروەردەو رۆشنبیریی سەرەتایی سەیری دەکەن.

دەتوانرێت بگوترێت تاڕادەیەکی زۆر هەموو گروپەکان لەیەك بڕوادا یەکدەگرنەوە کەئەویش ئەوەیە گروپەکانی تر لەوان لەخوارترن، هیندیەکانی ئەمریکا خۆیان بەنەتەوەی هەڵبژێردراوی خودا دەزانن، گوایا (ڕۆحی مەزن) بەتایبەت بۆ ئەوە دروستی کردوون کەببنە نموونە بۆ مرۆڤایەتی، یەکێك لەهۆزەکانی هیندییەکان ناوی لەخۆی ناوە (ئەو خەڵکەی کەسی تر نییە بێجگە

لەوان)، هۆزێکی تریش ناوی لەخۆی ناوە (خەڵکی ناو خەڵك) کاریبییەکانیش دەیانگوت (تەنها ئێمە خەڵکین)، ئەسکیمۆکانیش دەیانگوت ئەوروپاییەکان بۆ ئەوە چوونەتە گرینلەندا هەتا بنەما دروستەکانی ژیان‌و بەهاکانی چاکەکاری لای ئەوان لەناو ببەن، بۆیە مرۆڤی سەرەتایی هەرگیز بیری لەوە نەکردۆتەوە کەبەچ ئیتیکێك‌و دابێك مامەڵەی ئەندامانی هۆزەکەی خۆی دەکات بەهەمان شێوەش مامەڵەی هۆزەکانی تر بکات، چونکە زۆر ڕاشکاوانە  بڕوای وەها بوو ئەرکی ئیتیك ئەوەیە گروپەکەی خۆی بەهێزو تۆکمە بکات لەڕووی گروپەکانی تردا، فەرمانە ئیتیکییەکان‌و حەرامکردنەکانیش تەنها خەڵکی سەر بەهۆزەکەیان دەگرتەوە، هەرچی خەڵکی ترە، ئەوە تەنها مەگەر میوانی خۆی بن، ئەگینا بۆی هەیە چەندی دەتوانێت دوژمنایەتییان بکات.

گەشەی ئیتیك لەمێژوودا هێندەی خۆی لەفراوانکردنی بازنەی بەجێگەیاندنی ئەو ئیتیکەدا خۆی دەبینێتەوە هێندە خۆی لەچاککردنی یاسا ئیتیکییەکاندا نابینێتەوە، ئیتکەکانی مرۆڤی سەردەم مەرج نییە لەوانەی مرۆڤی سەرەتایی بالاتر بن، با داڕێژەرانی یاسا ئیتکییەکانیش لەناومرۆك‌و جێبەجێکردن‌و ڕاپەڕاندنی ئەو یاسایانەدا جیاوازییەکی ڕوونیان لەنێواندا بێت، بەڵام ئیتیکە نوێیەکان لەڕۆژانی ئاساییدا چوارچێوەکەیان هێندە فراوان دەبێتەوە کەژمارەیەکی زۆرتری خەڵك دەگرێتەوە وەك لەوەی جاران هەبوو، ئەگەرچی ئەو فراوانبوونی چوارچێوەیەش وردە وردە کەوتۆتە کەمبوونەوە، چونکە هۆزەکان ئێستا لەیەکەی گەورەتردا خڕبوونەتەوە کەپێیان دەگوترێت (دەوڵەت). ڕێساکانی ئیتیك سەرەتا لەسنووری هۆز دەرچوون، دواتریش کەدەوڵەتەکان لەڕێی ئامرازەکانی گواستنەوەوە یان بەهۆی مەترسی هاوبەشەوە پێکەوە گرێدران، ئیتیك لەڕێی سنوورەکانەوە لەم وڵاتەوە پەڕییەوە بۆ ئەو وڵات، هەندێك کەسیش هاتنەئاراوە کەڕێسا ئیتیکییەکانی خۆیان بەسەر هەموو ئەوروپاییەکاندا پەیڕەو دەکرد، دواتریش بەسەر هەموو ڕەگەزی سپی پێستدا، لەکۆتاییشدا بەسەر هەموو

مرۆڤایەتیدا. ڕەنگە هیچ سەردەمێك نەبووبێت کەخەڵکانێکی خاوەن ئایدیای جوانی تێدا نەبووبێت لەوانەی ئاواتیان بەوە خواستوە خەڵك دراوسێکانیان چەندە خۆش دەوێت هەموو مرۆڤەکانی تریشیان بەهەمان ئەندازە خۆش بوێت، ڕەنگیشە هاواری ئەو خاوەن ئایدیا جوانانە هەمیشە بەهۆی نەتەوەگەرایی‌و کوشتارەوە لەچاڵ نرابێت. بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەو بگرە ڕێژەیان بەبەراورد لەگەڵ خەڵکانی تردا بەلای زۆرەوە ئەمڕۆ زۆر زیاترە لەڕۆژگاری زوو، جا ئەگەر سیاسەتیش خاڵی بێت لەئیتیك، بەڵام لەبازرگانیکردنی نێودەوڵەتیدا ئیتیك بوونی هەیە، ئەمەش لەبەر هۆیەکی سادە، لەبەرئەوەی مەحاڵە بەبێ کەمێك لەدیسپلین‌و یاساو متمانە بازرگانی بکرێت، جا ئەگەر بازرگانی بەچەتەییش دەستی پێکردبێت، بەڵام هەر خۆی دواتر گەیشتوە بەچڵەپۆپەی ئیتیك. چونکە گروپە مرۆییەکان خۆیان لەبنەڕەتەوە پشت بەستوو بەقازانجی ئابووری‌و سیاسیی ڕوون‌و ئاشکرا بەیاسا ئیتیکییەکان قایل بوونە، سروشتی تاك هەرگیز بۆ ئەوە دەستی نەداوە ئەو تاکە ئارەزووی ئەوە بکات بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی بکاتە قوربانی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ، یان ئارەزووی ئەوە بکات گوێڕایەڵی ئەو یاسایانە بێت کەوەك بەردێك وەهان لەسەر سنگی دانرابن، ئەگەر بێتو ئەو یاسایانە شتێکیان تێدا نەبێت خۆیان بسەپێنن بەسەریدا. جا بۆ ئەوەی کۆمەڵگاکان پاسەوانێکی نەبینراو بەسەر تاکەوە دابنێن‌و بۆ ئەوەی پاڵنەرە کۆمەڵایەتییەکان لەناخی تاکەکاندا بەسەر پاڵنەرە تاکەکەسییەکاندا زاڵ بکەن لەڕێی وڕووژاندنی کۆمەڵێك هیوای بەهێزو هەروەها ترسی بەهێزیش لەناخیاندا، بۆ ئەو مەبەستانە کۆمەڵگاکان ئەگەر ئایینیشیان دانەهێنابێت ئایینیان بەکارهێناوە، سترابۆی جەگرافیاناسی کۆن لەم ڕووەوە بەر لەنۆزدە سەدە پێشکەوتووترین بۆچوونی دەربڕیوەو گوتوویەتی:

"تۆ کاتێك مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵێك ژن دەکەیت، یان هەر کۆمەڵە کەسێك کەهەر ئاسایی گردبووبنەوە، ناتوانیت بەفەلسەفە کاریان تێ بکەیت، ناتوانیت

لەرێی ئەقڵەوە کاریان تێ بکەیت‌و بیانهێنیتە سەر بڕواکردن بەزەڕووڕەتی خۆقورسکردن‌و باوەڕداری‌و خۆپارێزی لەخراپە، نەخێر، بەڵکو پێویستە کەمێك ترسی ئایینیشیان بدەیتێ، ناشتوانیت ئەو ترسە لەناخیاندا بورووژێنێت بەبێ ئەفسانەو گێڕانەوەی شتی سەیرو سەمەرەو ئەوسا باسکردنی هەورەبروسکەو فەڵغان‌و تێلا و مەشخەڵ‌و ڕمەکانی خوداوەندەکان، هەموو ئەو ئەفسانانە، هەروەها لاهوتی کۆن لەسەرەتایەوە هەتا دەگاتە کۆتاییەکەی، بەڵام دامەزرێنەرانی دەوڵەتە کۆنەکان دەستیان بەهەموو ئەو شتانەوە گرتبوو وەك دێوگەلێك کەخەڵکە ساویلکەکانیان پێ دەترساند، دواییش کەئەو ئەفسانانە شوێنی خۆیان لەناو چوارچێوەی ژیانی ژیارو کۆمەڵایەتیدا داگیرکردو هەروەها شوێنی خۆیان لەناو مێژووی ڕووداوە بینراوەکانیشدا داگیرکرد، ئەوسا کۆنەکان دەستیان بەسیستمەکانی خۆیانەوە گرت لەپەروەردەکردنی منداڵەکانیانداو هەتا تەمەنی کامڵبوون ئەو سیستمەیان جێبەجێ دەکرد، بڕواشیان بەوە هێنا کە لەرێی شیعرەوە دەتوانن ڕەفتاری تازەهەڵکەوتوو جوان بکەن لەهەر قۆناغێکی تەمەنیدا بێت، بەڵام ئەمڕۆ، دوای ئەوەی ئەو هەموو ماوەیە تێپەڕی، مێژوو و فەلسەفە بوونە سەرەکیترین ئامرازی پەروەردەکردنی تازەهەڵکەوتووان، ئەگەرچی فەلسەفە خۆی کەڵکێکی زۆر کەمیشی هەیە، لەکاتێکدا شیعر چاکترە بۆ گەل بەشێوەیەکی گشتی".

کەواتە ئەوەندە نابات بیروباوەڕی ئایینی جۆرێك لەپیرۆزی دەبەخشێتە ئیتیك، چونکە ئەو شتانەی لەژوور سروشتەوەن بایەخێك دەبەخشنە شتەکان، مەحاڵە ئەو شتانەی ئێمە هەستیان پێ دەکەین‌و دەتوانین بیانگەڕێنینەوە سەر ڕەچەڵەکەکانی خۆیان لەخۆڕا ئەو پیرۆزییە وەرگرن. خەیاڵ ئامرازێکی خۆشدەسترە لەزانست بۆ حوکمکردنی خەڵك، بەڵام ئایا ئەم کەڵکە ئیتیکییە ڕەچەڵەك‌و بناغەی بیروباوەڕی ئایینییە؟

## بابەتی چوارەم

## ئایین

### بێباوەڕە سەرەتاییەکان

ئەگەر بزانین ئایین بریتییە لەپەرستنی ئەو هێزانەی لەژوور سروشتەوەن، ئەوە دەبێت سەرەتا سەرنجی ئەوە بدەین کەهەندێك لەگەلان –وەك دەردەکەوێ- بەهیچ شێوەیەك هیچ جۆرە ئایینێکیان نییە، نەوەتا کورتەبنەکانی ئەفەریقا هیچ باوەڕێك‌و هیچ سرووتێکی ئایینییان نەبوو کەبینەر هەستی پێ بکات، هیچ پەرستگاو بت‌و خوداوەندێکیان نەبوو، مردووەکانیشیان بەبێ هیچ ڕێوڕەسمێك دەناشت‌و پاش ناشتنی پێ نەدەچوو هیچ بایەخێکیان پێ بدەن، بگرە ئەفسانەشیان نییە، ئەگەر لێرەدا بڕوا بەقسەی گەڕیدەکان بکەین کەپێمان وانییە زیادەڕوەییەکیان کردبێت جێی باوەڕپێکردن نەبێت، هەرچی کورتەبنەکانی کامیرۆنە ئەوە تەنها دان بەبوونی خوداوەندی خراپەکاردا دەنێن‌و هەرگیز هەوڵی ئەوەیان نەداوە دڵی ئەو خوداوەندانە ڕازی بکەن بەو پێیەی ئەو هەوڵە بێهوودەیە، هۆزی ڤ‌ـزا لەسیلان دانیان بەوەدا دەنا کەڕەنگە خوداوەندێك هەبێت‌و ڕۆحیش نەمر بێت، بەڵام هەرگیز لەوە تێنەپەڕیون‌و نوێژو قوربانییان نەبووە بۆ خوداوەند، یەکێکیان پرسیاری لێکرا سەبارەت بەخوداوەندو بەسەرسوڕماوییەکەوە وەك فەیلەسووفە تازەکان گوتی: "لەکوێیە، لەسەر تاوێرێکە یان لەسەر تەپۆڵکەیەکی مێرووڵە سپییەکانە یان لەسەر درەختێك، من خۆم هەتا ئێستا خوداوەندم نەبینیوە!"، هیندییەکانی ئەمریکای باکووریش باوەڕیان بەبوونی خودایەك هەبوو بەڵام هەرگیز نەیانپەرستوە، پێیان وەهابوو (وەك ئەبیقۆر) خودا زۆر لەوە دوورترە خۆی لەکاری ئەوان هەڵقورتێنێت،

هیندییەکی هۆزی ئەپیپونگ شتێکی گوت کە ڕەنگە سەر لەزانایەکی میتافیزیکا تێك بدات، بەشێوەزمانێکی کۆنفۆشیۆسی گوتی: "باوو باپیرانی ئێمە تەنها ئەم خاکەیان مەبەست بوو، تەنها داوای ئەوەیان دەکرد دەشتەکەیان پڕ بێت لەگژو ڕووبارەکان پڕ بن لەئاو بۆ ئەوەی ئەسپەکانیان تێرو تێراو بن، هەرگیز سەری خۆیان بەوەوە نەیەشاندوە لەئاسمان چ باسەو کێ ئەستێرەکانی دروست کردووەو کێ حوکمیان دەکات"، کاتێکیش لەئەسکیمۆکانیان دەپرسی کێ زەوی‌و ئاسمانەکانی دروست کردووە دەیانگوت "نازانین"، لەپیاوێکی زۆلۆ-شیان پرسی: "کاتێك خۆر دەبینیت هەڵدێت‌و ئاوا دەبێت‌و درەخت دەبینیت پێدەگات، ناپرسیت کێ دروستی کردووەو کێ بەڕێوەی دەبات؟"، لەوەڵامدا زۆر بەسادەییەوە گوتی "نەخێر، ئێمە ئەو شتانە دەبینین، بەڵام نازانین لەکەیەوە وەهایە، لەوەش دەچێت هەر لەخۆیەوە وەهابێت".

بەڵام ئەم حاڵەتانە دەگمەنن، هەتا ئێستاش ئەو بۆچوونە کۆنەی دەڵێت ئایین دیاردەیەکە هەموو مرۆڤەکان دەگرێتەوە بۆچوونێکی دروستە، ئەمەش بەبۆچوونی فەیلەسووف ڕاستییەکە لەڕاستییە مێژوویی‌و دەروونییەکان، چونکە ئەو فەیلەسووفە بەوەندە واز ناهێنێت کەبزانێت هەموو ئایینەکان پڕن لەقسەی پڕوپووچ‌و بێ بنەما، بەڵکو بەر لەوە بایەخ بەگرفتەکە خۆی دەدات، مەبەستم گرفتی بیروباوەڕی ئایینی لەڕووی دێرینی‌و بەردەوامییەوە، جا بناغەی ئەو خوداپەرستییە چییە کەهیچ شتێك ناتوانێت لەسنگی مرۆڤی هەڵکەنێت؟

## ١ـ سەرچاوەکانی ئایین

### ترس – سەرسوڕمان – خەوبینین – دەروون – ڕۆحانییەت

ترس وەك لۆکریشس دەڵێت یەکەمین دایکی خوداوەندەکانە، بەتایبەتیش ترس لەمردن، ژیانی سەرەتایی بەسەدان مەترسی چواردەوری گیرابوو، زۆر بەکەمیش ژیان بەهۆی پیرییەکی سروشتییەوە تەواو بووە، چونکە بە

بەماوەیەکی زۆر بەرلەوەی ئەو بیریە وروژم بەرەو لەش بهێنێت ، زۆرروزەوەندیی خەڵك پێویستی بە فاکتەرێکی توندی دەستدرێژی کردنە سەر یەکتر دەبوو، یان دەبووە فاکتەری بڵاوبوونەوەی پەتایەکی نەناس کەبەلەناوبردن مرۆڤەکانی لەناودەبرد، هەر لێرەوە مرۆڤی سەرەتایی باوەڕی بەوە نەکرد مردن دیاردەیەکی سروشتی بێت‌و ئەو دیاردەیەی گەڕاندەوە بۆ بوونەوەرێك لەژوور سروشتەوە، لەئەفسانەکانی دانیشتووانی ڕەسەنی نیوبەریتانیادا وا هاتووە کەگوایا مردن بەهۆی هەڵەیەکی خوداوەندەوە ڕوویداوە، سەرگوزەشتەکەیان دەڵێت کامبیناتای خوداوەندی چاکە بەبرا گەمژەکەی (کۆرفۆفا) گوتوە "بچۆرە سەر زەوی‌و پێیان بڵێت پێستی خۆیان دابماڵن بۆ ئەوەی لەمردن ڕزگاریان بێت، ئەوسا بەمارەکانیش بڵێت کەلەمرۆوە ئیدی مردن لەرێگەیاندایە"، کۆرفۆفا نامەکەی لێ تێکەڵ بوو، ئەوەبوو نهێنیی نەمریی بەمارەکان گوت‌و مردنی بەخشی بەمرۆڤەکان، هەر بەو شێوەیەش زۆر هۆز پێیان وابووە کەمردن دەگەڕێتەوە بۆ هاتنەوەیەکی پێست‌و ئەگەر مرۆڤ بتوانێت پێستی خۆی بگۆڕێت بەپێستێکی تر نەمر دەبێت.

گەلێك فاکتەر لە هاتنەکایەوەی بیروباوەڕی ئاینییدا یارمەتیی یەکتریان داوە ، لەوانە ترسی مردن، هەروەها سەرسوڕمان لەو ڕووداوانەی بەڕێکەوت تووشی مرۆڤ دێن، یان ئەو ڕووداوانەی مرۆڤ لێیان تێناگات، هەروەها هیوا بەیارمەتییەکانی خوداوەندو لەوێشەوە سوپاسگوزاری مرۆڤ کاتێك بەخت یاوەری دەبێت، گرنگترین شتیش کەجێی سەرسوڕمان بوو بۆ مرۆڤەکان‌و سەرنجی ڕاکێشان بەلای خۆیدا بریتیبوون لەسێکس‌و خەوبینین، دواتریش ئەو شوێنەوارە سەیرەی تەنە ئاسمانییەکانی لەسەر زەوی‌و مرۆڤەکان بەجێی دەهێڵن، مرۆڤی سەرەتایی تووشی سەرەگێژەیەکی زۆر بوو بەرامبەر ئەو شتانەی لەکاتی خەوتنیدا دەیبینین، ترسێکی زۆریش دایگرت کەلەکاتی خەودا خەڵکانێکی دەدیت بەتەواوی دڵنیابوو لەوەی لەژیاندا نەماون، ئەو بەدەستی

خۆی مردوەکانی خۆی ناشتبوو بۆ ئەوەی نەگەڕێنەوە، خۆراك‌و پێداویستییەکانی مردوەکەشی بەدەستی خۆی ناشتبوو بۆ ئەوەی مردوەکە نەگەڕێتەوە نەفرەتی خۆی بەسەریاندا ببارێنێت ، بەڵکو زۆر جار ئەو ماڵەشی بۆ مردوەکە بەجێ دەهێشت کەمردن لەوێ هاتبووە لای، لەهەندێك وڵاتدا مرۆڤی سەرەتایی لاشەی مردووی لەکونێکی دیوارەکەوە دەردەکرد نەك لەدەرگاکەوەو بەخێراییش سێ جار تەرمەکەی بەدەوری ماڵەکەدا دەسووڕاندەوە بۆ ئەوەی رۆحەکە رێگەی ماڵەکە هەڵە بکات‌و جارێکی تر نەگەڕێتەوە ناوی.

مرۆڤی سەرەتایی کە لەژیانیدا تووشی رووداوی لەم بابەتە دەبوو، هێنایانە سەر ئەو باوەڕەی هەموو بوونەوەرێکی زیندوو ناخێك یان ژیانێکی شاردراوە لەناوەوەیدایە، کەئەو ژیانە شاردراوەیە لەکاتی نەخۆشی یان خەوتن یان مردندا دەتوانێت لەجەستەکە جودابێتەوە، لەکتێبێکی "یۆپانیشاد"ی هیندیی کۆندا هاتوە کە: "هەرگیز کەسێکی خەوتوو لەناکاوو بەتوندی بێدار مەکەنەوە، چونکە چارەی ئەوە زۆر سەختە ئەگەر رۆحەکەی رێگە هەڵە بکات‌و سەر دەرنەباتەوە بۆ ناو جەستەکەی خۆی"، رۆحیش بەتەنها تایبەت نییە بەمرۆڤ، بەڵکو هەموو شتێك رۆحی هەیە، دنیای دەرەکیش شتێکی مردوو نییەو هەستی هەیە، بەڵام بوونەوەرێکی زیندووی پڕ لەژیانە، ئەگەر وەها نەبێ –بەبڕوای فەیلەسووفە کۆنەکان- ئەوە دنیا پڕاوپڕ دەبوو لەڕووداوگەلێك کەلێکدانەوەیان مەحاڵ بێت، وەك جووڵەی خۆر، یان ئەو بروسکەیەی زیندەوەرەکانی رادەچڵەکاند، یان چپەچپی درەختەکان، بەو جۆرە خەڵك شت‌و رووداوەکانیان بە دیاریکراوی وێنا دەکرد نەك بەمردوویی‌و بێ گیانی، بەواتایەکی تر ئایین پێش فەلسەفە کەوت، شاعیرێتی ئایین‌و ئایینگەرایی شیعریش هەر لەو نیگا رۆحانییەیدایە بۆ شتەکان، ئەوە لەسادەترین وێنەدا دەبینین، لەچاوی ئەبڵەقی سەگێکی سەرسامدا کەسەیری گەڵایەك دەکات کە با بەئاسمانەوە یاریی پێدەکات، رەنگە ئەو سەگە وابزانێت ئەو گەڵایە رۆحێکی هەیە لەناوەوە دەیجووڵێنێت، هەر ئەو هەستەشە

لەشاعیرێکدا دەیبینێتو دەگاتە بەرزترین پلەی خۆی لەو هۆنراوەیەدا کەدەینووسێتەوە، بەبۆچوونی مرۆڤی سەرەتایی -هەروەها بەبۆچوونی شاعیرانی هەموو سەردەمەکان- چیاو ڕووبارو تاوێرو درەختو ئەستێرەو خۆرو مانگو ئاسمانو.. هەموو شتەکان پیرۆزن، چونکە هەموویان نیشانەی دەرەوەی بینراوی ناخە شاردراوەکانن، گریکە کۆنەکانیش هەروا بیریان دەکردەوە، ئەوەبوو ئاسمانیان کردە ئۆرانۆس-ی خوداوەندو مانگ سلین-ی خوداوەندەو زەوی جێ-ی خوداوەندەو دەریا بۆزیدەن-ی خوداوەندە، بەڵام پان-ی خوداوەند ئەوە لەیەك کاتدا لەهەموو قوژبنەکانی جەنگەڵەکاندایە، جەنگەڵیش بەبڕوای جەرمانە کۆنەکان سەرەتا پڕبوون لەجنۆکەو دێوو جادووبازو خێوو کورتەبنەو بووکەجنەکان، ئەو بوونەوەرە پەریزادانەی بەجوانی لەمۆسیقای فاگنەرو شانۆ شیعرییەکانی ئەپسن-دا دەیانبینێت، جوتیاری ساویلکەی ئایرلەنداش هەتا ئێستا بڕوای بە جنۆکە هەیە، مەحاڵیشە دان بەشاعیر یان شانۆکارێکی سەردەمی ڕێنیسانی ئەدەبیدا بنرێ ئەگەر جنۆکە لەئەدەبەکەیدا نەبێت، ئەم تێڕوانینە ڕۆحانییەش داناییەكو جوانییەکی خۆی هەیە، چونکە ئەو چاکەیەی دڵی مرۆڤ پاك دەکاتەوە ئەوەیە کەمامەڵەی هەموو شتەکان وەك مامەڵەی زیندەوەرو مامەڵەی کەسێکی هەست ناسك بکەیت، وەك ناسکترین شاعیرانی هاوچەرخ لەهەستدا دەڵێن:

"سروشت لەشێوەی کۆمەڵێك بوونەوەری زیندووی جیاجیا لەیەکتری کەوتە نمایشکردن، هەندێکیان بینراونو هەندێکیان نەبینراو، بەڵام هەموویان لەسروشتی ژیری بوون، هەموشیان لەسروشتی ماددەبوون، هەمووشیان لەهەمان کاتدا لەناخی خۆیاندا ژیریو ماددەیان ئاوێتە دەکردو هەر بەوەش دەبوونە نهێنییە قووڵەکەی (بوون). جیهان پڕە لەخوداوەند، لەهەر هەسارەو لەهەر بەردێکدا بوونێك سەردەردێنێت کەجۆرێك لەهەستمان پێ دەبەخشێت کە بەهۆیەوە بگەینە ئەوەی ئەو هێزانەی لەهێزی خوداوەند دەچن زۆر زۆرن،

تیایاندایە بەهێزو تیایاندایە لاواز، تیایاندا یە زۆرو تیایاندایە کەم، هەمووشیان لەنێوان زەوی‌و ئاسمانەکاندا دەگەڕێن بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی خۆیان کەلەناخی خۆیاندا حەشاریان داوەو ئێمە نایانزانین.

### ٢ـ پەرستراوە ئاینییەکان

## خۆر- ئەستێرەکان- زەوی- سێکس- ئاژەڵ- تەوتەم- گواستنەوە بەرەو قۆناغی پەرستنی مرۆڤ - پەرستنی خێو- پەرستنی پێشینیان

ئەو کاتەی هەموو شتێك ڕۆحی دەبێت، یان خوداوەندێکی شاردراوە بوونی دەبێت، ئەو کاتە پەرستراوە ئایینییەکان لەژمارە نایەن، ئەو پەرستراوانە دەبنە شەش بەشەوە: زەمینی، ئاسمانی، رەگەزی، ئاژەڵی، مرۆیی، خوداوەندی، هەڵبەت هەرگیز ئەوەشمان بۆ ڕوون نابێتەوە ئاخۆ کام لەو شتانەی ئەو جیهانە پان‌وپۆڕە یەکەمین پەرستراوی مرۆڤ بووە، بەڵام ڕەنگە مانگ لەیەکەمین پەرستراوەکان بووبێت، چونکە وەك چۆن ئەمڕۆ ئێمە لەگۆرانییە میللییەکانماندا باسی مانگ وەها دەکەین کەپیاوێکی لەسەر بێت، ئەفسانە کۆنەکانیش بەهەمان شێوە مانگیان وەك پیاوێکی ئازا وێناکردووە گوایا ژنانی فریو داوەو هەر جارێك خۆی بۆ دەرخستبن تووشی حەیزی کردوون، مانگ خوداوەندێکی خۆشەویستی ژنانیش بووە، ژنان بۆیە پەرستوویانە چونکە لەنێو خوداوەندەکاندا ئەو پارێزگاری لێکردوون، هەروەك مانگی رووکزیش بۆتە پێوەرێك بۆ کات‌وسات، بەبڕوای ئەو مرۆڤە سەرەتاییانە مانگ جڵەوی کەشی بەدەستە، باران‌و بەفریش لەئاسمانەوە دەبارێنێت، تەنانەت بۆقەکانیش لەمانگ دەپاڕێنەوە کەبارانیان بۆ ببارێنێت.

ئێمە ئەوەش نازانین لەکەیەوە لەئایینە سەرەتاییەکاندا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی ئاسمان خۆر جێگەی مانگی گرتۆتەوە ، ڕەنگە ئەوە ئەو کاتە بوبێت کەکشتوکاڵ جێگەی ڕاوی گرتەوە، چونکە ئەوسا رارەوی خۆر بۆتە پێوەر بۆ

زانینی وادەکانی تۆووەشاندنو درەو، مرۆڤ ئەو ڕاستییەشی زانی کە گەرمیی خۆر هۆکاری سەرەکی ئەو خێروبێرەیە کەزەوی دەری دەدات، ئەوسا زەوی لەبەرچاوی مرۆڤە سەرەتاییەکاندا بوو بەخوداوەندێك کەبەتیشکی گەرمی دەپیتێت، خەڵکیش کڕنۆشیان بۆ خۆری مەزن برد بەو پێیەی ئەو باوکەیە کەگیانی بەبەر هەموو شتە زیندوەکاندا کردووە، بەم سەرەتا ساویلکانەیە پەرستنی خۆر خۆی خزاندە نێو هەموو ئایینە بت پەرستییەکانی خەڵکانی کۆن، کە بتەکانی زۆربەیان چ نەبوون بێجگە لەبەرجەستەکردنەوەی خۆر، ئەی ئەوە نییە گریکەکان ئاناکسیس گۆراس-یان لەوڵات دوورخستنەوە تەنها لەسەر ئەوەی ڕێگە بەخۆی بدات گومان لەخوداوەندێتی خۆر بکاتو بڵێت خۆر تەنها تۆپێکی ئاگرەو لەڤەبارەدا هێندەی (پلۆپۆنیز) دەبێت.

هەروەها چاخەکانی ناوەڕاستیش هەندێك پاشماوەی ئەو خۆرپەرستییەیان پێوە دیار مابوو، ئەویش لەو ئەڵقەیەدا بەرجەستە دەبێت کە لەوێنەکانیاندا بەچواردەوری سەری خەڵکە پیرۆزەکاندا دەیانکێشا ئیمپراتۆری ژاپۆنیش لەم ڕۆژگارەی ئەمرۆدا لای زۆربەی خەڵکی وڵاتەکەی دەپەرستێ بەو پێیەی خوداوەندی خۆر بەرجەستە دەکات، بەڕاستی هیچ ئەفسانەیەکی چاخی کۆنت بەرچاو ناکەوێت بەشێوەیەك لەشێوەکان لەژیانی ئەمڕۆی ئێمەدا خۆی دەرنەخستبێتەوە، ژیار دەستکردی کەمینەیەکی خەڵکە کەلەسەر بناغەی خودگەرایی دایانمەزراندو ناوەرۆکەکەیان لەژیانی خۆشڕابواردن هەڵێنجاندووە، هەرچی خەڵکی سادەو ڕەشوڕووتە ئەوە بەهەموو هەزار ساڵێك بڕێکی کەمی هەست پێنەکراو گۆڕانیان بەسەردا دێت.

هەر ئەستێرەیەکیش وەك خۆرو مانگ خوداوەندێکی هەڵدەگرتو خۆیشی لەخۆیدا خوداوەندێك بوو، جووڵەکانیشی بەفەرمانی ئەو ڕۆحەیە کەلەناخیدا خۆی حەشارداوە، هەر ئەو ڕۆحانەش لەسایەی مەسیحیەتدا بوونە ئەو فریشتانەی ڕێگەی ڕوونیان نیشانی خەڵك دەدا، یان گەر دەتەوێ بڵێ بوونە ڕێبەری تەنە

ئاسمانییەکان، تەنانەت کیپلەریش لەتیئۆرە زانستییەکەیدا نەیتوانی نکۆڵی لەو تێڕوانینە بکات، خودی ئاسمانیش خوداوەندێکی مەزن بوو، لەتیبتل کڕنۆشی بۆ دەبرا بەپێی ئەوەی هەور لەئاسمانەوە دێنێتە خوارێ یان دیلی دەکات، زۆر هۆزی سەرەتاییش هەن وشەی (الله) بەمانای ئاسمان بەکار دەهێنن، دەستەواژەی لای لۆباری‌و دەنکاکانیش بەمانای باران دێت، لای مەنگۆلییەکانیش بەمانای خوداوەندی مەزن دێت، هەروەها لای چینییەکانیش هەمان مانا دەگەیەنێت، لەهیندی چینیش (تیبت) بەهەمان شێوە وشەی (الله) بەمانای ئاسمانی دایك دێت، خوداوەند لای گریکەکانیش واتە زەیۆس یان ئاسمان (بەڕێوەبەری هەورەکان) لای فارسەکانیش (ئاهورا)یە واتە ئاسمانی شین.

هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆش ئێمە پەنا دەبەینە بەر ئاسمان کەلەخراپە بمانپارێزێت، زۆربەی ئەفسانە کۆنەکانیش لەدەوری یەك تەوەرەدا دەسووڕێنەوە، ئەویش ئەوەیە کەبەپێتی لەسەرەنجامی جووتبوونی زەوی‌و ئاسمان دروست بووە.

چونکە زەویش لای خۆیەوە وەك خوداوەندێك سەیر دەکرا، هەر دیاردەیەکی سەرەکیش لەدیاردەکانی زەوی بەفەرمانی خوداوەندێك بەڕێوە دەچوو، درەختەکان وەك مرۆڤ ڕۆحیان هەیە، بڕینی درەختیش کوشتنێکی ئاشکرا بوو، هیندییەکانی ئەمریکای باکووریش بڕوایەکیان هەبوو کەئەو شکست‌و لەناوچوونەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سپی پێستەکان ئەو دەرختانەیان بڕیوەتەوە کەڕۆحەکانیان ئەوانیان لەئازار دەپاراست، لەدورگەکانی مۆلگاش لەڕۆژانی نەشونومای درەختدا دەیانگوت ئەو درەختانە بەجنۆکە دووگیانن، بۆیە ڕێگەیان نەدەدا لەپاڵ ئەو درەختانەدا دەنگ بەرز بکرێتەوە یان ئاگر بکرێتەوە یان هەر شتێکی تر بکرێت کە ئارامی ئەو درەختە دوو گیانانە بشڵەقێنێت، ئەگەر نا ئەو درەختەی ڕێز لەئارامییەکەی نەگیرایە بۆی هەبوو بەرەکەی پێش گەیین بخاتە خوارەوە وەك چۆن ژنی دووگیان ئەگەر ئازارێکی پێ گەیشت منداڵەکەی بەر لەوادەی ژانگرتن لەبار دەچێت، بەهەمان شێوە لەئابوینا ڕێگە نادرێت لەپاڵ

درەختی (ئەرز)دا دەنگ بەرز بکرێتەوە ئەگەر گوڵەکانی لەگەشانەوەدا بن، لەترسی ئەوەی تووشی لەبارچوون بێت‌و گوڵەکانی ببنە چڵەپووشی نەزۆك، فاڵە کۆنەکانیش درەختی چەند دارستانێکی دیاریکراویان دەپەرست کەلەلایان پیرۆز بوون، هەروەك قەشە درۆیدییەکانی ئینگلتەراش (دیبق)ی داری بەڕوویان لەلا پیرۆز بووە، کەهێشتا لای ئێمەش توفووسێکمان نیشان دەدات دڵمان پێی دەکرێتەوە. کۆنترین بیروباوەڕی ئایینیش لەئاسیادا -کەبتوانین دوی ڕەچەڵەکە مێژووییەکانی بکەوین- بریتییە لەپیرۆزکردنی درەخت‌و کانی‌و ئاوو ڕووبارو چیاکان، زۆر لەچیاکان شوێنی پیرۆز بوون، خوداوەندەکان کردوویانن بەبارەگای خۆیان‌و لەوێوە هەر کات ویستبێتیان هەورە بروسکەیان ناردوە، بومەلەرزەش هیچ نییە بێزاربوونی خوداوەندێك نەبێت کەلەبێزاریی خۆیدا شانی هەڵتەکاندوە، خەڵکی فویجی-یش بومەلەرزە بەوە لێکدەدەنەوە کەخوداوەندی زەوی بەدەم خەوەوە خۆی ئەمدیواودیو کردووە، ئەگەر لای هۆزی ساموا-ش زەوی بلەرزێت ئەوە دەکەونە گاز گرتن لەزەوی‌و پاڕانەوە لەخوداوەندی مافۆی کەبسرەوێت نەوەك زەوی ببێتە هەزارو یەك پارچەوە، زەوی لای خەڵکی زۆربەی هەرە زۆری دنیا بریتییە لە(دایکی مەزن، زمانی ئینگلیزی کەزۆربەی جار وەك ئەو پانتاییە وەهایە کەنیشتووی بیروباوەڕە سەرەتاییەکان یان نەستییەکانی لەسەر کۆبۆتەوە تا ئەمڕۆش ئاماژە بەبوونی نزیکییەك دەدات لەنێوان ماددەو دایکایەتیدا، ماددە یانی (Matter)و دایکیش یانی (Mother)، (ئەشتار)و (سیبیل)و (دومیتۆر)و (سیرێز)و (ئافرۆدێت)و (ڤینۆس)یش هەر وێنەی تاڕادەیەك دڕەنگی یەکەمین خوداوەندەکانی زەوین کەبڕێك لەبەپیتی خۆیان بەخشیوە بەزەوی‌و بەوە خێروبێری زەوییان دەرهێناوە، ئەوەی خەڵکیش باسیان کردووە سەبارەت بەلەدایکبوونی ئەو خوداوەندانەو دواتر شووکردنیان‌و مردنیان‌و گەڕانەوەیان بۆ ژیان بەسەرکەوتوویی، ئەو باسانە تەنها هێمان یان لێکدانەوەن بۆ دەرکەوتنی ڕوەك‌و شکبوونی‌و تازەبوونەوەی ناوەناوەی هەستپێکراوی ژیانی ڕووەك، مێینەی

ئەو خوداوەندانەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤی سەرەتایی ژن‌و کشتوکاڵی پێکەوە بەستۆتەوە، کاتێکیش کشتوکاڵ بووە روخساری زاڵی ژیانی مرۆیی، خوداوەندەکانی روەك بوونە خانمی یەکەمی هەموو خوداوەندەکان، زۆربەی سەرۆکەکانیش لەچاخی کۆندا مێینە بوون، دواتر کەخێزانی باوکسالاری وەك سەرکەوتوویەك لەسەر زەوی خۆی دەرخست خوداوەندە نێرینەکان جێگەیان گرتنەوە.

هەروەك چۆن ئەقڵی سەرەتاییش لەو شیعرە قوولانەدا کەگوتوونی نهێنییەکی خودایی لەگەشەی درەختدا دەبینێت، بەهەمان شێوە دەستێکی خودایی لەپشت سکپڕی‌و منداڵبوونەوە دەبینێت، هەمەجی هیچ لەبارەی هێلکۆکەو کرۆمۆسۆمەوە نازانێت، بەڵکو ئەو ئەندامانە دەناسێت کەبەچاو دەیانبینێت، واتە ئەو ئەندامانەی پێکەوە لەو پرۆسەیەدا بەشداری دەکەن، بۆیە دەیانکاتە خودا، ئەو ئەندامانە بەبۆچوونی ئەو رۆح خۆی تێدا حەشارداون‌و دەبێت بپەرسترێن، ئەوە نییە ئەو هێزە داهێنەرە سەیرە لەوانەوە سەر دەردێنێت، سەیرترینی هەموو بوونەوەرەکان؟ هەر لەو ئەندامانەدا موعجیزەی بەپیتی‌و گەشە زۆر روونتر دەردەکەوێت لەوەی لەخودی زەویدا دەردەکەوێت، کەواتە گومان لەوەدا نییە کەئەوە نزیکترین شت بێت کەخوداوەند هێزی خۆی تێدا دەربخات، لەوەیە هەموو گەلە سەرەتاییەکان بەشێوەیەك لەشێوەکان یان لەیەکێك لەتوقووسە ئایینییەکانیاندا توخم (جینس) پەرستی بکەن.. نەك نزمترینیش، بەڵکو بالاترین ژیارتییان بوو کەگوزارشتێکی تەواوی لەو پەرستنە کرد، ئەم پەرستنە لەمیسرو هیندو بابل‌و ئاشوورو گریك‌و رۆماندا دەبینین، خەڵك ئەرکی سێکسی‌و لایەنی سێکسیی خوداوەندە سەرەتاییەکانیان زۆر پیرۆزو مەزن دەکرد، هۆیەکەش ئەوە نەبوو لەو لایەنە سێکسییەدا چێژێکی حەرام ببینن، بەڵکو ئەوەبوو کە پەیوەندییەکی ویژدانییان بە بەپیتی ژن‌و زەوییەوە هەبوو، هەر بۆیەش هەندێك ئاژەڵی وەك گوێرەکەو ماریان دەپەرست، چونکە -وەك دەردەکەوێت- هێزی

وەچەنانەوەی خوداوەند دەردەکەوێت، یان بڵێ هێمان بۆ ئەو هێزە، بێگومان مار لەچیرۆکی (عەدن)دا هێمایەکی سێکسییە کەپەیوەندیی سێکسی بەرجەستە دەکات، بەو پێیەی بنچینەی سەرلەبەری خراپەیە، ئاماژەشە بۆ ئەوەی باڵغ بوون سەرەتای چاکەو خراپەیە، ڕەنگە ئاماژەیەکیش بێت بەپەیوەندییەك لەنێوان ساویلکەیی‌و خۆشی بەهەشتدا.

لەوانەیە ئاژەڵێك لەهەموو سروشتدا نەبینیت کەلەوڵاتێك لەوڵاتەکاندا نەبوو‌بێتە پەرستراو، هەر لەگوێرەکەی میسرییەکانەوە هەتا فیلی هیندۆسەکان، هیندییەکانی ئۆجبوا ناوی تەوتەم-یان بڕاند بەسەر ئەو ئاژەڵەدا کەدەیانپەرست‌و براندیان بەسەر هەموو ئەو تیرەیەدا کەئەو ئاژەڵەی دەپەرست‌و بەسەر هەموو ئەندامێکی تیرەکەشدا، دواتر زانایانی ڕەگەزە مرۆییەکان هاتن‌و کردیانە ناوی ڕێبازی (تەوتەمییەت) کەئاماژەیەکی ناڕۆشنە بۆ هەر پەرستنێکی شتێکی دیاریکراو -زیاتریش پەرستراوەکە یان ئاژەڵە یان ڕوەك- کە گروپێك دەیکەنە بابەتی پەرستشی خۆیان، کۆمەڵێکی هەمەجۆری تەوتەمیش دۆزیوەتەوە لەشوێنە جیاجیاکانی زەوی کەپەیوەندییەکی دیاریان پێکەوە نییە، هەر لەهۆزە هیندییەکانی ئەمریکای باکوورەوە هەتا خەڵکی ئەفەریقاو هۆزی دراڤید لەهیندو هۆزەکانی ئوسترالیا، تەوتەمەکان وەك دروشمێکی ئایینی ڕۆڵیان لەیەکخستنی هۆزیشدا هەبووە کەئەندامانی هۆزەکە وەهایان داناوە شتێك لەو تەوتەمەدا هەیە پێکەوەیان دەبەستێتەوە، یان وەهایان داناوە هەموویان وەچەی ئەون، هۆزی ئیراکۆ بۆ نموونە پێیان وایە -تاڕادەیەك وەك داروین بۆی چوە- کەئەوان بەری جووتبوونی ژنان‌و توخمی ورچ‌و گورگ‌و ئاسکن. تەوتەم چ وەك دروشم‌و چ وەك هێما بووە نیشانەیەکی بەکەڵك بۆ ناسینەوەی ئەو پەیوەندی‌و خزمایەتییانەی لەنێوان خەڵکانی سەرەتاییدا هەبوون‌و لەیەکتری جیاکردنەوەیان، دواتریش پێ بەپێی سەردەم گەشەی کردو شێوەی عەلمانییانەی وەرگرت وەك ئاڵاو بەیداخ، وەك ئەو شێرو بازانەی ئەمڕۆ دەبینین نەتەوەکان کردوویانن بەدروشمی خۆیان، یان

ئەو کەڵەکێوییەی گروپ و ڕێکخراوەکان کردوویانە بەهێمای برایەتی لەنێوان خەڵکدا، یان ئەو ئاژەڵە لاڵانەی ئەمڕۆ پارتە سیاسییەکان لەلامان دروستیان دەکەن بەمەبەستی بەرجەستەکردنی ئەبزێویی فیل و هاتوهەرای هێستر، کۆترو ماسی و بەرخیش لەهێماگەرایی ئایینی مەسیحدا لەکاتی سەرهەڵدانی ئەو ئایینەدا پاشماوەی پیرۆزکردنی کۆنی تەوتەمەکان بوون، بگرە بەرازی سووک و چڕووکیش ڕۆژێك لەڕۆژان لای جوولەکەکانی بەر لەمێژوو تەوتەم بووە، لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا تەوتەمەکان حەرام بوو دەستیان بۆ ببرێت، لەهەندێك هەلومەرجی تایبەتیشدا خواردنیان دەشیا، بەڵام بەمەرجێك خواردنەکەش وەك بەشێك لەتوقووسی ئایینی بەڕێوە بچێت، واتە خواردنەکەش خواردنێکی پەرستشانەی مرۆڤ بوو بۆ خوداوەندی خۆی، هۆزی گالا لەوڵاتی حەبەش لەناهەنگێکی ئایینی زۆر قورسدا ئەو ماسییە دەخۆن کەدەیپەرستن، ڕۆڵەکانی هۆزەکەش دەڵێن: "کاتێك ماسییەکە دەخۆین هەست بەڕۆح دەکەین لەناوماندا دەجووڵێت"، مژدەبەخشە مەسیحییە پاکەکانیش چ سەرسامییەك دایگرتن کەلەکاتی بەخشینەوەی مژدەی مەسیح بەناو هۆزی گالادا سەرنجی ئەوەیان دا ئەو ساویلکانە توقووسێکیان هەیە زۆر لەتوقووسی (قودداس)ی مەسیحییەکان دەچێت.

ڕەنگیشە ترس بنەڕەتی تەوتەمگەری بێت، وەك چۆن هەر خۆی بنەڕەتی زۆربەی پەرستنەکانە، ئەمەش بەوەی مرۆڤ لەبەر بەهێزی ئاژەڵی پەرستبێت، هیچ ڕێگەی شك نەبردووە ڕازیکردنی دڵی نەبێت، کاتێکیش ڕاوکردن جەنگەڵی لەو دڕندانە پاك کردەوەو ڕێگەی بۆ ئەو ئاسوودەییە کردەوە کە لەکشتوکاڵدا بەدی دەکرێت، پەرستنی ئاژەڵ کەم بۆوە ئەگەرچی بەتەواوی لەناونەچوو، ڕەنگیشە یەکەمین خوداوەندە مرۆییەکان سروشتی خۆیان لەسروشتی خوداوەندە مرۆییە ئاژەڵییەکانەوە هەڵێنجاندبێت، ئەو جێگۆڕکێیەش لەنێوان ئەو دوو چینەی خوداوەندەکاندا لەزۆربەی چیرۆکە بەناوبانگەکاندا دەردەکەوێت کەباسی گۆڕانی خوداوەندەکانمان بۆ دەکەن، لەبەرهەمەکانی (ئۆفید)ی شاعیرو لەشاعیرانی

هاوچەشنی ئەو کەبەهەموو زمانەکانی جیهان شتیان نووسیوە، ئەو چیرۆکانە باسی ئەوەمان بۆ دەکەن خوداوەندەکان چۆن بوون، یان چۆن شێوەی ئاژەڵیان هەبووە، دواتریش ئەو خەسڵەتانەی ئاژەڵیان تێدا ماوەتەوەو بەجێی نەهێشتوون وەك چۆن تەویلەیەك ئەگەر بکرێتە کۆشکێکی گوندی دوورەدەستیش تازە هەر بۆنی تەویلەی لێ نابێتەوە، تەنانەت لە(هۆمەر)یشدا کە لەپێشکەوتندا قۆناغێکی دووری بڕیبوو، دەبینیت (گلۆکۆبیس)ی خوداوەندی ئەسینایی دوو چاوی کونەپەپوی هەیەو (هێری بوبیس)ی خوداوەند دوو چاوی مانگای هەیە، خوداوەندەکانی میسرو بابلیش بەروخساری مرۆییو لەشی ئاژەڵییانەوە هەمان قۆناغی گواستنەوە دەردەخەن، دان بەهەمان ڕاستیشدا دەنێن کەزۆرێك لەخوداوەندەکان ڕۆژێك لەڕۆژان خوداوەندی ئاژەڵی بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی لەخوداوەندە مرۆییەکان —وەك دەردەکەوێت- لەسەرەتادا پیاوانێك بوون مردوونو لەیێی خەیاڵەوە مەزن کراون، تەنها خەوبینین بەمردووەوە بەس بوو بۆ ئەوەی ئەو مردوە بپەرسترێ، چونکە ئەگەر پەرستن بەهۆی ترسیشەوە سەری هەڵنەدابێت، لانی کەم هاوڕێیەتییەکی لەگەڵ ترسدا هەیە، بەتایبەتیش ئەوانەی لەژیانیاندا بەهێز بوونو ترسیان خستبووە دڵی خەڵکانی ترەوە، ئەوانە ئەگەری زۆر هەیە پاش مردنیان بپەرسترێن، بۆیە دەبینیت وشەی (خوداوەند) لای زۆر لەگەلان لەڕاستیدا ماناکەی بەرامبەر (پیاوی مردوو)ە، هەتا ئێستاش دەبینیت وشەی (Spirit) لای ئینگلیزەکانو وشەی (Geist) لای ئەڵمانەکان ماناکانیان ڕۆحە یان خێوە. گریکەکانیش وەك چۆن مەسیحییەکان موفەڕك لەپیاوە پیرۆزەکانیان وەردەگرن ئەوانیش وەها بوون لەگەڵ مردووەکانیان، بڕواهێنان بەبەردەوامبوونی ژیانی مردوەکان -ئەم بڕوایە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ خەوبینین بەمردوانەوە- گەیشتە ئاستێکی زۆر گەورە، بەڕادەیەك ئەو بڕوایە پاڵی بەسەرەتاییەکانەوە نا -بەتەواوی مانای ئەم وشەیەوە کەدەیڵێین- نامە بۆ مردوەکانیان بنێرن، لەیەکێك لەهۆزەکاندا بۆ نموونە ئەگەر سەرۆك بیویستایە

پەیامێك بگەیەنێتە مردوویەك، ئەوە پەیامەكەی خۆی بەكۆیلەیەك دەگوتەوەو دواتر ملی كۆیلەكەی دەپەڕاند بۆ ئەوەی پەیامەكە بگەیەنێت، خۆ ئەگەر شتێكی بچووكیشی لەبیرچوایە ئەوە بەهەمان ڕێگە ملی كۆیلەیەكی تری دەپەڕاندو دەیكردە تەواوكەری نامەی یەكەم، دواتر پلە پلە پەرستنی خێوەكان هاتە خوارەوە بەرەو پەرستنی باووباپیران، خەڵك وایان لێهات لەهەموو مردوەكانی خۆیان دەترسان‌و هەمیشە لەهەوڵی ڕاییكردنی دڵیاندا بوون، لەترسی ئەوەی نەك نەفرەتی خۆیان بەسەر زیندووەكاندا داباریێنن‌و ببنە هۆی نەهامەتییان، ئەم جۆری پەرستنەی باووباپیران وەك ئەوە وابوو بەجۆرێك ئامادە كرابێت ببێتە پایەیەكی تۆكمەكردنی كۆمەڵگا لەڕووی دەسەڵات‌و بەردەوامبوونییەوەو توانای ئەوە ببەخشێتە كۆمەڵگە كەبتوانێت دەست بەنەریتە كۆنەكانی خۆیەوە بگرێت‌و پارێزگاری لەسیستمی خۆی بكات، بەڕادەیەك كەزۆر بەخێرایی لەسەرانسەری جیهانی ناوەدانا بڵاوبۆوەو لەمیسرو گریك‌و ڕۆمادا گەشەیەكی تەواوی كرد، هەتا ئێستاش لەژاپۆن‌و چیندا ئەم ئایینە هەر ماوەو كاریگەریی زۆری بەسەر ناخی تاكەكانەوە هەیە، زۆر لەگەلانیش هیچ خوداوەندێكیان نییەو بەتەنها باووباپیرانی خۆیان دەپەرستن! ئەم ئاقاری بیركردنەوەیە وێڕای ڕقی ئەوەی نوێ بۆ سیستمەكە بووەهۆی لێك گرێدانەوەیەكی توندی نێوان ئەندامانی خێزان، بۆ بەشێكی زۆر كۆمەڵگە سەرەتاییەكانیش بووە چوارچێوەیەكی شاردراوەی ڕێكخستنی تاكەكان لەرێكخراوەیەكی یەكانگیردا، وەك چۆن زوڵمیش بەلەدایكبوونی ویژدان كۆتایی هات، بەهەمان شێوە ترسیش گەشەی كرد هەتا بووە خۆشەویستی، چونكە توقووسەكانی پەرستنی باووباپیران لەلایەن خەڵكەوە، كەئەگەری زۆر ئەوەیە سەرەتا لەترسەوە سەری هەڵدابێت، دواتر لەدڵی خەڵكەكەدا جۆرێك لەهەیبەتی بۆ ئەو پەرستراوانە دروستكرد، دواجاریش گەشەی كردو بوو بەخۆپارێزی‌و دڵڕازیكردن. هەمان ڕەوتی گەشەكردنیش لەلای خوداوەندەكان دەبینین، سەرەتا دێوی دڕندەن‌و دواتریش دەبنە ئەو باوكانەی ڕۆڵەكانی خۆیان خۆش دەوێت، بەو جۆرە هەتا ئاسوودەبوونی زیاترو ئاسایش‌و

هەستی ئیتیکی لای بەندەکان لەدڕندەیی خوداوەندەکان کەمتر بکاتەوە لەوەی یەکەمجار مەزەندەیان کردووەو هەتا ڕوخساری ئەو خوداوەندانە زیاتر دەستکاری بکرێ بەجۆرێك لەگەڵ ڕیتمی نوێدا بگونجێت، بتە پەرستراوەکەش پێ بەپێی هەموو ئەوانەو لەگەڵ کاتدا دەبێتە نموونەیەکی باڵای چاولێکراو، خاووخلیچکی هەنگاوەکانی ژیار لەدرەنگ هاتنی ئەو قۆناغەدا دەردەکەوێت کەخەڵك تیایدا هەستیان بەخۆشەویستی کردووە بەرامبەر خوداوەندەکانیان.

بیرۆکەی خوداوەندێکی مرۆیی تەنها درەنگانێك دەرکەوتوە، ئەو کاتەش بەڕوونی دەرکەوتوە کەکۆمەڵێك قۆناغی زۆری بڕیوەو ئەو قۆناغانە لەو وێناکردنەی مرۆڤ قوتاریان کردووە کەبۆ چواردەوری خۆی هەیبووە گوایا ئەو چواردەورە پڕە لەدەعباو دێوو درنجو خێوو ئەوان هەموو سووچێکیان ئاوەدان کردۆتەوە، دواتر ترس‌و پەرستنی مرۆڤ بۆ ڕۆحی ڕوخسار نامۆو سنوور نەزانراوە، گۆڕا بۆ پیرۆزکردنی هێزە ئاسمانی‌و روەکی‌و توخمییەکان، دواتر بۆ کڕنۆش بردن بۆ ئاژەڵ‌و بۆ باووباپیران، بەلای زۆریشەوە ئەو بیرۆکەیەی خوداوەند بەباوك دەناسێت لەو پەرستشی پێشینیانەوە ڕێچکەی گرتووە، واتە ئەو سەرچاوەکەیەتی، چونکە ئەو بیرۆکەیەی گوتمان لەڕاڤەکەیدا ئەوەیە کەمرۆڤەکان لەشیان لەخوداوەندەوە دابەزیوەتە سەر زەوی، نەك تەنها بەڕۆح لێی جودابوینەوە، هەر بۆیە لەلاهووتی سەرەتاییدا سنوورێك نییە بەتەواوی خوداوەندو مرۆڤ لەڕووی جۆرەوە لەیەکتری جودا بکاتەوە، ئەوەتا لای گریکە کۆنەکان -بەنمونە- پێشینان خوداوەند بوون‌و خوداوەندەکانیش هەر باووباپیران بوون، دوای ئەوەش هەنگاوێکی نوێی گەشەکردن هاتە پێشێ، ئەویش ئەوەبوو کەخەڵك لەو پێشینانە تێکەڵیە چەند ژن‌و پیاوێکی دیاریکراویان دەستنیشان کرد، کەئەوانە جیاوازییەکیان لەوانەی تر هەبوو، ئەوەبوو ئەو جیاکراوانە جۆرێك لەڕەنگی خوداوەندیی ڕاشکاوانەیان بەسەردا ڕژێندرا، بەمەش شا ناودارەکان تەنانەت بەر لەمردنیشیان بوونە خوداوەند، بەڵام ئەگەر بێینە سەر ئەم قۆناغە ئەوە دەگەینە ئەو ژیارەی مێژوو تۆماری کردووە.

## ٣- ڕێگەکانی ئایین

### جادووبازی – توقووسی کشتوکاڵ – جەژنەکانی پەتیارەیی – ئەفسانەکانی خوداوەند – نێردراو – جادووبازیو ئەفسانەگەرایی – جادووبازیو فێرکردن – کاهینەکان

کاتێك مرۆڤی سەرەتایی دنیایەکی ڕۆحی ی لەزەینی خۆیدا وێناکرد کەنە لەناوەرۆكو نەلەمەبەستی ئەو دنیایە نەدەگەیشت، کەوتە ڕازیکردنی ئەو دنیایەو بەکێشکردنی بۆ ئەوەی هاوکاریی بکات، هەر لێرەشەوە جادووی بۆ ئەو ڕۆحانیەتەی خۆی زیادکرد کەلەخودی خۆیدا ئەو ڕۆحانییەتە ناوەرۆکی ئایینگەریی سەرەتاییە، جادووش وەك ڕۆحی توقوسەکانی پەرستنە لەلای مرۆڤی سەرەتایی، پۆلینیزییەکان وایاندەزانی ڕکابەرێکی ڕاستەقینەیان هەیە پڕە لەهێزی جادوو، ناویشیان لێنا (مانا)، جادووبازانەکانیش بەلای ئەوانەوە (پۆلینیزییەکان) چەند دڵۆپێکی کەمی ئەو سەرچاوە جادووییە بێکۆتاییەی بەسەردا دەڕژاندن، کەخودی جادووبازەکە هێزی جادوویی خۆی لەو سەرچاوە لەبن نەهاتووەوە وەردەگرت، ئەوەش کەپێی دەگوترا جادووی نمایشکارانە یەکەمین ڕێگە بوو کەمرۆڤ گرتیەبەر، ئەویش بەنمایشکردنی هاوشێوەی ئەو کردارانەی دەیویست خوداوەندەکان بۆی ئەنجام بدەن، وەك ئەوەی بەوە بیەوێت فریوی خوداوەند بدات هەتا لاسایی بکاتەوە، بۆ نموونە ئەگەر خەڵکەکە بارینی بارانیان داوا بکردایە جادووبازەکە ئاوی دەڕژاندە سەر زەوی، باشتریش وابوو لەسەر درەختێکەوە ئەو ئاوە بڕژێنێت، لەبارەی هۆزی ئەلکەفیریشەوە ئەوە دەگێڕنەوە کەئەگەر بکەوتنایەتە بەر هەڕەشەی وشکەساڵی داوایان لەمزدەبەخشێك دەکرد بچێتە ناو کێڵگەکانو چەترەکەی بکاتەوە، لەسۆمەترا ژنی نەزۆك وێنەی منداڵێکی لەژووری خەوەکەیدا هەڵدەواسی بەو هیوایەی پاش

ئەو كارە منداڵی ببێت، لەئەرخەبیلی باباریش ئەگەر ژن حەزی لەمنداڵ بوایە بووكێكی لەلۆكەی سوور دروست دەكردو وەك شیری بداتێ ئاوەها لەگەڵی دەجووڵایەوە، نوشتەیەكی جادوویی زانراویش هەیە لەو بارەیەوە كەدەڵێت ئەو ژنە دەبێت خەڵكێك بنرێتە ناو گوند تا هەواڵی منداڵبوونەكەی بگەیەنن‌و ئەوسا هاوەڵەكانی بێن بۆ پیرۆزبایی، بەڕاستی كەس ناتوانێت ئەو خەیاڵە ڕەت بداتەوە واقیعێكی زۆر سەرسەخت نەبێت، لەناو هۆزی دیاك‌یش لەبۆڕنیۆ، ئەگەر جادووباز بیویستایە ژانی منداڵبوونی ژنێك كەم بكاتەوە، خۆی وەك نمایش جموجووڵی منداڵبونی نمایش دەكرد، ڕەنگە بەوەش هێزە جادووییەكەی خۆی نیشانی كۆرپەلەكە دابێت بۆ ئەوەی خۆی دەربخات، هەندێك جاریش جادووبازەكە بەردێكی لەسەر سكی خۆی دادەناو خلی دەكردەوە، بەو هیوایەی كۆرپەلە بەگیرهاتوەكە لاسایی بكاتەوەو بەوەش كردەی زاینەكە ئاسانتر بێت.

لەچاخەكانی ناوەڕاستیشدا بەوە جادوویان لە كەسێك دەكرد، دەرزییان دەژەندە پەیكەرێك كە لەمۆم لەوێنەی ئەو دروست دەكرا، هیندییەكانی پیرۆش بووكەڵەیان لەبری خەڵك دەسوتاند، بەوەشیان دەگوت سووتاندنی ڕۆح، خەڵكی سادەی ئەم سەردەمەش زۆر لەقسەی پڕوپووچیاندا زۆر لەو جادووە سەرەتاییە پێشكەوتووتر نین.

شێوازەكانی پەنابردنە بەر نمایش بۆ ئاماژەبەخشین بەتایبەت بۆ پیتاندنی خاك بەكار دەهێندرا، زانستمەندانی زۆلۆ ئەگەر پیاوێك لەهەرەتی توانایدا بمردایە ئەندامی نێرینەیان دەسووتاند، دواتر دەیانهاڕی‌و دەیانكردە خۆڵەمێش‌و بەسەر كێڵگەكاندا دەیان وەشاند، هەندێك گەلیش شایەك‌و شاژنێكیان لەنێو ژنان‌و پیاواندا بۆ بەهار هەڵدەبژاردو لەئاهەنگێكی ئاشكرادا دەیانكردنە ژن‌و مێرد، بەو هیوایەی خاك لەئاهەنگەكەو ماناكەی بگات‌و بەپەلە گوڵەكانی دەربكات، بگرە لەهەندێك وڵاتدا لەو ئاهەنگە نمایشكارییە ڕەت دەبوون‌و بووك‌و زاواكەیان بەڕاستی لەیەك مارە دەكرد بۆ ئەوەی هیچ پاساوێك بۆ سروشت

نەهێڵنەوە –با ئەو سروشتە تەنها قورێکی ساردی بێ گیانیش بێت- کەلەو ئەرکە تێنەگات پێی سپێردراوە، لەجاوەش جوتیاران‌و ژنەکانیان دەچوونە نێو کێڵگە مەرەزەکان‌و لەوێ پەیوەندیی سێکسییان دەکرد بۆ ئەوەی بەپیتی بەرهەمی کێڵگەکان زامن بکەن، چونکە سەرەتاییەکان بەزمانی نایترۆجین لەگەشەی ڕووەك نەدەگەیشتن، بەڵکو –دیارە بەبێ ئەوەی بزانن ڕووەکیش نێرو مێی هەیە- چۆن بەرخستنەوەی ژنیان لێکدەدایەوە بەهەمان شێوە هی ڕووەکیش، پاشان کەئێمە خۆشمان وشەی وەك (بەرخستنەوە) بۆ ژنیش‌و بۆ ڕووەکیش پێکەوە بەکار دێنین ئەمە ئەو بیروباوەڕەی ئەوان‌و ئەو شیعرەی هەڵیگرتووە ناخاتەوە بیرمان؟

چەند ئاهەنگێکیش هەن کەتیایاندا هەردوو رەگەزەکە بەبێ هیچ دیسپلینێك تێکەڵی یەکتری دەبن، لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا ئەو ئاهەنگانە لەوەرزی تۆووەشاندندا ساز دەکرێن، وەك شتێك یاسا ئیتیکییەکان بۆ ماوەیەکی کاتی بخرێنە لاوە (ئەو جەژنانەش ئەو ئازادییە ڕێژەییە بیری خەڵك دەخاتەوە کە لەڕۆژگاری کۆندا لەپەیوەندییە سێکسییەکاندا هەیانبووە)، مەبەستیش لەو جەژنانە سکپڕکردنی ئەو ژنانە بووە کەمێردەکانیان نەزۆك بوون لەلایەکەوەو ناردنی پەیامێك بووە بەزەوی کە لەو قاوغی خۆپارێزییە دەربچێت کە زستان تێی چووەو ئەو تۆوانە وەربگرێت کەتیایدا وەشێندراوەو خۆی ئامادە بکات بۆ بەخشینی بەروبوومێکی باش لەخۆراك، ئەو جەژنانە لای ژمارەیەکی زۆر لەگەلە خۆڕسکەکان بەڕێوەدەچوو، بەتایبەتیش لای خەڵکی کامیرۆن، کۆنگۆ، کەفیر، هۆتنتۆت، بانتۆ، لەم رووەشەوە ه.رۆلی کەپیاوێکی ئایینی بانتۆکانە دەڵێت:

"جەژنەکانی درەو لەسروشتیاندا لەجەژنەکانی باخۆس-ی گریکەکان دەچن، مەحاڵە کەسێك سەیریان بکات‌و شەرم داینەگرێت، چونکە لەو بەرەڵڵاییە سێکسییەدا بەوە وازناهێنن باوەش بکەن بەکەسێکدا کەتازە بوبێتە مەسیحی، بگرە بەوەش واز ناهێنن باوەش بکەن بەواندا کەدەمێکە بوونەتە مەسیحی،

بـەڵکو هـەر میـوانێکیش هـەبێت سـەیری ئاهەنگەکـەیان بکـات فریـوی دەدەن کەبـچێتە نـاو بەرەڵڵاییەکەیانـەوە، ئەوسـا هـیچ شـتێك رێگـر نابێـت لەبـەردەم خەڵکەکەدا کەرۆبچنە کاری سۆزانیانەوە، بەچاوێکیش سەیری زیناکاری ناکـەن کەهیچ مانایەکی قێزەونی تێدا بێت، بەهۆی ئـەو هەلومـەرجەوە کەلـەو ساتەدا دەوریـان دەدات، بـەڵکو رێگـە نـادەن بـەپیاوێك هاتبێتـە ئاهەنگەکەیانـەوە لەگـەڵ ژنەکەی خۆیدا رابـبوێرێت".

جەژنی لەو بابەتە لـەو چاخانەی ژیارتیـشدا دەردەکـەوێت کەمێـژوو تۆمـاری کردوون، ئەوەتا ئاهەنگەکانی باخۆس لای گریکەکان و هاوشێوەی ئەوانـە لـەرۆماو فەرەنسا لەچاخەکانی ناوەڕاستداو لەئینگلتـەراو هـەموو ئاهەنگـە ڕووتـەکانی تـر کەلــەم ســەردەمەی خۆمانــدا دەیــانبینین، هــەموو ئەمانــە لــەجۆری جەژنــە بەرەڵڵاییە کۆنەکانن.

بـەڵام ئـەم توفووسـانەی کشتوکاڵ لەهەنـدێك وڵاتـی ئێـرەو ئـەوێ شێوەیەکی ڕەقــتر وەردەگرێــت لــەوەی باسمــان کــرد، وەك ئــەوەی لای بۆنییــەکان و لای هیندییەکانی جوایا کیل دەبینرێت، لای ئەوانە پیاوێك دەکرێتە قوربـانی لـەکاتی تۆو وەشاندندا بۆ ئەوەی زەوی بەخوێنی پاراو بکرێـت، دواتـر کـەمێك حاڵەتەکـە سووکتر کـراو بەسـەربڕینی ئاژەڵێـك واز هێنـرا وەك قوربـانی، دواییـش کـەوەرزی دروێنــە دەهــات وەهایــان لێکدەدایــەوە کــەپیاوە مردوەکــەی کرابــووە قوربــانی، زیندوو بۆتەوە، بۆیە بـەر لـەوەی بمرێـت و دوای مردنەکەشی گـەورەیی خودایـان پێ دەبەخشی، هەر لەم ڕەچەڵەکەشەوە ئـەو ئەفـسانەیە لـەدایکبووە کەبەهـەزارو یەك شێوەی جیاواز دەیگێڕێتەوە چۆن خودا لەپێناوی گەلەکەیـدا مـردوەو چـۆن دواتـر بەسـەرکەوتوویی ژیـانی بەبـەردا دێتـەوە، شـیعریش جـادووی نەخـشاندوە هـەتا ئــەوەی کردوویــەتی بــەجۆرێك لــەلاهوت، چــەندین ئەفــسانەش تێکــەڵ و پێکـەڵی یـەکتری بـوون کـە شـت لـەبارەی خـۆرەوە بەتوفووسـی کـشوکاڵییانە دەگێڕنەوەو تێکەڵبوونەکەشیان تەناسوق و گونجانێکی تێدایـە، بـەجۆرێك کەئـەو

ئەفسانەیەی باسی مردنی خوداوەندو سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەی دەکات، ماناکەی تەنها لەوەدا قەتیس نییە کەباسی مردنی زستان و گەڕانەوەی ژیان بکات بۆ زەوی لەبەهاردا، بەڵکو باز دەداتە سەر هەردوو هەڵگەڕانەوەکەی تری هاوین و پاییز، ئەوەش کەلەوانە دەکەوێتەوە وەك کورتی و درێژی ڕۆژگار، چونکە هاتنی شەو لەخۆیدا چ نەبوو بێجگە لەبەشێکی ئەو تراژیدیایە، چونکە خوداوەندی خۆر هەموو ڕۆژێك جارێك دەمرێت و دەژییێتەوە، هەموو ئاوانێکی وەك شەهیدبوونی وەهایە بەسەر خاچەکەوە، هەموو هەڵاتنێکیشی وەك سەرلەنوێ ژیانەوەو تیشکدانەوە وەهایە.

وەك دەریشدەکەوێت قوربانیدان بەمرۆڤ –کەلەهەموو جۆرەکانی تەنها نموونەیەکمان هێنایەوە- پێدەچێت مرۆڤی هەموو گەلان کاریان پێ کردبێت، چونکە ڕۆژێك لێرە دەردەکەوێت و ڕۆژێك لەوێ، لەدورگەی کارۆلینای کەنداوی مەکسیك پەیکەرێکی کانزایی ناوبەتاڵمان دۆزیوەتەوە کەدەگەڕێتەوە بۆ خوداوەندێکی مەکسیکی کۆن و ناوەکەی پڕکراوە لەتەرمی مرۆیی کەبێگومان وەك قوربانی بۆ خودا سووتێندراون، هەمووشمان مولخ-مان بیستوە کەفینیقی و قرتاجی و هەموو گەلە سامییەکانی تر ناوە ناوە قوربانی مرۆییان بۆ سەربڕیوە، لەم سەردەمەی خۆشماندا ئەم خووە لەرۆدیسیا بوونی هەبووە، ڕەنگیشە ڕەچەڵەکی ئەم خوە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەسەرەتاییەکان گۆشتی مرۆڤیان دەخوارد، ئیدی پێیان وابووە خۆیان حەز بەچ خۆراکێك بکەن خوداوەندیش حەزی پێدەکات، لەبەرئەوەش کەبیروباوەڕی ئایینی زۆر لەبیروباوەڕەکانی تر خاوتر گۆڕانی بەسەردا دێت و لەبەرئەوەش کەگۆڕانکاری لەتوقووسی ئایینیدا لەگۆڕانکارییەکانی سەر ئایین خۆی خاوترە، لەبەرئەوە مرۆڤ وازی لەخواردنی گۆشتی مرۆڤ هێنا، بەڵام نەریتەکە بۆ خوداوەندەکان وەك خۆی مایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو توقوسانەی ئایینیش بەحوکمی گەشەکردنی ئیتیك گۆڕان بەشێوەیەك خوداوەندەکان کەوتنە لاساییکردنەوەی بەندەکانی خۆیان لەناسکی

نیشانداناو خۆیان دا بەدەست ئەو بارە تازەیەوەو بەگۆشتی ئاژەڵ قایل بوون لەبری گۆشتی مرۆڤ، ئەوەبوو ئاسکێك لەبری یەفیگینیا کرایە قوربانی (لەئەفسانەی گریکیدا)و بەرانێك لەبری کوڕەکەی ئیبراهیم کرایە قوربانی، سەردەم بەرەوپێشەوە چوو و خوداوەندەکان ئەو ئاژەڵەشیان قەدەغەکرد، چونکە کاهینەکان وەهایان پێ باشتر بوو خواردنی بەتام بۆ خۆیان دابنێنو کەوتنە خواردنی ئەوەی دەخورێتو لەو قوربانییەی دەدرایە خوداو دواتریش لەسەر تەختی سەربڕینەکەدا بەتەنها ئاوسكو ئێسقانەکانیان بۆ خودا بەجێ دەهێشت.. لەکاتێکیشدا مرۆڤی کۆن زۆر باوەڕی بەوە هەبوو کەهەرچییەك بخوات هێزەکەی بۆ دەگوازرێتەوە، ئەوە ئاساییە بیرۆکەی خواردنی خوداوەند بدات لەسەری، ئەوەتا لەزۆر حاڵەتدا گۆشتی خوداوەندی مرۆیی دەخورێتو خوێنەکەی دەخورێتەوە، ئەو خوداوەندەی کەسەکە خۆی دەیپەرستو قەڵەوی دەکردو ئامادەی دەکرد بۆ ئەوەی بیکاتە قوربانی، بەڵام سەرچاوەکانی خۆراك زۆرتر بوونو مرۆڤ مانەوەی خۆی زامن کرد، ئەوەش بوو بەهۆی زۆربوونی بەزەیی لەدڵیداو هەر بۆیە لەبری قوربانیدان بەخوداوەند کەوتە قوربانیدان بەچەند هێمایەك کەلەسەر شێوەی ئەو دروستی دەکردنو بەخواردنی ئەو هێمایانە ڕازیبوو، لەمەکسیکی کۆندا پەیکەرێکی خوداوەند لەدەغڵو دانەوێڵەو سەوزە دروست دەکراو دواتر بەخوێنی مێردمنداڵان دەشێلرا کەبۆ ئەو مەبەستە دەکرانە قوربانیو پاشان ئەو پەیکەرەیان لەبری خوداوەند خۆی دەخوارد، هاوشێوەی ئەم ئاهەنگە ئایینییانەش بەزۆر لای هۆزە سەرەتاییەکان دەبینرێت، نەریتیش وەهابوو کەخەڵکەکە بانگهێشت دەکران بۆ ڕۆژوو گرتن بۆ ماوەیەك بەر لەوەی پەیکەرە پیرۆزەکە بخۆن، کاهینەکەش لەکاتی خواردنەکەدا هەندێك دەستەواژەی جادوویی دەگوتەوە بۆ ئەوەی پەیکەرە خوراوەکە بکاتە خوداوەندێکی ڕاستەقینە.

ئەگەر جادوو بەئەفسانە دەستی پێکردبێت، بەزانست تەواو دەبێت، بەهەزاران بیروباوەڕی سەیر وەك دەرەنجامی بیرۆکەیەکی ڕۆحانیی کۆن سەریان هەڵداوە، دواتر نوێژو توقووسی سەیرو سەمەرەیان لێکەوتۆتەوە، ئەوەتا هۆزی کۆکی ورەی ڕۆڵەکانی خۆی دەوروژانند بۆ کوشتار بەوەی لافی ئەوەی لێدەدا کەئەو دوژمنانەی دەیانکوژن لەو دنیادا دەبنە کۆیلەیان، بەلام لەبەرامبەریشدا دەبینیت هەر تاکێکی هۆزی بانتۆ ئەگەر دوژمنێکی خۆی بکوشتایە، سەری خۆی پاك دەتاشی‌و سەری بەپشقلی بزن سواغ دەدا، بۆ ئەوەی ڕۆحی مردوەکە نەگەڕێتەوە بۆی‌و زەفەری پێ نەبات، لەوەشە هەموو هۆزە سەرەتاییەکان بڕوایان بەکاریگەریی نەفرەت‌و چاوی پیس هەبێت، ئوستراالییەکان هەرگیز گومانیان لەوە نەکردووە کەنەفرەتی جادووبازێکی بەتوانا نەفرەت لێکراوەکە لەناو دەبات با لەدووری سەد میلیشەوە بێت، باوەڕهێنانیش بەجادوو لەیەکەمین قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤەوە دەستی پێکردووەو هەرگیزیش لەمرۆڤ نەبۆتەوە، پەرستنی بت‌و شتی تری خاوەنی هێزی جادوویی وەك تەمیمەکان (نیمچە بتەکان) لەخودی جادوو خۆی کۆنترن‌و ڕەگیان لەناخی مرۆڤەکاندا داکوتراوترە، لەکاتێکیشدا کەئەو نیمچە بتانە ناوچەی هێزی تایبەت بەخۆیان هەیە، واتە هەریەکێکیان کاریگەریی تەنها بەسەر لایەنێکی دیاریکراوەوە هەیە، بۆیە دەبینیت هەندێك لەگەلان باری خۆیان زۆر قورس کردووە هەتا هەمیشە تەواو ئامادەبن بۆ هەر پێشهاتێك کەڕۆژگار بەرەوڕوویان دەکاتەوە، نوشتەش تەنها شێوەیەکی دڕەنگ دەرکەوتووەو نموونەیەکی هاوچەرخی بت یان هاوشێوەکانێتی لەو شتانەی هێزی جادووییان هەیە، ئەوەتا نیوەی دانیشتوانی ئەوروپا ملوانکەو گوارە یان تەمیمە بەخۆیانەوە دەکەن بۆ ئەوەی لەشتێکی دیاریکراو بیانپارێزێت یان هاوکارییەکی هێزی سەروو سروشتیان بۆ فەراهەم بکات. مێژووی ژیار لەهەر هەنگاوێکی ڕۆشتنیدا ئەوەمان نیشان دەدات کەچەندە توێکڵی ئەو ژیارە تەنك‌و لاوازەو چۆن ژیارەکەمان لەلێوی لێڕەوارێکدایە لەسەر دەمی گڕکانێك

کەگروکلّپەی خامۆش نابێت، گروکلّپەی درندەیەکی سەرەتایی و ئەفسانەگەری و نەزانییەکی شاردراوە، ژیاری هاوچەرخ تەنها ڕووپۆشێکە دراوەبە سەر لوتکەی چاخەکانی ناوەڕاستداو ئەو چاخانەی ناوەڕاستیش هەر ماون و هەر دەمێنن.

فەیلەسووف هیچی لەتواناداا نییە قایل بوون نەبێت بەو هەژارییەی مرۆڤ بۆ پارمەتیی هێزەکانی سەرووو سروشت کەدڵنیایی ببەخشن بەناخی، دڵنەوایی خۆیشی بەوە دەداتەوە کەدەزانێت ئەدەبی شانۆو زانست لەجادووبازییەوە سەریان هەڵداوە، هەروەك چۆن شیعر لەڕێبازی ڕۆحانییەتەوە سەری دەرهێناوە، فرایزەر بەکەمێك زیادەڕەوییەوە کەبۆ داهێنەرێکی بەهرەمەندی وەك ئەو سەیر نییە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوەو دەڵێت: "هەموو سەروەرییەکانی زانست ڕەگیان دەگەڕێتەوە بۆ پڕوپوچییەکانی جادوو، چونکە هەر جارێك جادووباز لەجادووەکەیدا نوشوستی بهێنایە کەڵکی لەو نوشوستەی وەردەگرت بۆ دۆزینەوەی یاسایەك لەیاساکانی سروشت، لەکردەکانی خۆیداو بیویستایە دیاردەیەك بخوڵقێنێت پشتی بەهاوکاری هێزە سروشتییەکان دەبەست، پاشان ئامرازە سروشتییەکان کەم کەم تای خۆیان زاڵکرد، ئەگەرچی جادووباز هەردەم ئەو ئامرازانەی سروشتی بۆ خۆی دەشاردەوە بۆ ئەوەی پلەو پایەگەی لای خەڵك لەق نەبێت، تا ئەوەندەی بیتوانیایە بیان شارێتەوە، بەڵکو ئەو دیاردەیەی دەیخوڵقاند دەیگەڕاندەوە بۆ ئەو جادووەی لەهێزە لەڕادەبەدەرەکانی سروشتەوە وەریگرتووە -ئەمەش لەخووی خەڵکی ئەم سەردەمە دەچێت کەچاکبوونەوەی سروشتی نەخۆش دەگێڕنەوە بۆ ڕەچەتەو حەپی جادوویی، بەو جۆرەش جادوو بوو کە پزیشکی و دەرمانسازی و زانای کانگاکان و زانای گەردووناسی بۆ بەرهەم هێنایەن.

بەڵام ڕێگەی نێوان گەردووناس و جادووباز زۆر کورتترە لەڕێگای نێوان جادووبازو هەر بوارێکی تری زانست، چونکە کاتێك توقووسەکانی ئایین زۆر بوون و ئاڵۆزتر بوون، کەسی ئاسایی چیدی نەیدەتوانی هەمووی پێکەوە هەرس

بکاتو بایەخ بەهەمووی بدات، لێرەدا چینێکی تایبەت هاتنە ئاراوە کەزۆربەی کاتی خۆیان بۆ کاروباری ئایینیو گردوکۆمەڵە ئایینییەکان تەرخان دەکرد، کاهینیش ئیدی بەو پێیەی جادووبازە، بەهۆی ئەو توانایەوە کەهەیەتی بۆ سەرسامکردنی رۆحو وەرگرتنی سروشو ئاراستەدان بەنزا وەرگیراوەکان، بوو بەنزیکترین کەس لەویستی رۆحەکانەوە، بەجۆرێك کەئیتر دەیتوانی ئەو ویستە بگۆڕێت بۆ هەر شتێك کەڵك بەمرۆڤ بگەیەنێت، لەکاتێکیشدا ئەم جۆرەی زانستو پسپۆری بەبۆچوونی خەڵکانی سەرەتایی گرنگترین جۆرەکانی زانستو پسپۆڕی بوو، پاشانیش لەکاتێکدا پێیان وەهابوو هێزە لەڕادەبەدەرەکانی سروشت لەهەر وەرچەرخانێکی سەر رێگادا کاریگەرییان بەسەر ژیانی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە هێزی پیاوانی ئایین هاوتای هێزی دەوڵەت بۆوە، کاهینیش، یان قەشە، هەر لەکۆنترین سەردەمەوە هەتا تازەترینیان بوو بەرکابەرێکی سەربازی جەنگاوەر لەجڵەوگرتنی خەڵك بالکێشان بەسەریاندا، هەتا وای لێهات ئەو دوو تیمە بەسەرە جڵەوی خەڵکیان دەگرت، بۆ نموونەش ئەوەمان بەسە باسی میسر یان دەوڵەتی جوولەکە یان ئەورووپای چاخەکانی ناوەڕاست بەنموونە بکەین.

کاهین ئایینی بەخولقاندن نەخولقاندوە، بەڵام تەنها بۆ مەبەستەکانی خۆی بەکاری هێناوە، وەك چۆن سیاسەتمەدار پاڵنەرە خۆرسکەکانی مرۆڤو نەریتەکانی دەقۆزێتەوە، بیروباوەڕی ئایینی لەدرۆو دەلەسەو گەمەی کەهەنووتییەوە سەری دەرنەهێناوە، بەڵکو لەخۆرسکی مرۆڤەوەو لەو پرسیارانەی مرۆڤەوە هاتوە کەتەواو نابنو لەو ترسو دڵەڕاوکێو هیوای هەستی گۆشەگیرییە کەوتۆتەوە کەمرۆڤ لەگەڵیاندا دەژی، بەڵێ کاهین زیانی بەخەڵك گەیاندوە بەوەی ئەو شتە پڕوپووچانەی هێشتۆتەوە وەك خۆیانو چەند بوارێکی دیاریکراوی مەعریفەی بۆ خۆی پاوانکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیداوە ئەو ئەفسانانەی هەبوون لەچوارچێوەیەکی بەرتەسکدا بەگیریان بهێنێت، زۆر جاریش خەڵکی ناچار کردووە لەو شتانە گەڕێن، هەر ئەویش

مرۆڤـــی لەســـەرەتاوە فێـــری ڕەوشـــت جـــوانیو فێربـــوون کـــردووە، وەك عەمبارخانەیەكو ئامرازێکی پەیوەنـدیش وەهابووە بـۆ کەلەپووری کـەلتووریی مرۆیی کەهەمیشە لەزیادبووندایە، دڵنەواییەکیش بووە بۆ کەسی لاواز کەبـەهێز چەوساندوویەتییەوەوو هیچیشی پێنەکراوە بەرامبـەری، هەروەك کاریـشی کـردە بووە بۆ هاوکاریکردنی ئایین لەوەدا کەخۆراك بداتە هونەرەکانو پایە بۆ ئیتیکە مرۆییـەکان دابڕێـژێت، جـا ئەگـەر خـەڵك کاهینێکیـان نەبوایـە ئـەوە خۆیـان دانەیەکیان بۆ خۆیان دادەتاشی.

## ٤ـ ئەرکی ئیتیکیی ئایین

## ئایینو حکومەتەکان – قەدەغەکراوە سێکسییەکان – دەرەنگ کەوتنی ئایین – گۆڕانکارییە عەلمانییەکان

ئـایین بـەدوو ئـامرازی بنـەڕەتی دەبێتــە کۆڵەکـەی ئیتیـك، ئـەوانیش ئەفـسانەکانو حـەرامکراوەکانن، چـونکە ئەفـسانەکانن کـەبڕواهێنان بـەهێزی سەرووسروشت دروست دەکـەن، دواتـریش هـەر ئـەو بڕوایـە مانـەوەی چـەند جۆرێکی ڕەفتار مسۆگەر دەکات کەکۆمەڵگە دەیەوێت بمێننـەوە، (یـان کاهینـەکان ئەوەیان دەوێت)، ئـەو پاداشـتەی تـاك لـەئاسمانی داوا دەکاتو ئـەو سزایەی لێـی دەترسێت، هەر ئەو دوو شتە ناچاری دەکـەن ملکەچی ئـەو کۆتو بەندانـە بێت کـەئاغاکانی یـان کۆمەڵگاکـەی دەیـسەپێنن بەســەریدا، مــرۆڤ بەسروشــتی ڕاستەقینەی خـۆی بوونـەوەرێکی گوێڕایـەڵی ناسکی پـاك نییـە، شتێکیش نییـە بەئەنـدازەی تـرس لەخوداوەنـد (دوای ئـەو زوڵمـەی تـاك لەکۆنـدا تێـی کـەوتبوو کەبووە هۆکاری سەرهەڵدانی ویژدان لەناخیدا) مرۆڤی ملکەچی ئـەو لایەنانـەی چاکەخوازی کردبێت کەبـەهیچ شێوەیەك لەگـەڵ سروشـتی خۆیـدا نـاگونجێن، ئەوەتا موڵکداریو هاوسەرگیری تاڕادەیـەك لەسـەر سزا ئایینییـەکان ڕاوەستاونو

لەهەر قۆناغێکدا گومان لەئایین دروست بێت هێزو توانای ئەو دوو سیستەمەش ڕوو لەکزی دەکات، بگرە خودی حکومەت لەخۆیدا گەگرنگترین ئامرازی کۆمەڵایەتییە مرۆڤ دروستی کردبێت‌و لەهەمان کاتیشدا دوورترین ئامرازە لەسروشتی ڕاستەقینەی مرۆڤەوە. ئەو حکومەتە خۆی زۆر جار پەنای بردۆتە بەر ترس لەخوداو پەنای بردۆتە بەر کاهینەکان، وەك ئەوەی هیرتەقییە زۆر بلیمەتەکانی وەك ناپلیۆن‌و مۆسۆلینی دەیانکرد گەمزۆر زوو ئەم ڕاستییەیان زانی، هەر لێرەشەوەیە کەهەر جارێك دەستوورێك دەنوسرێتەوە ئارەزوویەك بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئایینی سەرهەڵدەدات، جا ئەگەر هێزی سەرۆکێکی سەرەتایی لەڕێی جادووبازی‌و فالگرتنەوە زیادی کردبێت، ئەوە حکومەتەکەی ئێمە برێك هێزی لەوەوە دەست دەکەوێت کەساڵانە دان بەخوداوەندی کۆچبەراندا دەنێت.

خەڵکی پۆلینیزیا وشەی تابۆیان (کەبەمانای یاساغ کردن دێت) بۆ ئەو شتانە بەکارهێناوە کەئایین حەرامی کردوون، هەر کەکۆمەڵگە سەرەتاییەکانیش برێك پێشکەوتن، ئەم حەرامکراوە ئایینییانە پلەوپایەیەکیان پچڕی کەهەر خۆیان ئیدی لەسایەی ژیاردا شوێنی یاساکانیان گرتەوە. چۆنێتی حەرامکردنیش هەمیشە ئاڕاستەیەکی نێگەتیڤانەی هەبوو: هەندێك کردەو هەندێك شت وەك (پیرۆز) یان وەك (گڵاو) کە ڕادەگەیەنران، هەردوو دەستەواژەکە لەبنەڕەتدا بەیەك ئاڕاستە خەڵکیان لێ وریا دەکرایەوە، ئەویش ئەوەبو کەئەو کارو کردەوانە نابێت کەس نزیکیان بکەوێت، بۆ نموونە دەست لێدانی دارەمەیتی پادشا حەرامکراو بوو. دەگێڕنەوە کاتێك عوزا دەستی بۆ ئەو دارەمەیتە بردوە بۆ ئەوەی نەهێڵێت بکەوێت بروسکەیەك لێی داوە. دیۆدۆرس-یش لەوە ئاگادارمان دەکاتەوە کەمیسرییە کۆنەکان لەکاتی برسێتیدا گۆشتی یەکتریان خواردوە، چونکە ئەوەیان بەلاوە باشتر بووە هەتا دەستدرێژی بکەنە سەر ئاژەڵێکی حەرامکراو کەتەوتەمی هۆز بووە لەلایان. لەزۆربەی گروپە

سەرەتاییەکاندا ژمارەیەکی زۆر لەو حەرامکراوانە هەن، وشەو ناوی دیاریکراو دەبوو هەرگیز نەگوترێن، رۆژو وەرزی دیاریکراو هەبوون کەحەرامکراو بوونو کوشتن تیایاندا نەدەشیا، هەموو ئەو زانیاریو بێئاگاییانەی خەڵکانی سەرەتایی لەبارەی خۆراکەوە هەیانبوو لەشێوەی چەند حەرامکردنێکدا خۆی دەرخستوە کەخەڵك بەسەر هەندێك جۆری خۆراکدا سەپاندوویانە، ئەوان ئەوەندەی لەرێگەی ئایینەوە بنەماکانی تەندروستی فێردەکران ئەوەندە لەرێگەی زانستەوە یان لەرێگەی پزیشکی زانستییانەوە نەیان دەخوێند.

خۆ ژن لەلای سەرەتاییەکان گرنگترین شتێك بوو کەناوە ناوە حەرامو گڵاو دەکراو بەهەزاران ئەفسانەی لەسەر دەهۆنرایەوەو دەبووە ترسناكو گڵاو. دانەری ئەو ئەفسانانە لەسەرانسەری جیهاندا مێردی سەرکەوتوو نەبوون لەژیانی ژنو مێردایەتییاندا، چونکە هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کەژن سەرچاوەی هەموو خراپەکارییەکانە. ئەم بۆچوونە هەر پەیوەست نییە بەهەردوو ئایینی مەسیحیو جوولەکەوە، بەڵکو لەوانیش رەت بووە بۆ سەدان ئەفسانەی بت پەرستانیش، وردترین حەرامکردنیش تایبەتە بەژنی حەیزگرتوو، جا هەر کەسێك یان هەر شتێك لەو ماوەی حەیزەدا بەر ژن بکەوتایە ئەگەر مرۆڤ بوایە چاکەی دەسڕدرایەوەو ئەگەر کەرەستە بوایە کەڵکی نەدەما، هۆزی ماکووزی کەخەڵکی گیانای بەریتانین خۆشتنیان لەژنە حەیزگرتووەکان حەرام کردبوو لەترسی ئەوەی نەوەك ئاوەکەیان ژەهراوی ببێت، هەروەك لەو ماوەیەدا نەیاندەهێشت بچنە ناو دارستان نەوەك مارەکان ئاڵوودەیان بنو لەئاڵوودەییدا گازیان لێبگرن، تەنانەت منداڵبوونیش گڵاو بووە، دەبوو دایك پاش منداڵبوون لەژمارەیەکی زۆر لەتوقووسی ئایینیدا گڵاو خۆی دەربکات، پەیوەندی سێکسیش لەناو زۆر هۆزدا هەر حەرام بووە، نەك تەنها لەماوەی حەیزدا، بەڵکو لەماوەی سکپڕیو شیردانیشدا، رەنگیشە ئەم حەرامەیان دەستکردی خودی ژن بوبێت لەبەر ئەو ئەقڵە ساغەی هەیانبووەو چونکە لەو دەمەدا هەندێك پشوو و

خۆپارێزییان پێویست بووە ، بەڵام ڕەچەڵەکی شتەکان زوو لەبیر دەچنەوە، ببینە ژن کاتێك بەخۆی دەزانێت بۆتە گلاو، دواجاریش مل بۆ بۆچوونی پیاو دەدات‌و هەست بەشەرم دەکات لەوەی لەحەیزدایە، بگرە لەوەی سکی پڕە، هەر لەو حەرامکردنانەوە ئابڕوو و هەستکردن بەگوناه سەری هەڵدا، هەروەها ئەو تێڕوانینە سەری هەڵدا کەپەیوەندی سێکسی شتێکی گلاوەو سکگوشی‌و زگورتێتیی ڕاهیبەکان‌و لەدوای هەموو ئەوانەشەوە جلەوگرتنی ژنان سەری هەڵدا.

ئایین بناغەی ئیتیك نییە، بەڵام پشتگیرییەکە بۆی، چونکە دەکرێت مەزەنەی ئەوە بکەین کە بەبێ ئایینیش ئیتیك بوونی هەبێت، شتێکی دەگمەنیش نییە کەئیتیك گەشەی خۆی بکات‌و بەرەو پێشەوە بچێت‌و ئایین لەشوێنی خۆیدا بمێنێتەوەو گوێی نەداتێ، یان بەرەنگارییەکی سەختی ئەو پێشکەوتنەی بکات، ئەوەتا لەگروپە کۆنەکانداو لەهەندێك گروپی ئەم دواییەشدا، ئیتیك وەك دەردەکەوێت تەواو لەئایین سەربەخۆ بووە، لەحاڵەتی لەم چەشنەشدا ئایین خۆی هەڵناقورتێنێتە ڕێساکانی ڕەفتار، بەڵکو تەنها گرنگی دەدات بەجادووبازی‌و توقووس‌و قوربانی سەربڕین، پیاوی باشیش ئەو کەسەیە کەگوێڕایەڵانە ئەرکەکانی ئایین جێبەجێ بکات، بەوابەستەیی‌و دڵسۆزیی خۆیشییەوە بەهێزی بکات، ئایینیش بەشێوەیەکی گشتی سەرپەرشتیی چاکەی ڕەها ناکات، چونکە شتێك لەئارادانییە چاکەی ڕەها بێت، بەڵکو تەنها چاودێری ئەو پێوەرانەی ڕەفتار دەکات کەبەگوێرەی هەلومەرجی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی خۆیان تۆکمەکردووە، ئەویش هەر وەك یاسا ئاوڕ لەڕابردوو دەداتەوە بۆ هەڵێنجاندنی حوکمەکانی، ئاساییشە هەر کاتێك هەلومەرج گۆڕاو ئیتیك لەگەڵی گۆڕا ئەم (ئایین) لە ڕێ دوابکەوێت، ئەوەتا گریکەکان لەگەڵ پێشکەوتنی سەردەمدا فێری ئەوە بوون ڕابواردن لەگەڵ مەحرەمەکاندا بەشتێکی قێزەون سەیر بکەن، ئەگەرچی هێشتا ئەفسانەکانیان ئەو خوداوەندانە پیرۆز دەکەن کە

کاری وەها دەکەن، مەسیحییەکانیش کار بەسیستمی یەك ژنی دەکەن لەکاتێکدا ئینجیلەکەیان فرەژنی حەڵاڵکردووە، یان سیستمی کۆیلایەتی بەتەواوی قەدەغەدەکەن وێڕای ئەوەی ئاینپەروەرەکان پشتبەستوو بەچەندین بەڵگەی ڕەتنەکراوەی ئینجیل بەرگری لەو سیستمە دەکەن، هەر لەم چەند ڕۆژەی ئێمەشدا ئەوەتا کڵێسا وەك پاڵەوان لەشەڕدایە بۆ دارشتنی پاسایەکی ئیتیکی کەشۆڕشی پیشەسازی بەتەواوی نوشوستێکی پێ هێناوە هیچ گومان هەڵناگرێت، لەبەرئەوەی فاکتەرە زەمینییەکان (وەزعییەکان - پێچەوانەی ئاسمانییەکان) دواجار زاڵ دەبن، ئیتیکیش دەبێت وردە وردە خۆی لەگەڵ پێشهاتە ئابوورییەکاندا بگونجێنێت، ئەوسا ئایینیش دەکەوێتە جووڵە بەناچاری‌و خۆی لەگەڵ ئیتیکە نوێیەکاندا دەگونجێنێت، ئەرکی ئیتیکیی ئایین زیاتر ئەوەیە کەپارێزگاری لەبەها کۆنەکان بکات، زیاتر لەوەی بەهای نوێ بهێنێتە ئاراوە.

هەر لێرەوەیە کەنیشانەکانی قۆناغە باڵاکانی هەر ژیارێك ئەوەیە کەجۆرێك لەئامێتەبوون لەنێوان ئایین‌و کۆمەڵگادا دەبینرێت، ئایین بەهاوکاری جادوویەك پێشکەش بەخەڵکی دەکات دەکەوێتە سەرسامکردن‌و شپرزەکردنی خەڵك‌و دواتر دەگاتە چڵەپۆپەی سەروەری خۆی لەڕێی پتەوبوونی یەکانگیریی نێوان ئیتیك‌و بیروباوەڕو پێشکەشکردنی ئەو یەکانگیرییە بەخەڵکەکە، ئەم یەکانگیربوونەی باوەڕو ئیتکیش دەبێتە مەزنترین پەنا بۆ سیاسەتیش‌و بۆ هونەریش، ئاکامیش لەشەڕێکی دۆڕاودا بۆ بەرگریکردن لەڕابردوویەکی نەگەڕاوە وەك هەر خودکوژێك لەناودەچێت، ئەمەش چونکە تا چەندە مەعریفە پێش بکەوێت، یان گۆڕانکارییەکی بەردەوامی بەسەردا بێت، تا ئەوەندە بەرەوڕووی ئەفسانەو لاهوت دەبێتەوە کەزۆر بەخاوییەوە بەرەو پێشەوە دەچن، خاووخلیچییەك کەبەرگەی ناگیرێت، ئەوسا خەڵك وەك کۆت‌و زنجیری قورس‌و وەك بەربەستی قێزەون هەست بەسانسۆری پیاوانی ئایین دەکەن بەسەر هونەرو ئەدەبەوە. مێژووی فیکری لەقۆناغێکی وەهادا دەچێتە قاڵبی ململانێی نێوان زانست‌و ئایین، ئەو

سیستمانەش کەلەسەر دەستی پیاوانی ئایین دادەمەزرێن وەك یاساو سزا، پەروەردەو ئیتیك، هاوسەرگیریو تەلاق، ئەوانە ئارەزووی خۆقوتارکردنیان دەبێت لەسانسۆری ئایینو دەخوازن ببنە سیستمگەلێکی دنیایی، تەنانەت هەندێك جار ئایین وەك لادەر لێیان دەڕوانێت، چینە رۆشنبیرەکانیش لەگەڵ دەرکەوتنیاندا لاهوتی کۆن پێشنیار دەکەن، دواترو (پاش کەمێك دوودڵی) یاسایەکی نوێی ئیتیك پێشنیار دەکەن، ئەو کاتە فەلسەفەو ئەدەب دەبنە نەیاری پیاوانی ئایین، بزووتنەوە رزگاریخوازەکەش گەشە دەکات بەئاراستەی پەرستنی شێلگیرانەی ئەقڵ.. لەم حاڵەتانەدا بزووتنەوەی رزگاربوون لەئایین وەك چۆن مرۆڤ لەکاتی هیوا لەدەستداندا تووشی ئیفلیجی دێت ئەویش بەرامبەر هەموو بیروباوەڕو بیرۆکەیەك تووشی گێژبوونو خاوبوونەوە دێت، ڕەفتاری مرۆڤەکانیش بەکێشانەوەی کۆڵەکەکانی ئایین تووشی دارمان دێتو دەبێتە جۆرێك لەبێ سەرەوبەرەیی ئەبیقۆرییانە، بگرە خودی ژیان، ئەو ژیانەی بڕوایەکی تێدا نەماوە دڵنەوایی بداتەوە، ئەو ژیانە دەبێتە بار بەسەر شانی هەژارێکەوە کەهەست بەهەژاری خۆی بکاتو بەسەر شانی دەوڵەمەندێکەوە لەدەوڵەمەندیی خۆی بێزار بوبێت، دواجاریش کۆمەڵگە بەخۆیو بیروباوەڕە ئایینییەکەیەوە پێکەوە دەکەون بەزەویدا، تەواو وەك رۆحو جەستە.. بەڵام دیسان ئەوەندە نابات لەژێر باری ئەو قورساییەدا ئەفسانەیەکی تر لەناو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە، ئەفسانەیەك کەهیواکانی مرۆڤ لەقاڵبێکی نوێدا دادەڕێژێتەوە، ورەیەکی نوێ دەکاتەوە بەبەر هەوڵەکانی مرۆڤدا، ئەوسا پاش چەندین سەدە لەبێ سەرەوبەرەیی ژیارێکی نوێ سەرهەڵدەداتەوە.

# باسی پێنجەم
# توخمە عەقڵییەکانی ژیار

## بابەتی یەکەم
## ئەدەبەکان

### زمان – ڕەچەڵەکە ئاژەڵییەکەی – بنچینە مرۆییەکەی – گەشەکردنی – ئاکامەکانی – پەروەردە – لاساییکردنەوە – نووسین – هۆنراوە

وشە سەرەتای مرۆڤ بوو، چونکە بەوشەوە مرۆڤ بوو بەمرۆڤ، خۆ ئەگەر ئەم دەنگە سەیرانە نەبوونایە کەپێیان دەڵێین (ناوە گشتییەکان) نەماندەتوانی بیروهۆشمان لەناو پێکهاتە بچووکەکان یان ئەزموونە بچووکەکان دەربکەین، ئەوانەی مرۆڤ لێیان دەدوێت یان لەڕێی هەستەکانییەوە، بەتایبەتی هەستی بینین، پێیان دەزانێت، بەلای زۆریشەوە ئەو ناوە گشتییانەی شتەکان نەبوایە بیروهۆش نەیدەتوانی جۆرەکان وەك شتێکی جیاواز لەپێکهاتە بچووکەکانی بناسێت، یان خەسڵەتەکان وەك شتێکی جیاواز لەو شتانە بناسێت کەهەڵگریانن، یان شتەکان بەجیا لەخەسڵەتەکانیان بناسێت، ئەگەر ئەو وشە گشتییانە نەبوونایە کەناوی جۆرەکانن مرۆڤ دەیتوانی بیر لەم مرۆڤ یان ئەو مرۆڤ بکاتەوە، بەڵام نەیدەتوانی بیر لەمرۆڤ بەگشتی بکاتەوە، چونکە چاو جۆر نابینێت، بەڵکو پێکهاتە بچووکەکانی دەبینێت. مرۆڤایەتیی ئەو کاتە دەستی پێکرد کەدووڕەگێك، نیوەی مرۆڤو نیوەی تری ئاژەڵ، لەئەشکەوتێکدا یان لەپاڵ دارێکدا چوارمشقی لێی دانیشتو کەوتە سەر خوراندن بۆ ئەوەی یەکەمین ناو

لەیەکەمین ناودار بنێت، یەکەم هێمای دەنگی کەئاماژە بێت بۆ کۆمەڵێك شتی لەیەکچوو، وەك ناوی (ماڵ) کەهەموو ماڵەکان دەگرێتەوە، یان مرۆڤ کەهەموو تاکەکانی مرۆڤەکان دەگرێتەوە، یان تیشك بۆ هەر درەوشانەیەکی سەر وشکانی یان سەر ئاو، ئیدی لەو کاتەوە گەشەی مێشکی مرۆڤ کەوتە سەر رێگایەك کەکۆتاییەکی تیایدا بووەستێت، چونکە وشە بۆ بیرکرنەوە وەك ئامراز وەهایە بۆ کارکردن، بەرهەمیش تارادەیەکی زۆر پشت بەگەشەی ئامراز دەبەستێت[1].

جا ئەگەر وێناکردنی ئێمە بۆ سەرەتای شتەکان لە (حەدس) یان لەخەملاندن تێپەڕ نەکات، کەواتە بۆمان هەیە جڵەوی خەیاڵمان بەربدەین بۆ وێناکردنی سەرەتای ئاخافتن، دەشێت یەکەمین شێوەی دەرکەوتنی زمان — دەکرێ پێناسەی زمان بەوە بکەین کەپەیوەندییەك بێت لەرێگەی هێماوە- هاوارێکی سۆز بێت لەنێوان ئاژەڵێك و ئاژەڵێکی تردا، دیارە لەشێوەی ورپاکردنەوەو ترسدا، لەبانگی دایکدا بۆ بێچووەکانی، لەزیکەزیك و قیرەقیڕێکدا کەئاژەڵ وەك دەربڕینی خۆشحاڵیی یان جووتبوونی لەگەڵ رەگەزەکەی تر یان کۆبوونەوەی لەگەڵ هاوەڵەکانی لەم دار بۆ ئەو دار دەریدەکات.. لەهەموو ئەوانەدا هەست بەهەنگاوێکی سەرەتایی دەکەیت کەئاژەڵ هەوڵی تێپەڕاندنی دەدات و مرۆڤیش گەیشتۆتە چڵەپۆپەی ئەو هەوڵانە، چڵەپۆپەی ئاخاوتن. کچێکی حوشی دۆزرایەوە لەگەڵ ئاژەڵانی ناو جەنگەڵێکی نزیکی شالۆن لەفەرەنسا دەژیا، ئەو کچە ئاخاوتنەکەی تەنها چەند قیژەو منگەمنگێك بوو کەزۆر ناخۆش بەر گوێ دەکەوتن، ئەو دەنگە زیندوانەی لەجەنگەڵەکانەوە دەردەچن کەس رەنگە هیچ واتایەکیان نەبێت لەگوێی ئێمەدا کەبەژیار بووە، ئێمە لەم بارەیەوە لەو سەگە خۆ بەفەیلەسووفزانە دەچین، ریکێ، کەلەبارەی بەرێز بارگرێت‌ەوە دەڵێت: "هەموو دەنگەکانی من مانایان هەیە، بەڵام ئاغاکەم شتی بێ مانا لەدەمییەوە دەردەچێت".. ویتمانو کرایگ سەرنجی ئەو پەیوەندییە سەیرەیان دابوو کەلەنێوان قیژەکانی کۆترو کارەکانیدا هەیە،

دیوپۆنت-یش توانی دوانزە دەنگ لەیەك جیا بکاتەوە کەمریشك‌و کۆتر بەکاریان دەهێنن، هەروەها پانزە دەنگی سەگ‌و بیست‌ودووی ئاژەڵە شاخدارەکانیش، گارنەر-یش ئەوەی هەست پێکرد کەمەیموونەکان لەو ژاوەژاوەیاندا کەتەواو نابێت لانی کەم بیست دەنگ‌و کۆمەڵێك ئیشارەتیان هەیە، لەو زمانە هەژارانەوەو پاش گەشەیەکی کەم قۆناغ ئەو سێسەد وشەیە هاتنەئاراوە کەبەشی هەندێك هۆزی مرۆیی سادە دەکەن[1].

وەك دیاریشە لەبیروراگۆڕینەوەی چاخە کۆنەکاندا ئاماژەکان بایەخی لەپێشترو ئاخاوتن پێگەی دوهەمی هەبووە، سەرنجی ئەوەش دەدرێ کەئەگەر ئاخاوتن مەرام نەپێکێت، سەرلەنوێ زمانی ئاماژە دێتەوە پێشەوە. لەهەندێك هۆزە هیندییەکانی ئەمریکای باکووردا کەبرێکی لەژمارەنەهاتوو شێوە زمان بەکار دەهێنن، بووك‌و زاوایەکی سەر بەدوو هۆزی جیاواز کەیەکدەگرن زیاتر بەئاماژە نەك بەقسە بیرورا دەگۆڕنەوەو لەیەکتری حاڵی دەبن، لویس مۆرگان بووك‌وزاوایەکی دەناسی بەدرێژایی سێ ساڵ بەئاماژەی بێدەنگ یەکترییان دەدواند. حاڵی بوون لەیەکتری لەرێی ئامەژەوە لای هەندێك هۆزی هیندی ئەوەندە گرنگ بوو کە وایدەکرد تاکەکانی هۆزی ئەرەپاهۆ —وەك زۆر گەلی مۆدێرن- نەتوانن لەتاریکیدا قسەبکەن[2]. ڕەنگیشە یەکەمین دەستەواژەکانی مرۆڤ کۆمەڵێك هاواری دەربڕینی سۆز بن وەك هەندێك ئاژەڵ، دواتر دەستەواژەکانی ئاماژە هاتنەئاراوە کەلەتەك ئاماژەی جەستەییدا ئاراستەیان پێ دیاری دەکرا، دواتر دەنگی لاساییکردنەوە پەیدا بوون کەلەکاتی شیاودا دەردەکران بۆ گوزارشت لەو شت‌و کردەوانەی دەکرا دەنگیان دەربهێنرێتەوە، تائێستاش هەموو زمانەکانی سەر زەوی لەم جۆرە دەستەواژانەیان تێدایە کەدەنگی دەربڕینەکانیان لەدەنگی شتەکان یان کردەکان دەچێت، وێڕای ئەو هەزاران ساڵە پڕ گۆڕانکاری‌و گەشانەی بەسەر زماندا تێپەڕیون، وەك: نەڕە، چپە، ورتەورت، قاقا، ئاخونۆف، زیکەزیك..تاد، لای هۆزی تەکۆنا لەبرازیلی کۆن دەستەواژەیەك هەیە لاساییەکی

تـەواوی ناونراوەکـە دەکاتـەوە، ئـەویش کـەئاماژە بـەکرداری (دەپـژمێت) دەکـەن دەڵـێن (هایتـشو)[5]، ڕەنگیـشە ئـەم سـەرەتایانەو هاوشـێوەکانی بناغـەی یەکـەمین وشـەکان بـن لەهـەمـوو زمانەکانـدا، ڕێنـان هـەموو دەسـتەواژە عیبرییـەکانی لەپێنجـسەد وشـەی بنەڕەتیـدا هێـشتەوەو سـکێت-یـش نزیکـەی هـەموو دەستەواژەکانی ئەوروپای بردەوە سەر دەوروبەری چوارسەد وشەی بنەڕەتی.

وەهـاش مـەزانن مەرجـە زمـانی گەلـە خۆڕسکەکان سـەرەتایی بـن، ئەگـەر مەبەسـتمان لەسـەرەتایی لـەم بارەیـەوە مانایـەك بێـت لـەماناکانی سـادەیی لەپێکەوەناندا، بەڵێ زۆریان سادەن لەدەستەواژەکانیانداو لەبیناکردنیانـدا، بـەڵام هەندێکیان بینایەکی ئاڵۆزو وشەیەکی زۆریان هەیە وەك زمانـەکانی ئێمـە، بگرە لـەڕووی پێکهاتنـەوە لـەزمانی چینی بـاڵاترن[7]، لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەموو زمانـە سەرەتاییەکان هێندەی نامێنێت لەسنووری هەستیو وردیلەییـدا قـەتیس بمێـنن، بەشـێوەیەکی گـشتی هـەموویان لـەڕووی نـاوە گـشتیو ڕووتەکانـەوە هـەژارن، دانیشتوانی ڕەسەنی ئوستراليا ناوێکیان هەیە بۆ کلکی سەگو ناوێکی تریان هەیە بۆ کلکی مانگـا، بـەڵام لەزمانەکەیانـدا ناوێـك نییـە بـۆ کلـك بەگـشتی[8]، خـەڵکی تسمانیاش بۆ هەر جۆرێکی دار ناوێکیان هەیە بەڵام یەك وشـەیان نییـە بـۆ نـاوی دار بەگشتی، بەهەمان شێوە هیندییـەکانی چۆیتاو ناوێکیـان هەیـە بـۆ سـندیانی ڕەشو ناوێکی تر بـۆ سـندیانی سپیو نـاوێکی تـر بـۆ هـی سوور، بـەڵام ناوێکیـان نییـە بـۆ سـندیان بەگـشتی، دواتـریش بێگومـان ناوێکیـان نییـە بـۆ دار بەگـشتی، گومـانیش لـەوەدا نییـە کەچـەندین نـەوە تێپـەڕیون بـەر لـەوەی مـرۆڤ لـەناوی دیارەوە بگوازێتەوە بۆ ناوی گشتی، لەزۆر هۆزدا دەسـتەواژە نـابینرێ ئامـاژە بێـت بۆ ڕەنگەکان بەجیا لەشتە ڕەنگدارەکان، نەخێر، وشەشیان نییـە بـۆ ئاماژەکردن بەبوونە داماڵراوەکانی وەك: ئاواز، سێکس، جۆر، شوێن، ڕۆح، غەریزە، نـەقڵ، بـڕ، هیوا، تـرس، شمـەك، هەسـت.. تـاد[9]، ئـەم دەسـتەواژە داماڵراوانـە وەك دەردەکـەوێ لەگەڵ گەشەی بیروهۆشدا دروست دەبنو زۆر دەبن، چونکە پەیوەنـدیی فاکتـەرو

دەرهاویــشتە هەیــە لــەنێوان ئــەوان‌و بــیردا، پــاش دروستبوونیــشیان دەبنــە ئامرازگەلێکی یاریدەدەر بۆ وردی لەبیرکردنــەوەداو دەبنــە هێماگەلێکی نیشانەی ژیار.

کــاتێکیش دەســتەواژەکان ئــەو هــەموو خەســڵەتە تایبەتییــەیان بەخــشی بەخەڵك، بەبەخششێکی خوداوەنــدو شتێکی پیرۆز دانــران، بوونــە کەرەستــەیەك کەقاڵبــە جادوویــەکانیان لــێ دروســت بکــرێ، چــەندیش بــێ واتــا بــن زیــاتر لەبەرچــاوی خــەڵك پــیرۆز دەبــوون، تــا ئــەمرۆی ئێمــەش ئەگــەر لەنهێنییــە شاردراوەکاندا بــەکاریان بهێــنین هــەر پــیرۆزن، واتــە ئــەو کاتــەی وشــە دەبێتــە "گۆشت"، دەستەواژەکان بەتەنها ئامرازێکی بەڕوونی بیرکردنەوە نــەبوون، بــەڵکو ڕێگەیەکیش بوون بۆ چاککردنی کۆمەڵگە، چونکە نــەوەکانیان بەبەستنەوەیەکی ئــەفلاّنیی تونــدوتۆڵ پێکــەوە بەســتۆتەوە، بــەوەی ئــامرازێکی باشــتریان خــستە بەردەستیان بۆ پەروەردە کردن لەلایەکەوەو، هەمان ئــامرازیش بــۆ گواستنەوەی مەعریفەو هونەر لەلایەکی ترەوە، بەدەرکەوتنی دەستەواژەکانی زمان ئــامرازێکی نــوێ دەرکــەوت بــۆ بەیەکگەیانــدنی تاکــەکان، بەشــێوەیەك کەئاییبنزایــەك یــان بیروباوەڕێــك هــەموو تاکــەکانی کۆمــەڵگا بخاتــە نــاو بۆتەقــەی چوارچــێوەیەکی پێکــەوە گونجــاو، کــەناڵی تازەشــی کــردەوە بــۆ گواســتنەوەی بۆچــوونەکان‌و ئاڵوگۆڕکردنیان، ژیانیشی قووڵتر کردەوە، هەروەك چوارچێوەو ناوەرۆکەکەیشی فــراوانتر کــرد، جــا ئایــا داهێنــانێکی ترمــان لایــە لــەهێزو ســەروەریدا شــان بــدات لەشانی ئەو داهێنانە: داهێنانی وشەی گشتی؟

مەزنترین خەسڵەتی دەستەواژەکانی زمان —پاش فراوانکردنــی هــزر- بریتییــە لەپــەروەردە، چــونکە ژیــار ســەروەتێکی دەوڵەمەنــدە لــەماوەی ڕۆژگــارێکی زۆردا لەهونــەرو دانــایی‌و جۆرەکــانی ڕەفتــارو ئیتیــك کۆکراوەتــەوە، هــەر لــەم سامانە دەوڵەمەنــدەوە هــەر تاکێــك لەمیانــەی گەشــەیدا خــۆراك بــۆ ژیــانی ئــەقڵیی وەردەگرێت، ئەگەر ئەو کەلەپووورە مرۆییە نەوە بەنەوە نەهاتایاتە خوارێ ئەوە

ژیـــار زۆر لـــەناكاو دەمـــرد، ئێـــستاش كەنـــەمردوە فـــەرزاربارى پرۆســـەى پەروەردەكردنە.

پەروەردە سەرەتایەكی زۆر كـەمی لـەناو هـۆزە سـەرەتاییەكاندا هەیـە —وەك ئـاژەڵ-، چـونكە پـەروەردەكردن لای ئـەو هۆزانـە بـەر لەهـەموو شـتێك بریتییـە لەگواستنەوەی جۆرەكانی لێهاتوویی‌و مەشـق كـردن بەنـەوەی نـوێ بەشـێوەیەك كەسـێتیی گەلاڵـە بكـات، بـەوە پـەروەردە دەبێتـە پەیوەندییـەكی بەكـەڵك‌و تەندروست لـەنێوان زانـست‌و فێربـوون‌و فێركردنـەكانی شـێوازەكانی ژیـان، ئـەم فێركردنـە پراكتیكەییـە ڕاسـتەوخۆیە هـانی منـداڵی سـەرەتایی داوە گەشـەیەكی خێرا بكات، لەناو هۆزەكـانی ئۆماهادا كـوڕ لەتەمـەنی ١٠ ساڵاندا تاڕادەیـەكی زۆر هەموو هونەرەكانی باوكی فێـر دەبێت‌و تـەیار دەبێـت بـۆ ژیـان، لـەناو هۆزەكـانی ئەلۆت-یشدا زۆربەی جار كوڕ لەتەمەنی دە ساڵاندا ماڵ بۆ خـۆی دروسـت دەكات، هەنـدێك جـاریش هـەر لـەو تەمەنـەدا ژنـی خـۆی دیـاری دەكـات، لـەنایجیریاش منداڵان لەشەش هەتا هەشت ساڵی ماڵی باوكیان بـەجێ دەهـێڵن‌و خـانوو و كـەپر بۆ خۆیان دروست دەكەن‌و خۆیان خۆراكی خۆیان دابین دەكـەن‌و بـەدوای ماسـی‌و نێچیردا دەگەڕێن[١٠].. وەك نەریتیش پەروەردەكردن لەگەڵ دەست پێكردنـی ژیـانی سێكسیدا ڕادەوەستێت، لەبەرئـەوەش كـەخێرا پێدەگـەن خێـراش لـەگوڕ دەكـەون، لەهەلومـەرجی ژیـانی ئەوانـدا كـوڕ لـەدوانزە سـاڵیدا پێـدەگات‌و لەبیـست‌وپێنج ساڵیدا پیر دەبێت[١١]، ئەوە مانای وانییە هەمەجی ئەقڵی منداڵانەی هـەبێت، بـەڵكو مانای وایە نەپێداویستییەكانی منـداڵی مـۆدێرنی هـەبووەو نەدەرفـەتی ئەویـشی لەبەردەمـدا بـووە، وەك هـەرزەكارێكی ئـەم سـەردەمەش چـێژی لەماوەیـەكی دوورودرێـژی ژیـانی هـەرزەكاری وەرنـەگرتووە كەببێتـە دەرفـەتێك بـۆی بـۆ وەرگرتنـی تـەواوی كەلـەپووری ڕۆشـنبیری، یـان مەشـق لەسـەر جـۆرێكی زۆرتـر بكـات‌و بەشـێوەیەكی نـەرمتریش بـۆ ڕاهـاتن لەسـەر ژینگەیـەك كـەزیاترو زیـاتر لەخۆڕسك دوور دەكەوتەوەو گۆڕاوەكانی زیاتر بوبوون.

ژینگەی مرۆڤی خۆڕسك نیچمە نەگۆڕ بوو، پێویستیشی بەهێزی ژیری نەبو، بەڵكو پێویستی بەئازایەتیو بەكامڵبوونی كەسێتی هەبوو، باوكی سەرەتایی هەموو بایەخی خۆی دەدا بەبنیاتنانی كەسێتی كوڕەكەی وەك چۆن پەروەردەی نوێ هەموو بایەخی خۆی دەدا بەمەشقی هێزی ژیری، ئەو سەرەتاییە هەمیشە مەبەستی ئەوە بووە پیاو دروست بكات، نەك زانا، هەر لێرەشەوە توقووسی ئامێتەكردنی تازەهەڵكەوتوو لەناو هۆزدا سەری هەڵدا، مەبەست لەو توقووسانەی كەلە خۆڕسكەكان تیایاندا پێگەیشتنی تازەهەڵكەوتوەكانیان ڕادەگەیاندو وەك ئەندامی گروپ دانیان پێدا دەنان زیاتر تاقیكردنەوەی ئازایەتییان بوون نەك پێوانەكردنی ئاستی زانیارییەكانی، ئەركی ئەو توقووسانەش ئامادەكردنی لاوەكە بوو بۆ ناڕەحەتییەكانی جەنگو ئاكامەكانی هاوسەرگیری، لەهەمان كاتدا دەرفەتێك بوو بۆ گەورەكان كەكەمێك كاتی خۆش بەسەر بەرنو دڵخۆش بن لەرێی ئازارگەیاندن بەكەسانی تر، هەندێك لەو توقووسانە هێندە قێزەونو هەست بزوێن بوون كەبەزەحمەت دەتوانرێ سەیر بكرێنو بگێڕدرێنەوە[12]. لەناو هۆزی كەفیردا —ئەمە نموونەیەكی ئاساییە- هەموو ئەو كوڕە هەرزەكارانەی داوای ئەندامێتیی گروپیان دەكرد بەوە تاقی دەكرانەوە ڕۆژ كاری قورسیان پێدەكراو شەو دەبوو نەخەون، هەتا وایان لێدەهات لەشەكەتیدا دەبوورانەوە، بۆ ئەوەش كەبەرپرسانی تاقیكردنەوەكان لەتوندوتۆڵییان دڵنیا بن بەقامچی لێیان دەدان (ناوە ناوەو بێ بەزەییانە لێیان دەدان تا جەستەیان شەلاڵی خوێن دەبوو)، ئەوەش دەبووە هۆی كوشتنی ژمارەیەكی زۆر لەكوڕیژگەكان، بەلام گەورەكان —بەبڕوای ئێمە- وەك فەیلەسووف سەیری مەسەلەكەیان دەكرد، ڕەنگیشە بەو كردەوانە پێش هەڵبژاردنی سروشتی كەوتبنو ویستبێتیان فاكتەرێكی نوێی بۆ زیادبكەن[13]. ئەم توقووسی تاقیكردنەوانە وەك ئاسایی نیشانە بوون بۆ كۆتایی هەرزەكاریو ئامادەیی بۆ هاوسەرگرتن، بووكەكەش پێداگیریی دەكرد لەسەر ئەوەی زاواكەی

بیسەلێنێت کەبەرگەی ئازار دەگرێ. ئەو توقووسانە لای زۆربەی هۆزەکان لەسەروبەندی خەتەنەکردندا سازدەکرا، ئەوسا ئەگەر لاوەکە لەکاتی کردەکەدا بجوولایە یان هاواری بکردایە، کەسوکارەکەی لێیان دەداو بووکە ئایندەییەکەشی لێی پەشیمان دەبۆوە (کەئەمیش زۆر بەوردیو بەگرنگییەوە چاودێریی کردەکەی دەکرد)، بەو پێیەی نەیدەویست شوو بەکچ بکات[4].

پەروەردەی سەرەتایی یان زۆر بەکەمی سوودی لەنووسین وەردەگرت یان بەهیچ شێوەیەك سوودی لێ وەرنەدەگرت، مرۆڤی سەرەتایی هیچ شتێك هێندەی ئەوە سەرسامی ناکات کەدەبینێت ئەوروپاییەکان وێڕای دوورییان لەیەکترەوە بەهۆی چەند هێلێکی رەشی سەر پارچە کاغەزێکەوە پەیوەندی بەیەکەوە دەکەن[5]، هۆزگەلێکی زۆر لەرێی تێکەلبوونیان بەو شارستێنییانەوە کەبۆ چەوساندنەوەیان هاتبوون فێری نووسین بوبوون، بەلام هەندێکیان —وەك ئەوەی لەباکووری ئەفەریقادا هەن- وێڕای پێنج هەزار سال لەپەیوەندیی ناوە ناوەیان بەنەتەوە خاوەن پیتەکانەوە کەچی هەر بەنەخوێندەواری ماونەتەوە، هۆزە ساویلکەکانیش کەزۆربەی ژیانیان بەدابڕاوی لەخەلکانی تر بەسەر دەبەنو خاوەنی ئەو بەختەوەرییەن کەمرۆڤ کاتێك رابردووی خۆی نەزانێت بەدەستی دەهێنێت، ئەو هۆزانە زۆر بەکەمی نووسینەوە بەپێویست دادەنێن، هەر لەبەر نەبوونی شتی نوسراوەش زەمینیان بەهێزەو یارمەتیدەریانە بۆ لەبەرکردنی ئەو شتەی دەیانەوێت لەبەری بکەن، دەبینیت شتیان لەبەر دەکەنو لێی تێدەگەنو ئەوەش کەلەبەری دەکەنو لێی حالی دەبن بەدەمی دەیگوازنەوە بۆ کوڕەکانیان، بەلام ئەوانە ئەو شتانە لەبەردەکەنو لێیان حالی دەبن کەبۆ پاراستنی مێژووی خۆیانو بۆ گواستنەوەی کەلەپووری رۆشنبیرییان بەپێویستیان دەزانن، رەنگیشە ئەدەب ئەو کاتە دەستی پێ کردبێت کەدەست کراوە بەنوسینەوەی ئەو شتە لەبەرکراوانەو نووسینەوەی گۆرانییە میللییەکان، بێگومانیش داهێنانی نووسین لەلایەن پیاوانی ئایینییەوە بەرهەلستییەکی دوورودرێژ کراوە بەو پێیەی

ئەگەری زۆر دەکرێت ببێتە هۆی دارمانی ئیتیک‌و دارمانی مرۆڤ، ئەفسانەیەکی میسری دەگێڕنەوە گوایا کە(تەحووت)ی خوداوەند هونەری نووسینی بۆ (تەحامووس)ی خوداوەند ئاشکرا کردووە، ئەو خوداوەندە دڵساقە نەیویستوە ئەو هونەرەی لێ وەربگرێت چونکە ژیارتی بەتەواوی دادەڕمێنێت، لەو بارەیەشەوە گوتوویەتی: "ئەو منداڵ‌و لاوانەی هەتا ئێستا ناچار دەگران هەوڵ بدەن بۆ لەبەرگردنی ئەو شتانەی فێر دەگران‌و حاڵی بوون لێیان، لەمەودوا ئەو هەوڵە نادەن ئەگەر نووسین بەکار بهێندرێت، بەوەش مەشق کردن بەزەینیان بەکارێکی پێویست نازانن"[61].

دیارە ناتوانین لەخەملاندن زیاتر پەنا ببەینە بەر هیچ شتێکی تر ئەگەر بمانەوێت شتێك لەبارەی ڕەچەڵەکی ئەم یارییە سەیرەوە بڵێین، خۆ ڕەنگە لقە دەرهاویشتەیەکی ڕاستەوخۆی هونەری کووپەڵە دروستکردن بوبێت وەك دواتر دەبینین، ئەویش بەوەی ئارەزوویەك لای خەڵکەکە دروست بوبوو کەنیشانەی (مارکە)ی خۆیان لەسەر کووپەڵەکانی خۆیان بنەخشێنن، ڕەنگیشە بەرزبوونەوەی ئاستی بازرگانیی نێوان هۆزەکان پێویستیی بەداهێنانی چەند نیشانەیەکی نووسراو کردبێت، یەکەم شێوەی ئەو نیشانانەش لەوانەیە چەند وێنەیەکی ناقۆلا بووبن کەخەڵکەکە لەسەری ڕێکەتبن بۆ ئاماژەدان بەو کالایانەی ئاڵوگۆڕیان کردوون یان ئەو بڕەپارانەی کەوتوونەتە نێوانیانەوە، چونکە مادام بازرگانیکردن گەیشتبێتە سنووری هۆزگەلێکی خاوەن زمانی جیاجیا، ئەوە ناچار دەبوو ڕێگەیەك بگیرێتەبەر بۆ نووسین‌و حاڵیبوونی دوو لایەنە سەوداکارەکە لەیەکتری، دەتوانین گریمانەی ئەوەش بکەین کەڕەنووسەکان یەکەمین کۆمەڵە نیشانەی نوسراوە بن، لەزۆرترینی حاڵەتەکانیشدا ئەو ڕەنووسانە لەشێوەی چەند هێڵێکی تەریبدان کەلەبری پەنجە دادەنرێن، هەتا ئێستاش لەزمانی ئینگلیزیدا ئەگەر بمانەوێ بڵێین (ژمارەکان) وشەی (ڕەنووسەکان) بەکاردەهێنین کەئاماژەیە بۆ ئەو ڕەچەڵەکەی نووسین، دوای

ئەوەش هەتا ئێستا لەزمانەکانی ئینگلیزیو ئەڵمانیو گریکیدا وشەگەلێك هەن وەك (پێنج) کەلەبنەڕەتدا ماناکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەیەك بەمانای (دەست)[٧]، هەروەها ڕەنووسە ڕۆمانییەکان لەشێوەدا ئاماژەن بۆ پەنجەکانی دەست، ئەوەتا نیشانەی پێنج (V)یەو وێنەی دەستێکی کراوەیە، نیشانەی دە (X)ەو لەدوو نیشانەی پێنج پێکهاتوە کەلەسەری گۆشەکانیانەوە لەیەکتریان داوە.

نووسین لەسەرەتاکانیدا –ئێستاش لای چینیو ژاپۆنییەکان هەروایە- جۆرێك بوو لەوێنەکردن، واتە جۆرێك بووە لەهونەر، وەك چۆن مرۆڤ ئەو کاتەی وشەی بۆ نەهاتوە پەنای بردۆتە بەر ئیشارەت، بەهەمان شێوە وێنەی بەکار هێناوە بۆ گواستنەوەی بیروڕاکانی بۆ جێگەو سەردەمی تر، هەر وشەو پیتێك کەئەمرۆ ئێمە بەکاری دەهێنین لەڕابردوودا وێنەیەك بووە، ئەمە تەواو لەمارکە بازرگانییەکانو لەهێمای بورجەکانی ئاسمان دەچێت، وێنە چینییە سەرەتاییەکان پێش سەردەمی نووسین کەوتوونو پێیان دەگوترا کوروان، ماناکەشی ڕێك (وێنەی ئیشارەتەکان)ە، لیستە تەوتەمییەکان نووسینی وێنەیی بوون، یان وەك ماسۆن بۆی دەچێت وێنەیەك بوون هۆزەکان ئاماژەیان بەخۆیان داوە لەرێیەوە، هەندێك هۆز دارێکی داڕووتاویان بەکارهێناوە بۆ بیرخستنەوەی شتێك یان ناردنی پەیامێك بەلایەکدا، هیندییەکانی جونکۆن-یش بەوە نەوەستاون توێکڵی دارەکە دامالن، بەڵکو چەندین شێوەیان لەسەر دروست کردووە کەدارەکەیان کردووە بەلیستێکی تەوتەمی، یان بەپێچەوانەوە، ئەم لیستە سروشتییانە وێنەیەکی گەورەکراوەی دارە داتاشراوەکە بوون، هیندییەکانی پیرۆ-ش کۆمەڵێکی زۆر نوسراوەیان هەبوو لەژمارەو لەبیروڕا، ئەویش بەوەی گوریسی ڕەنگاوڕەنگیان دەهێناو پڕ گرێیان دەکردنو لوولیان دەکردن، ڕەنگە هەر ئەمەش تۆزێك تیشك بخاتە سەر ڕەچەڵەکی هیندییەکانی ئەمریکای باشوور ئەگەر بزانین هەمان خوو لەناو دانیشتوانی کۆمەڵە دورگەکانی ڕۆژهەڵاتو خەڵکی پۆلینیزیا-شدا باو بووە.

کاتێکیش لاوتسی چینییەکانی هاندا بۆ گەڕانەوە بەرەو ژیانە ساکارەکەیان، پێشنیاری ئەوەیکرد بگەڕێنەوە بۆ لوولدانی گوریسەکانیان[18]، خۆ تاوە تاوە جۆرێکی بالاتری نووسین لەناو گەلە خۆڕسکەکاندا دەبیندرێت، لەدورگەی ئایستەر لەدەریاکانی باشوور چەند هێمایەکی هیرۆگلیفیمان دۆزیوەتەوە، لەدورگەکانی کارۆلینا-ش نوسراوەیەکمان دۆزیوەتەوە پەنجاویەك هێمای برگەیی تێدایە کەبریتین لەوێناکردنی ژمارەو بیروڕا[19]، دەشگێڕنەوە چۆن سەرۆك‌و کاهینەکانی دورگەی ئایستەر هەوڵیانداوە هەرچییەك پەیوەندیی بەنووسینەوە هەیە لای خۆیان بیهێڵنەوە، چۆنیش خەڵك ساڵی جارێك کۆبوونەتەوە بۆ ئەوەی گوێ لەشتە نوسراوەکان بگرن کەبۆیان دەخوێندرایەوە، ئەوە بەڵگەی ناوێت کەنووسین لەیەکەمین قۆناغەکانیدا شتێکی نارۆشن‌و پیرۆز بووە، خودی دەستەواژەی هیرۆگلیف بەمانای (هەڵکەندراوی پیرۆز) دێ، تەواو لەوەش دڵنیا نین کەئەو نوسراوە پۆلینیزییانە سەرچاوەکەیان ژیارتییەکی مێژوویی نەبێت، چونکە نووسین -بەشێوەیەکی گشتی- نیشانەیەکی بوونی ژیاریە، یەکەمین خەسڵەتیشە کەخەڵکی شارستێن لەخەڵکانی چاخە زۆر کۆنەکان جیا دەکاتەوە.

ئەدەب لەیەکەمین قۆناغەکانیدا وشەگەلێك بوون زیاتر دەگوتران هەتا بنووسرێنەوە "ئەگەرچی لەزمانی ئینگلیزیدا ڕەچەڵەکی زمانەوانیی وشەکە دەچێتەوە سەر نووسینەوە"، لەو تەرنیمە ئایینی‌و تەلیسمە جادووییانەوە سەری هەڵداوە کەزیاتر کاهینەکان دەیانگوتنەوە، بەگێڕانەوەش لەم مێشکەوە دەگوازرێنەوە بۆ ئەو مێشك، ئەو وشەیەش کەلای ڕۆمانەکان بۆ هۆنراوە بەکار دەهێنرێت (Carmina) بەمانای هۆنراوەش‌و جادووش دێت لەیەك کاتدا، وشەی سروودیش لەزمانی گریکدا (Ode) لەبنەڕەتدا بەواتای تەلیسمی جادوویی دێت، هەمان شتیش لەبارەی دوو وشەی (Tune)و (Lay)ی زمانی ئینگلیزی‌و وشەی (Lied)ی زمانی ئەڵمانییەوە، ئاوازی هۆنراوەو کێشەکەی، ڕاستە، کەڕەنگە ئەو وشانە سروشێك بن ئەو ڕێکییەی لەسروشت‌و لەژیانی جەستەدا هەیە

بەختشیبێتیو دواتر گەشەیەکی دیارو خێرای کرد لەسەر دەستی ئەو جادووبازانەی دەیانویست لای خۆیان بیهێڵنەوەو دەستاودەستی پێبکەنو دواتریش کاریگەرییە جادووییەکەی هۆنراوەکانیان زیاتر بکەن[20]. گریکەکان یەکەمین دەرکەوتنی هۆنراوەی بەحری عوشاری دەگەڕێننەوە بۆ کاهینەکانی دۆلفی، ئەوانەی ئەم بەحرەیان داهێنا بۆ ئەوەی لەرشێیەوە پێشبینیەکانی خۆیان بهۆننەوە[21]، دواتر شاعیرو وتاربێژو مێژوونووس وردە وردە لەیەکتری جودابوونەوەو ئاقارێکی دنیاییان دا بەهونەرەکانیان کەهەر هەموویان ڕەچەڵەکێکی کەهەنووتییان هەیە. ئەوسا وتاربێژ بوو بەستایشکاری ڕەسمیی کارەکانی شاو بەرگریکار لەخوداوەندەکان، مێژوونووسیش بوو بەنووسەرەوەی کارەکانی شا، شاعیریش بوو بەگۆرانیبێژی ئەو سروودانەی لەڕەچەڵەکدا پیرۆز بوونو ئەفسانەکانی قارەمانێتییان باس دەکردو دەپاراست، لەڕووی مۆسیقاشەوە چیرۆکەکانی خۆی بەئاواز ڕێکدەخست بۆ ئەوەی بیانکاتە واتەو بەگەلو شای گەلیشیان بڵێتەوە، بەم شێوەیە خەڵکی فویجیو تاهیتیو نیوکالێدۆنیا وتاربێژو مێژوونووسی ڕەسمییان هەبوو، دەبوو لەکۆبوونەوە گشتییەکاندا وتار بڵێنو وەی جەنگاوەرانی هۆزەکە بجووڵێنن لەڕێی باسکردنی کارەکانی باپیرانیانو ستایشکردنی سەروەرییەکانی نەتەوەکەیان کەهیچ نەتەوەیەکی تر شان لەشانی نادات، سۆماڵییەکان شاعیری پرۆفیشناڵیان هەبوو کەگوند بەگوند دەسووڕانەوەو وەك شاعیرە سروودبێژو شاعیرە گەڕیدەکانی چاخەکانی ناوەڕاست ەکان سروودیان دەگوتەوە، زۆر بەدەگمەنیش ڕێ دەکەوت شیعر بەدڵداریدا بڵێن، زیاترینی کات شیعرو سروودەکانیان لەسەر توانای جەستەیی یان مقۆمقۆی شەڕو کوشتار یان پەیوەندییەکانی نێوان کوڕو باوك بوو، ئەمە نموونەیەکی شیعرە کەلەیەکێك لەشوێنەوارە کۆنەکانی دورگەی ئایستەرەوە وەرگیراوە، کە شینی باوکێکە بۆ ئەو کچەی بەزمی شەڕوکوشتار لەیەکی دابڕیون:

هەرگیز هۆزەكانی دوژمنان
چۆنێتی سواربوونی دەریایان لەكچەكەم نەشێواندوە
هەرگیز پیلانگێڕیی خەڵكی هۆنیتی
سواربوونی دەریایان لەكچەكەم نەشێواندوە
لەهەموو جەنگەكانیدا دەستبەجێ سەركەوتنی بەدەستهێناوە
بشێت بەخواردنەوەی ئاوێكی ژەهراوی پەلاماری بۆ ببەم
ئاوی شووشە بەردینە ڕەشەكە؟ مەحاڵە
بشێت خەمەكانم ناڵەیان كەم بێتەوە
لەكاتێكدا دەریا كەوتۆتە نێوان خۆم‌و كچەكەمەوە؟
ئای كچەكەم.. ئای كچەكەم
ڕێگەیەكی ئاویی بەرفراوانە
ئەو ڕێگەیەی نیگاكانمی لێوە بەرەو ئاسۆ دەهاوم
ئای كچەكەم.. ئای كچەكەم..

## بابەتی دووهەم

## زانست

### سەرەتاكانی – ماتماتیك – گەردوون – پزیشكی – نوژداری

هێربێرت سپینسەر، ئەو پسپۆڕە مەزنەی بواری كۆكردنەوەی بەڵگە بۆ گەیشتنە ئەنجام، پێی وایە زانستیش وەك ئەدەب لەكاهینەكانەوە دەستی پێكردووە، ڕەچەڵەكانیشی دەگەڕێنەوە بۆ بەدواداچوونە گەردونییەكان كەلەڕێیانەوە كات‌و وادەی كۆبوونەوە ئایینییەكان دیاری دەكرا، دواتر ئەو زانستە لەباوەشی پەرستگاكاندا تۆكمەكراو وەك بەشێكی كەلەپووری ئایینی ئەوە

بەنەوە گواسترایەوە[٢٣]، ناتوانین تەواو لەم بۆچوونە دڵنیا بین، چونکە ناتوانین سەرەتاکان بەتەواوی بزانین، چ بۆ زانست چ بۆ هەر شتێکی تر، تەنها توانای خەمڵاندنو گومانمان هەیە، دەشێت زانستیش وەك ژیار بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ کشتوکاڵدا دەستی پێ کردبێت، چونکە ئەندازە لەسەرەتادا بریتی بوو لەپێوانەکردنی زەویی کێڵراو، ڕەنگیشە زانستی گەردووناسیش زادەی ژماردنی بەروبوومو چاوەڕێکردنی وەرزەکان بێت کەئەو چاوەڕێکردنە پێویستیی بەسەیرکردنی ئەستێرەکانو دانانی ڕۆژژمێر هەبووە، دواتر یەکەشتیوانی گەردووناسی گەشەی کردووە، بازرگانیش ماتماتیکی پێشخستوە، هونەرەکانی پیشەسازیش بناغەیان بۆ فیزیاو کیمیا داناوە.

ڕەنگیشە ژماردنی یەکەمین شێوەی ئاخاوتنی مرۆڤ بووبێت، هەتا ئێستاش لەناو هەندێك هۆزدا شێوازی ژماردن هێندە سادەیە جێی پێکەنینە، تسمانییەکان لەژماردندا تەنها تا ژمارە دوو بڕیان کردووەو لەوە تێنەپەڕیون: "بارمەری، کالاباوا، کاردیا" واتە "یەك، دوو، زۆر"، هۆڵەندایییە تازەکانیش وشەیان نییە بۆ دەستەواژەی سێو چوار، بەڵکو بەسێ دەڵێن "دوو-یەك"، بەچواریش دەڵێن "دوو-دوو"، خەڵکی داماراش قایل نابن دوو مەڕ بگۆڕنەوە بەچوار تێلا، بەڵام قایلن دوو مەڕ بدەن بەدوو تێلا، دواتر جارێکی تر کردەکە دووبارە دەکەنەوە. ژماردن لەڕێی پەنجەوە دەکرا، هەر لێرەشەوە سیستمی دەیی هاتەکایەوە، هەر ئەوەندە مرۆڤ بیرۆکەی ژمارە دوانزەشی زانی -کە بەلای زۆرەوە ماوەیەکی زۆری ویست تا پەیی بە مەبرد، ویست - زۆر پێی بەختەوەر بوو، چونکە مایەی ئاسوودەیی بۆی بتوانێت شتێك بەسەر شەش کەسدا دابەش بکات، لێرەشەوە سیستمی دوانزەیی لەژمارەدا هاتە کایەوە، ئەم سیستمە لەپێوەرە ئینگلیزیەکاندا هەتا ئەمڕۆ کاری پێدەکرێو نایەوێت بزر بێت، ئەوەتا دوانزە مانگ ساڵێکەو دوانزە پنس شلنگێکەو دەرزەن دوانزەیەو گارۆشێك دوانزە دەرزەنەو پێیەك دوانزە قولانجە. بەڵام ژمارە سیانزە بەپێچەوانەی دوانزەوە

ڕازی نابێت دابەش ببێت، بۆیە خەڵك ڕقیان لێ دەبۆوەو بەمایەی شووم دادەنرا، کەپەنجەکانی قاچیش هاتنە پاڵ پەنجەکانی دەست بیرۆکەی بیست دروست بوو، هەتا ئێستاش ئەم ژمارەیە لەژماردندا لەقسەی فەرەنسییەکاندا دیارە کەبۆ هەشتا دەڵێن چوار بیستی. بەهەمان شێوە بەشی تری لەش کرایە پێوەر بۆ پێوانەکردن، دەست هەمووی دەبێتە بست، پەنجە گەورەش دەبێتە قولانج، لەزمانی فەرەنسیدا یەك دەستەواژە لەبری هەردوو دەستەواژەکەیەو هەردوو ماناکە دەبەخشێت، قۆڵیش هەتا ئانیشك بوو بە(باڵ)ێك، هەموو باڵیش کرا بەپێوەرێکی تر کەپێی دەگوترێت باڵی هەندازە، پێ بوو بە پێیەك، لەسەردەمێکی پێشکەوتووتریشدا بەرد لەگەڵ پەنجەکاندا بەکار هێنرا بۆ ئەوەی لەکردەی ژماردندا یارمەتیدەر بێت، هەتا ئێستاش ئەو وشەیەی لەزمانی ئینگلیزیدا بۆ ژماردن بەکار دێت (Calculate) لەڕەچەڵەکە زمانەوانییەکەیدا دەگەڕێتەوە بۆ واتای (بەردی بچووك) کەئەوەش نیشانەی نزیکیی ماوەی نێوان خەڵکی کۆن و مۆدێرنە. تۆرۆ ئاواتی بەوە دەخواست ئەو ژیانە سەرەتاییە ساویلکانەیە بژی، زۆر بەجوانیش حاڵەتێکی دەربڕی کەزۆر جار بەسەر مرۆڤدا تێدەپەڕێت کاتێك دەڵێت: "پیاوی ئەمین هیچ پێویستی بەژمارەیەك نییە لەپەنجەکانی دەستی زیاتری بوێت، زۆر بەدەگمەن ڕوو دەدات پەنجەکانی قاچیشی بوێت، هەرچی لەوە زیاتر بێت لەیەك شوێندا دەیخاتەسەر یەك، بەبۆچوونی من دەبوو کاروبارەکانی ئێمە لەسەر ئەسەقی دوو یان سێ بڕوات، نەك سەدو هەزار، جا لەبری ملیۆن هەتا شەش بژمێرەو ژمارەکەت لەسەر پشتی پەنجە گەورەت بنووسە"[٢٥١] .

ڕەنگە سەرەتای بەکارهێنانی گەردوونیش لەپێوانەکردنی کاتدا بەجووڵەی هەسارەکانی ئاسمان دەستی پێکردبێت، خودی وشەی (پێوەر) لەزمانی ئینگلیزیدا (measure)و هەروەها وشەی (مانگ-month)و بگرە ڕەنگە وشەی مرۆڤیش (man) کەئەم پێوانەکە دەکات، هەموو ئەم وشانە بەبێ هیچ گومانێك

دەچنەوە سەر یەك ڕەچەڵەکی زمانـەوانی کەهەسارەی مانگـە ((moon)[٣٦]، چونکە خەڵك ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی بەساڵ کات بپێون بەسووڕانەوەی مانگ ئەوەیان دەکرد. خـۆر –لەمـەدا تـەواو وەك بـاوك- کـاتێکی ویـست هـەتا دۆزرایـەوە، هـەتا ئـەمرۆش دەبینیـت وادەی جـەژنی بـەهار (Easter) لـەڕێی روخـساری مانگـەوە دیاری دەکەین، خەڵکی پۆلینیزیا ڕۆژمێرێکیان هەبوو ساڵ تیایـدا سـیانزە مـانگ بوو، کەمانگ دیاریی دەکردن.س کاتێك زانییان ساڵە مانگییەکـەیان لەگـەڵ وادەی هـاتنی وەرزەکانـدا زۆر لەیـەك جیـان، مـانگێکی مانگیـان لابـرد، بـەوەش هاوسەنگییەکیان لەنێوان ساڵەکەیان‌و وەرزەکاندا دروست کرد[٣٧].

بـەڵام بـەکارهێنانی هەسـارە یـان تەنـە ئاسمانییـە جووڵاوەکـان بـەو شـێوەیە هاوسـەنگە نەشـازی بـوو بەبـەراورد لەگـەڵ ئـەو تیکەڵییـەی لەبەرکارهێنانیـدا دروست بوو لەمەسـەلەی فالگرتنـەوەدا، فالگرتنـەوە پـێش زانـستی گەردووننـاسی کەوتوە، ڕەنگیشە بۆیە پاش دەرکـەوتنی گەردووناسـیش هـەر مابێتـەوە، چـونکە کەسـە ساویلکەکان زیـاتر بایـەخ بـەو شـتانە دەدەن کەغـەیب بۆیـانی شـاردۆتەوە هـەتا ئـەوەی کـات بـزانن، هـەر بـەوەش هـەزاران ئەفسانە هاتنـە ئـاراوە لـەبارەی کاریگەریی ئەستێرەکان لەسەر دورستبوونی مرۆڤ‌و لەسەر چارەنووسی نوسـراوی مرۆڤ تا ڕۆژگاری ئەمرۆشمان زۆربەی لـەو ئەفـسانانە لەگەشـەدان، خـۆ ڕەنگیـشە ئەو ئەفسانانە بەمانایـەکی تـەواو ئەفسانە نـەبووبن، ڕەنگیـشە جۆرێکـی تـر بـن لەهەڵەی لێکدانەوە، زانست خۆیشی چ نییە بێجگە لەیەکەم جۆری ئەو هەڵەیە.

مرۆڤی سەرەتایی هیچ پاسایەکی زانستی سروشـت داناڕێـژێت، تـەنها بەوەنـدە لێدەگەڕێت کـە لـەڕووی پراکتیکییـەوە مومارەسـەیان دەکات، ئەگـەر نەشـتوانێت ڕارەوی ئەو تەنە بپێوێت کەبەئاسماندا دەکشێت، خۆ دەتوانێـت تیرەکـەی بگرێتـە ئامانجەکەی‌و هەڵەی تێدا نەکات، ئەگەر هیچ هێمایەکی کیمیاویـشی نـەبێتن خـۆ بەنیگایـەکی خێـرا دەزانێـت چ ڕوەکێـك ژەهراوییـەو کامیـان دەخورێـت، بگـرە دەتوانێت زۆر بەوردییـەوە گژوگیا بـۆ مەبەسـتی چاککردنەوەی نەخۆشییەکانی

جەست بەکار بهێنێت، بەلای زۆریشەوە ژنان یەکەمجار پزیشکیان کردووە بەپیشەی خۆیان، تەنها لەبەرئەوە نا کەئەوان بریتیپێچی سروشتیی پیاواتن، لەبەرئەوەش نا کەهونەری دایانییان کردووە بەکۆنترین پیشەی پارەپەیداکردن، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەوان زیاتر لەپیاوان پەیوەندییان بەخاکەوە هەبوو، ئەوەش بواری بۆ رەخساندن ڕووەکەکان باشتر بناسن، تواناشی پێ بەخشین گەشە بەزانستی پزیشکی بدەن، پزیشکییان لەو بازرگانییە جیاکردەوە کەکاهینەکان بەجادووەوە دەیکەن، لەکۆنترین سەردەمانەوە هەتا سەردەمێکیش کەئێمە لەیادمانە ژن بوو چارەسەری نەخۆشی دەکرد، نەخۆش لای خەڵکە سەرەتاییەکان تەنها کاتێك پەنای دەبردە بەر پزیشك یان جادووباز ئەگەر ژن نەیتوانیایە ئەو کارە ئەنجام بدات[28]

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کەبزانیت ئەو سەرەتاییانە چەندین نەخۆشییان چارەسەر کردووە ئەگەرچی زانستێکی ئەوتۆیان نەبووە لەبارەی نەخۆشییەکانەوە[29]، نەخۆشیی لای ئەو کەمزانانە –وەك زانیویانە- لەئەنجامی ئەوەوە بووە کەهێزێکی نەناس یان ڕۆحێکی نەناس چۆتە جەستەی نەخۆشەکەوە، ئەو وێناکردنە لەناوەرۆکدا جیاوازی نییە لەگەڵ ئەو تیئۆرەی ئێستا بەسەر زانستی پزیشکیدا زاڵە لەلێکدانەوەی نەخۆشییەکاندا کەدەڵێت بریتییە لەوەی جەستە میکرۆبی تێدەچێت. بەرفراوانترین ڕێگەی چارەسەریش لای خەڵکی سەرەتایی بریتییە لەبەدرۆ دروستکردنی روقیەیەکی جادوویی وەها بتوانێت ئەو ڕۆحە خراپەکارە قایل بکات کەچۆتە جەستە نەخۆشەکەوە بەڵکو لێی بێتە دەرەوە، ئەگەر دەتەوێت رادەی ڕیشەداکوتانی ئەم ڕێگەیەش بزانیت لەدڵی خەڵکدا بەجۆرێك کەهەرگیز لەدڵیان دەرناچێت، ئەوە چیرۆکی (بەرازەکەی گادارین) بخوێنەرەوە، هەتا ئەمڕۆش خەڵك پەرکەم (فێ) بەوە لێکدەدەنەوە کەبریتییە لەوەی ڕۆحێکی خراپەکار لەجەستەدایە، هەندێك بیروباوەڕی ئایینیی هاوچەرخیش ڕێگەی دیاریکراویان داناوە بۆ چۆنێتیی

دەرکردنــی ئــەو ڕۆحــە خراپــەکارە لەجەســتەی نەخۆشــەکە ئەگــەر بیــەوێت چارەسەر بێـت، زۆرینـەی هـەرەزۆری خـەڵکیش دان بـەوەدا دەنێن کەنوێـژو نـزا لـەپاڵ حـەبو دەرمانـدا یارمـەتی نـەخۆش دەدەن بـۆ چاکبوونەوە. خـۆ ڕەنگـە خەڵکی سەرەتایی ڕێگەی چارەسەرکردنی نەخۆشیان لەسەر هەمان ئەو بناغەیـە داڕشتبێت کەتازەترین زانستی پزیشکی ڕێگەی خـۆی لەسـەر دادەڕێـژێت، ئـەویش چارەسەرکردنە بەهێزی سروش، بەڵام کردەوکارەکانی ئـەو پزیشکە سـەرەتاییانە بـەو شێوازە شانۆییەوە کەبـەکاریان دەهێنـا زیـاتر سـەرنجی ڕادەکێشا وەك هـی جێگرەوەکانیان کەلەوان شارستێنترن. نەوە بوو ئـەوان هـەوڵیان دەدا بەترسـاندن ڕۆحەکـەی نـاو جەسـتەی پیـاوە نەخۆشـەکە دەربکـەن، لـەڕێی ئـەو دەمامکـە ترسناکانەوە کەلەسەریان دەکردن‌و ئەو پێستی ئاژەڵانەی لەبەریان دەکردن‌و ئەو هاتوهاوارو قیـژەو چەپڵەلێدانەوە کەدەیاننایـەوەو ئـەو شەقشەقەیەی بـەپلێت دروســتیان دەکــردو دواتــریش لــەڕێی هەڵمــژینی شــەیتانەکە لەجەســتەی نەخۆشەکەوە بەهۆی بۆرییەکی کونکراوەوە، جا وەك ئـەو پەنـدە بـاوەی دەڵێت: "سروشت نەخۆش چاك دەکاتەوەو چارەسـەر نـەخۆش دڵخۆش دەکات:، هەرچـی هۆزەکـانی بـۆرۆرۆی بـرازیلن ئــەوە هــەنگاوێك لەزانــستدا چـوبوونە پێـشەوەو دەرمانێکیـان دەدا بـەباوکی نەخۆشـەکە بیخواتـەوە بـۆ ئـەوەی منداڵەکـەی چـاك ببێتەوە، منداڵەکەش بەردەوام بەرەو چاکبوونەوە دەڕۆشت"[٣٠].

بێجگە لەگژوگیا پزیـشکییەکان‌و لـەنێو ئـەو شێوازە دەرمانـسازییانە زۆرانـەی مرۆڤـی سـەرەتایی پـەنایان بـۆ دەبـردن، چـەندین جـۆری سـڕکەرە خەوێنـەرەکان دەبینین کەبۆ کەمکردنەوە ئـازارو پاکبوونـەوەی بـرین بـەکار دەهێنـران، ژەهـری لەجۆری Curare کەبـەزۆری دەیانخستە سـەر نـووکی تیرەکانیـان‌و سـڕکەری وەك ڕوەکی قیسب‌و ئەفیون‌و کافور، ئەوانە مێژوویان لەمێژوو خۆی کۆنترە. تەنانەت جـۆرێکی مـادە سڕکەرەکان کەئـەمڕۆ لەناوماندا بـاوە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی دانیـشتوانی پـیرۆ بـۆ هـەمان مەبەسـت بـەکاریان هێنـاوە، کـارتێ ئـەوەمان بـۆ

باسدەکات کەچۆن "خەڵکی ئیراکوا نەخۆشیی ئیسکەرپووتیان بەتوێکڵی درەختی تەتوبو شوکران و گەڵاکانیان چاك دەکردەوە"[31]، هەروەها نوژدارە سەرەتاییەکان کۆمەڵێکی جۆراوجۆری برینپێچ و ئامرازیان ناسیوە، منداڵبوون بەشێوەیەکی لایەق بەڕێوەدەچوو، شکان و برین وەستایانەوە دەپێچران و پاك دەکرانەوە"[32]، بەهۆی چەقۆیەکیشەوە کەلەبەردی شووشەیی ڕەش یان لەبەردەسوێی تەنك یان لەددانی ماسی دروست دەکرا، خوێنیان لەدوومەڵ دەردەکردو وشکیان دەکردەوە، هەروەك لەبەن شریتی پێچانیان دروست دەکرد. سەرەتاییەکان لەرۆژگاری هیندییە زۆر کۆنەکانی پیرۆوە هەتا سەردەمی خەڵکی نوێی مالینیزیا نەشتەرگەریی کاسەی سەریشیان کردووە، مالینیزییەکان لە دە نەشتەرگەریی لەو بابەتە نۆیان بەسەرکەوتوویی ئەنجامداوە، لەکاتێکدا هەمان نەشتەرگەری لەساڵی ١٧٨٦دا هەمیشە بەمردن تەواو دەبوو بەبێ جیاکردنەوەی نەخۆشخانەی ئۆتێل دی‌ی پاریسیش[33].

ئێمە پێکەنینمان بەنەزانیی سەرەتاییەکان دێت، لەکاتێکدا زۆر بەجیددی خۆمان تەسلیمی شێوازە پزیشکییە زۆر گرانەکانی ڕۆژگاری خۆمان دەکەین، دکتۆر ئۆلیفەر ویندیل هۆڵمز پاش بەسەربردنی تەمەنێکی زۆر لەچارەسەری نەخۆشدا دەڵێت: "خەڵك لەئەنجامدانی هیچ شتێك دوودڵی نایانگرێت، بگرە شتێك نییە لەپێناوی چاکبوونەوەو ڕزگارکردنی ژیانیاندا نەیانکردبێت، قایل بوون هەتا نیوەیان لەئاودا نوقم بێت، بەگاز نیوە خنکانێك بخنکێن، قایل بوون هەتا لمۆزیان بخرێنە ژێر گڵەوە، وەك کۆیلەکانی قادس بەئاسنی گەرم داغ بکرێن، قایل بوون وەك ماسی (قەد) بەچەقۆ کون کون بکرێن و دەرزی ئاژن بکرێن، ئاگر لەسەر پێستنیان بکرێتەوە. قایل بوون هەرچی شتی بۆگەنە بیخۆنەوە، بەرامبەر هەموو ئەو شتانەش پارە بدەن، وەك ئەوەی کوڵاندن و سووتاندنی جەستە شتێکی گرانبەها بێت، وەك ئەوەی (فەقافیق) نیعمەت و گرمی زەوی جۆرێك بێت لەڕابواردن"[34].

## بابەتی سێهەم

## هونەر

**ماناکانی جوانی – مانای هونەر – هەستی سەرەتایی بەجوانی – بۆیاغی لەش – بۆیەی دەموچاو بۆ جوانی – خاڵکوتان – مۆری ناوچاو – پۆشاك – خشڵ – کووپەڵەدروستکردن – وێنەکێشان – پەیکەرتاشی – هونەری بیناسازی – سەما – مۆسیقا – پوختکردنەوەی ئەو هەنگاوە سەرەتاییانەی ڕووەو شارستانی تران**

پاش ئەوەی هونەر پەنجاهەزار ساڵی تەمەنی بەسەربرد، هێشتا خەڵك لەدەمەقرەدان لەسەر دیاریکردنی سەرچاوەکانی لەغەریزە مرۆییەکانداو دیاریکردنی بنەماکانی لەچاخەکانی مێژوودا، جوانی چییە؟ بۆچی پێی سەرمەست دەبین؟ بۆچی هەوڵی داهێنانی دەدەین؟.. کەلێرەشدا بواری وتووێژی دەروونی نەبێت، تەنها وەلامێکی کورت دەدەینەوەو ناشڵێین لەوەلامەکەمان بەتەواوی دڵنیاین، دەڵێین جوانی بریتییە لەهەر خەسڵەتێك کە شتێك یان شێوەیەك وەها لێ بکات بەچێژ بێت بۆ ئەو کەسەی تەماشای دەکات، ئەو شتەش –لەڕەچەڵەك و لەسەرەتادا- چێژی ئەدەدا بەتەماشاکەرەکە لەبەرئەوەی جوان بووبێت، بەلام ئەوە لەڕاستییەوە نزیکترە بڵێین بینەر بۆیە شتێك ناو دەنێت جوان چونکە چێژی لێ دەبینێت، هەر شتێك بتوانێت ئارەزوویەکی مرۆڤ تێر بکات جوان دێتە بەرچاوی، بەم پێیە خۆراك جوانە بۆ کەسێکە زۆری برسی بێت، لەکاتێکدا تاوس لەو کاتەدا جوانییەکی ئەوتۆی نییە، ڕەنگیشە چێژبەخش خودی تەماشاکەر بێت، ڕەنگیشە نا، ئەگەری هەردوو گریمانەکە هێندەی یەك هەیە، ئێمە لەقووڵایی دڵماندا هیچ شتێك لەشێوەی خۆمان جوانتر نابینین،

هونــەریش لــەوەوە دەســت پێــدەكات كــەمرۆڤ بەجەســتە جوانەكــەی خۆیــدا هەڵــدەدات، ڕەنگیــشە چــێژبەخش هــاوەڵی مــرۆڤ بێــت لەرەگەزەكــەی تــر كەتەماشـاكەر ئـارەزووی دەكـات، ئەوسـا هەسـتكردنمان بــەجوانی بەگوڕییــەك‌و هێزێكی داهێنـان دەخولقێنێت بـریتین لەبـەگوڕیی‌و هێـزی داهێنـانی شـەهوەتی سێكسی، دواتـر هـەر ئـەو هەسـتكردنەمان بـەجوانی بازنـەی جوانییەكە فراوانتر دەكـات تـا دەگاتــە ئــەوەی هــەموو ئــەو شــتانە بگرێتــەوە كەلــەدوورو نزیــك پەیوەندییان بەخۆشەویستەوە هەیە، هەر وێنەیەك لەشێوەی ئەو بچێت، هـەموو ئەو ڕەنگانەی ئەو بۆ جوانی بـەكاریان دەهێنێت یـان حـەزی لێیانـە یان باسیان دەكات، هـەموو ئـەو خشڵ‌و جلوبەرگانـەی بۆی دەگونجێن، هـەموو ئـەو شێوەی جووڵانــەی بــەزنرێكی‌و تەناســوقی ئــەو بــیر دەخەنــەوە، یــان ڕەنگــە شــێوەی چێژبەخش بـریتی بێـت لەشـێوەی نێـر وەك ئـاواتی پـێ دەخوازرێـت، هـەر لـەو هێزی ڕاكێشانەوە كەلاوازیی مرۆڤ بەرەو پەرستنی بەهێز بەكێش دەكـات هەسـت بەجوانی هەیبـەت دەكـەین، دەرووونمـان لـەحزووری هێـزدا ئاسـوودە دەبێـت، ئـەو هەسـتەش جـوانترین ئایەتـەكانی سـەرلەبەری هونــەر دەخولقێنێـت، دواجـاریش ڕەنگە خـودی سروشـت –بەیاڕمەتییـەكی ئێمـە- ببێتــە پڕهەیبـەتیش‌و جوانیش لەیەك كاتدا، هـەر لەبـەر ئـەوە نـا كەهـەموو ئاسكی ژن‌و هـەموو هێـزی پیاومـان نیــشان دەدات، بـــەڵكو لەبەرئـــەوەی هـــەموو هەســـتەكانی خۆمـــان‌و هـــەموو چـاڕەنووسمان‌و خۆشەویـستیمان بـۆ خۆمـان‌و بـۆ غـەیری خۆمـان لەسـەر ئـەو دادەنێین، ئێمـە لەسروشـتدا چێـژ لـەیاریگاكانی منـداڵیمان وەردەگـرین، چێژیش لـەو گۆشـەگیرییە هێمنـە وەردەگـرین چونكە هـەر ئـەو پەناگەمانـە كەلەدەست زریانەكانی ژیان هەڵدێین، لەگەڵ سروشتیشدا هەڵگێڕو داگێڕی وەرزەكان بەسەر دەبـەین كـەدەڵێیت قۆناغـەكانی مـرۆڤ خـۆین: لاوییـەكی بـەگوڕ، كـامڵبوونێكی درەوشـاوە، بەرخـستنەوەیەكی دەوڵەمەندانــەو دواتــریش ڕەوینەیــەكی ســارد،

بەشێوەیەکی ناڕۆشنیش سروشت وەك دایکێك دەبینین کەژیانی پێ بەخشیوین‌و لەکاتی مردنیشماندا دەمانگرێتەخۆی.

هونەر داهێنانی جوانییە، گوزارشتکردنە لەفیکرو لەهەست بەشێوەیەك کەجوان‌و پڕهەیبەت بێتە بەرچاو، تووشی هەژانێکمان دەکات لەو خرۆشە خۆڕسکە دەچێت کەژن لەپیاودا دەیورووژێنێت، ڕەنگیشە فیکر بریتی بێت لەگەیشتن بەمانایەك لەماناکانی ژیان بەهەر شێوەیەك بێت، هەروەك ڕەنگە خرۆشانی یان وچانی ژێیەکی جەڕێندراو بێت لەژێیەکانی ژیان ئیدی هەر کامێکیان بێت، ڕەنگیشە بۆیە شێوەی هونەری لەناخماندا پەسەندە چونکە تەناسوقێکی تێدایە خۆشحاڵمان دەکات، لەبەرئەوەی لەگەڵ زۆر خەسڵەتی خۆماندا یەك دەگرێتەوە، لەگەڵ هەناسەو لێدانی دڵو ئەو بەرودواهاتنەی زستان‌و هاوین کەجێگەی بەرزڕاگرتنە، هەروەها بەرودواهاتنی هەڵچوون‌و داچوونی دەریاو شەوو ڕۆژ، یان ڕەنگە وێنەی هونەری لەدەروونماندا لەبەر ئەو وێکچوونە پەسەند بێت کەوەك کێش وەهایە بۆ شیعر، هێز لەبەرچاوماندا بەرجەستە دەکات، پێکەوە گونجانی ڕێکوپێکی ڕوەك‌و ئاژەڵمان بۆ وێنا دەکات، هەروەها هی ژن‌و پیاو، یان ڕەنگە بۆیە لەناخەوە وێنەی هونەری پەسەند بکەین لەبەر ئەو ڕەنگاڵەییەی ڕۆحمان ڕۆشن دەکاتەوەو ژیانمان قووڵتر دەکاتەوە، دواجاریش ڕەنگە وێنەی هونەری لەناخماندا لەبەر ئەو ڕاستگۆییە پەسەند بێت کەتیایدایە، چونکە هاوتەریبییەکی ڕوون‌و ئاشکرا لەو وێنەیەدا بەدی دەکرێت لەگەڵ سروشت یان لەگەڵ واقیعی دەرەکی. کاتێك نیگایەك لەدیمەنی جوانی ڕوەکێك یان ئاژەڵێك دەدەین کەئەو جوانییە هەتاسەر نامێنێت، یان مانایەکی سەرپێیی هەلومەرجێك بەدی دەکەین کەخەریکە دەڕەوێتەوە، ئەوسا ئەو دیمەنە بەڕاوەستاوی‌و جێگیری دەخەینەوە بەردەم هەستێك کەلەسەرخۆی چێژ لەو شتانە وەردەگرێت کەدەیانبینێت، یان بەردەم ئەقڵێك کەحەز دەکات لەسەرخۆ لەشتەکان ڕابمێنێت، ئەوسا لەو سەرچاوە زۆرانە هەموو ڕەنگە

تەواوکاریو باڵاکانی ژیان دەردەکەون، گۆرانی، سەما، مۆسیقا، شانۆ، سیرامیكو وێنەکێشان، پەیکەرتاشیو بیناسازی، ئەدەبو فەلسەفە، فەلسەفە ئەگەر هونەر نەبێت چییە؟ فەلسەفە چییە ئەگەر هەوڵێکی تر نەبێت لەپاڵ هەوڵەکانی هەموو هونەرەکانی تردا بۆ بەخشینی مانایەك بەو هەموو بێ سەرەوبەرەییەی لەدنیای ئەزموونەکانماندا هەن؟

ئەگەر هەستکردن بەجوانی لای سەرەتاییەکان لاواز بووبێت ئەوە لەبەر ئەو ماوە کەمە بووە کەکەوتۆتە نێوان هەستکردنیان بەشەهوەتو بەدیهێنانی ئەو شەهوەتە، چونکە ئەوە دەرفەت نادات بەخەیاڵ لەلای خۆیەوە کۆمەڵێك ڕەنگو شێوە ببەخشێت بەبابەتی شەهوەتەکە بەڕادەیەك کەزۆر لەخۆی جوانتری بکات. مرۆڤی سەرەتایی زۆر بەکەمی لەسەر بناغەی ئەوەی ئێمە لەژندا ناوی جوانیمان لێناوە بیر لەهەڵبژاردنی ژنێك دەکاتەوە، بەڵکو بیرکردنەوەی ئەو لەژن لەئاستێکی نزمتردایەو لەسەر بناغەی کەڵکە، مەحاڵیشە بیر لەوە بکاتەوە بووکێکی ماسوولکەپڕ لەبەر ناشرینییەکەی پەسەند نەکات، کە لەسەرۆك هۆزێکی هیندییەکانیان پرسی کام ژنەی لەهەموویان جوانترە داوای لێبووردنی کردو وەڵامی نەدایەوە، چونکە هەرگیز بیری لەو مەسەلەیە نەکردبۆوە، لەوتەیەکی دانایانەی کامڵیشدا کەلەدانایەکی فرانکلی دەچوو گوتی: "ڕەنگە ڕوخسارەکان جوانتر یان ناشرینتر بن، بەڵام ژنان لەڕووەکانی ترەوە هیچ جیاوازییەکیان نییە"، هەتا ئەگەر مرۆڤی سەرەتایی هەستیشی بەجوانی کردبێت، ئەو هەستەی جارجارە لەبەرچاومان بزر دەبێتو نایبینین، چونکە زۆر جیاوازە لەهەستکردنی ئێمە بەجوانی، ڕیچارد دەڵێت: "هەموو ئەو توخمە نیگرۆیانەی من ناسیومن ئەو ژنە بەجوان دەزانن کەناوقەدی باریك نەبێت، ئەگەر قەدیشی لەژێر باڵەکانییەوە هەتا سمتەکانی بەیەك ئەندازە ئەستوور بێت، تەنانەت نیگرۆکانی کەناری دەریا بەو جۆرە ژنە دەڵێن: دەڵێی پەیژەیە". هەروەها گوێی پانی وەك گوێی فیلو ورگی شۆڕ لەجوانییەکانی ژن دادەنرێن

لەلای پیاوانی ئەفەریقاو لەسەرلەبەری ئەفەریقادا جوانترین ژن زنی قەڵەوە، مانگۆپارك لەبارەی نایجیریاوە دەڵێت: "پێدەچێت هێندەی نەمێنێت هەردوو دەستەواژەی قەڵەوی‌و جوانی هاوواتەی یەکتری بن، ئەو ژنەی بیەوێت لاف‌و گەزافی جوانییەك لێبدات هەرچەندە جوانییەکی کەمیش بێت، ئەوە لەوانە بێت کەبەبێ دوو کۆیلە لەمسەرو ئەوسەریانەوە ناتوانن بەرێدا برۆن کەهەریەکەیان بچێتە ژێر باڵێکی بۆ راگرتنی، جوانیی تەواوی ژن ئەوەیە کەکێشی هێندەی باری حوشترێك ببێت"، بریفۆ-ش دەڵێت: "زۆربەی هەمەجەکان حەزیان بەو شتەیە کەئێمە بەناشرینترین شتیان دەزانین لەژندا، مەبەستیشم مەمکی شۆڕە"[٢٥]، هەروەك داروین دەڵێت: "هەموومان دەزانین کەپیربوون لای زۆربەی لەژنانی هۆتنتۆت بەشێوەیەکی سەیر دەردەکەوێ، سێر ئەندرۆ سمت-یش هەرگیز گومانی لەوە نییە کەتایبەتمەندییە سەیرە جێی سەرنج‌و سەرسامیی پیاوانە، خۆی رۆژێك ژنێکی لەناویاندا بینی کەبەخواوەندێکی جوانی دادەنرا، ئەو ژنە لەلای سمتییەوە هێندە قەڵەو بوو کەئەگەر لەسەر زەوی دابنیشتایە مەحاڵ بوو بتوانێت هەستێتەوە سەر پێ، مەگەر لەسەر سنگ خۆی بەکێش بکردایە بەرەو لاپاڵێکی کەمێك لار.. بێرتن-یش ئەوەمان لەبارەی خەڵکی سۆماڵەوە بۆ دەگێڕێتەوە کەئەگەر پیاوەکانیان بیانەوێت ژن بهێنن هەموو ژنەکان ریز دەکەن‌و کامیان لەپیریدا لەهەموویان دەرکەوتووتر بێت ئەوە هەڵدەبژێرن، هیچ شتێکیش لەبەرچاوی نیگرۆدا لەژنی لاواز ناشرینتر نییە"[٢٦].

بەڵام پیاوی سروشتی بەزۆری جوانی بەپێوەری خۆی دەپێوێت زیاتر لەوەی بەپێوەری شێوەی ژن بیپێوێت "چونکە ئەوانەی نزیکترن -لەهونەردا- لەپێشترن"، رەنگە ژنان بروا نەکەن ئەگەر پێیان بڵێین پیاوانی سەرەتاییش‌و پیاوانی هاوچەرخیش هێندەی یەك بەخۆیان سەرسامن. ئەوە نێرە نەك مێ لەهۆزە ساویلکەکاندا -وەك چۆن لەناو ئاژەڵانیشدا هەیە- خۆی جوان دەکات‌و جەستەی خۆی بریندار دەکات لەگەرانی بەدوای جوانیدا، بۆنویك دەڵێت:

"خۆجوانكردن لەئوستراليا هێندەی نەماوە لەلایەن قۆرخی پیاوان بێت، هەمان شتیش لەبارەی مالینیزیاو نیوگینیاو نیوكالیدۆنیاو نیوبریتانیاو نیوهانۆفەرو هیندییەكانی ئەمریكای باكوورەوە دروستە"[٣٧]، لەناو هەندێك هۆزیشدا ئەركی خۆجوانكردن لەهەر ئەركێكی تری ڕۆژگار كاتی زیاتر دەخایەنێت"[٣٨]، ڕوونیشە كەیەكەمین شێوەی هونەر بریتییە لەبۆیاغكردنی جەستە بەبۆیاغێكی دروستكراو، جەستەشیان جارێك بۆ راكێشانی ژنان‌و جارێك بۆ ترساندنی دوژمنان بۆیاغ دەكرد، هەر پیاوێكی خەڵكی ڕەسەنی ئوستراليا وەك تازەترین كچی دڵڕفێنی ئەمڕۆی ئەمریكا وەها بووە، هەمیشە بڕێك بۆیاغی سوورو سپی‌و زەردی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە بۆ ئەوەی ناوە ناوە جوانیەكەی تازە بكاتەوە، هەر كەبۆیاغەكانیشی لەتەواوبووندا بووایە گەشتی دوورودرێژو پڕمەترسیی دەكرد بۆ پەیداكردنی بڕێكی تازە، ئەو پیاوە لەڕۆژانی ئاساییدا تەنها چەند پەڵەیەكی ڕەنگی دەدا لەڕوومەت‌و سەرشانەكانی‌و سنگی، بەڵام لەجەژنەكاندا ئەگەر هەموو جەستەی لەتەوقی سەرەوە بۆ نووكی پێی بۆیاغ نەكردایە وەك كەسێكی شەرمبار هەستی دەكرد"[٣٩].

لەناو هەندێك هۆزدا پیاوان مافی بۆیاغكردنی جەستەیان قۆرخ كردووە، لەهۆزی تریشدا ژنی شووكردوو بۆی نییە گەردنی بۆیاغ بكات"[٤٠]، بەڵام هێندەی نەبردوە كەژنانیش هونەری خۆجوانكردن بەبۆیاغیان دەست كەوتوە كەكۆنترین هونەرە، كاتێك كاپتن كوك بۆ ماوەیەك لەنیوزیلەندا وچانێكی گرت، بینیی دەریاوانەكان پاش گەڕانەوەیان لەگەشتێكی سەر كەنارەكە هەموویان لوتیان بەبۆیاغی دەستكرد سوورو زەرد بووە، چونكە ئەو ڕەنگانەیان پێدا لكابوو كەكچەجوانەكانی خەڵكی هەرێمەكە جەستەی خۆیان پێ ڕەنگ كردبوو"[٤١]، ژنانی فەلاتە-ش لەئەفەریقای ناوەڕاست ڕۆژانە چەند كاتژمێرێك لەخۆجوانكردندا بەسەر دەبەن: پەنجەكانی دەست‌وقاچیان بەڕەنگی ئەرخەوانی ڕەنگ دەكەن، پاش ئەوەی بەدرێژایی شەو دەیانگرنە گەڵای خەنە، دانیشیان بەڕیز شین‌و

زەردو ئەرخەوانی دەگەن، قژیشیان ڕەش دەکەن‌و برژانگیشیان بەکل دەڕێژن[٢]، هەر خانمێکی هۆزی بانگۆش جانتایەکی پڕ لەدەرمانی خۆ جوانکردنی پێیە، مووکێشێك بۆ ڕاکێشانی برۆو برژانگ، تەوقەی قژ لەشێوەی ڕم، ئەڵقەو زەنگو، قۆپچەو شانە[٣].

بەڵام ساویلکە کۆنەکان، وەك گریکەکانی ڕۆژگاری برۆکلیز، بەدەست زوو ڕەوینەوەی ئەو بۆیاغانەوە گیرۆدەبوون، بۆیە وەك گەرەستەگەلێکی جوانکاری ماوەدرێژتر، خاڵکوتان‌و پەڵەکردن‌و پۆشاکیان داهێنا ، لەزۆر هۆزدا پیاوان‌و ژنان خۆیان دەخستە ژێر دەرزیی ڕەنگکردنەوەو بەبێ هیچ ئاخ‌وئۆفێك بەرگەی تەنانەت کوتانی لێویشیان دەگرت. لەگرینلەندا ژنان بۆ ئەوەی شوویان زووتر دەست بکەوێت[٤]، هەر لەمنداڵییەوە کچەکانی خۆیان خاڵکوت دەکرد بەڵام لەزۆربەی کاتدا خاڵکوتان ئەو ڕوونی‌و کاریگەرییەی نەدەبوو کەخەڵکەکە دەیانویست، بۆیە لەهەر کیشوەرێکدا ژمارەیەك هۆز دەستیان کرد بەدروستکردنی پەڵەی قووڵ لەسەر جەستە هەتا دیمەنیان لەبەرچاوی هاوەڵەکانیان جوانتر بێت، یان بۆ ئەوەی دیمەنیان لەبەرچاوی دوژمنەکانیان ناقۆلاتر بێت، وەك سیۆفیل گۆتیێر لەبارەی ئەو خەڵکەوە دەڵێت: "کەپۆشاك‌و کەرەستەی جونکاری ئەو بەهایەی نەما لایان، کەوتنە جوانکردنی پێستیان"[٥]، بەبەردەسوێ‌و گوێچکەماسی خۆیان برینداری دەکرد، دواتریش زۆر جار تۆپێکی قوڕیان دەخستە سەر برینەکە بۆ ئەوەی قووڵتری بکاتەوە. خەڵکی گەڕووی تۆرس شێوەی پەڵەکانیان وەك بزنمژە یان تیمساح یان کیسەڵ دروست دەکرد[٦]، جیۆرج دەڵێت: "لەهەموو بەشەکانی جەستە بەشێکت نەدەبینی جوانیان نەکردبێ یان ئارایشتیان نەکردبێ یان نەیانشێواندبێ یان ڕەنگیان نەکردبێ یان نەیانسووتاندبێ یان چاکیان نەکردبێتەوە یان پانیان نەکردبێتەوە یان نەیان جەڕاندبێ. سەرسامییان بەخۆیان‌و ئارەزووی خۆجوانکردنیش ئەو کارانەیان پێدەکردن"[٧]، هۆزی بۆتۆکۆدۆ بۆ نموونە ئەو ناوەیان لەسووژنێکەوە هێناوە

کەدەیانکرد بەلچو بەهەردوو گوێی منداڵی هەشت ساڵانەدا، هێندەشی ئەدەبرد دەیانگۆڕی بەسووژنێکی گەورەتر بۆ ئەوەی دەمی کونەکەی پێ گەورەتر بکەن‌و بەوە تیرەکەیان دەیانگەیاندە چوار ڤولانج[48]، ژنانی هۆتنتۆت‌یش هەردوو شفرە بچووکەکانی خۆیان درێژ دەکردەوە هەتا بەتەواوی درێژ دەبوون‌و دەبوونە ئەو شتەی پێی دەڵێن بەروانکەی هۆتنتۆت کەلای پیاوەکانیان جێگەی سەرسامییەکی زۆر بوو[49]، ئەڵقەی لووت‌و گوێش لەو پێداویستییانە بوون کەکەس نەیدەتوانی دەستبەرداریان بێت، بەڕادەیەك خەڵكی گیبسلەندا پێیان وابوو هەر کەسێك بمرێت‌و ئەڵقە لەلووتیدا نەبێت لەو دنیا تووشی ئازارێکی زۆر دێت[50]. وابزانم خانمی ئەم سەردەمە لەبارەی هەموو ئەو شتانەوە دەڵێت کە ئەوە وەحشیگەرییەکی لەرادەبەدەر بووە، ئەمە دەڵێت‌و کەچی خۆیشی گوێی بۆ گوارە دەسمێ، لێوو لاڕوومەتیشی بۆیە دەکات، مووە زیادەکانی برۆشی هەڵدەگرێت، موەکانی برژانگیشی ڤیت دەکاتەوە، ڕوومەت‌و مل‌و ڤۆڵەکانیشی ساف‌ولووس دەکات‌و پێیەکانی دەگوشێت. دەریاوانە پڕ لەخاڵەکەمان کەباسی ئەو هەمەجانە دەکات کەلەگەشتەکانیدا بینیونی، وەك ئەوە باسیان دەکات بەزەیی پێیاندا بێتەوە، ڤوتابییەکەی خەڵکی ئەوروپاش رادەچڵەکێت لەبەردەم دیمەنی ئەو برینانەی سەرەتاییەکان لەجەستەی خۆیاندا دروستی دەکەن، بەڵام بەهەموو پەڵەکانی لەشی خۆیەوە دەنازێت‌و بەنیشانەی پایەبەرزییان دەزانێت.

لەزۆربەی کاتیشدا پۆشاك جۆرێك بووە لەئارایشت، چونکە ئەو پۆشاکە فاکتەرێك بووە بۆ رێگرتن لەپەیوەندیی سێکسی یان هاندانی ئەو پەیوەندییە، زیاتر لەوەی فاکتەرێك بێت بۆ خۆپارێزی لەسەرماو شاردنەوەی ئەندامەکان[51]. خووی هۆزی کەمبەری وەهابوو کەلەسەر سك‌و بەلەشی ڕووت بەسەر بەفردا خۆیان بخشێنن[52]، کاتێکیش داروین بەزەیی بەخەڵکی فویجی-دا هاتەوە بەهۆی ڕووت‌وقووتییانەوە، پارچە ڤوماشێکی سووری دا بەیەکێکیان هەتا لەسەرما خۆی پێ بپارێزێ، بەڵام پیاوەکە دڕاندی‌و کردیی کۆمەڵێك پەت‌و بەسەر

برادەرەکانیدا دابەشی کردو ئەوانیش کردیان بەشتی ئارایشت، ئەوانە وەك کوك لەبارەیانەوە دەڵێت: "لەوەتەی دنیا هەیە بەڕووتوقووتی قایلن، بەڵام هێشتا تەمایان لەجوانیدایە"[53]. بەهەمان شێوە ژنانی نۆرینۆکۆ ئەو جلانەیان دڕاند کەقەشە جزۆیتەکان پێیان بەخشین‌و کردیاننە کۆمەڵێك شریت‌و پێچایانە ملیان، بەبێ دوودڵیش گوتیان: "لایان شوورەییە پۆشاك بپۆشن"[54]، نووسەرێکی کۆن باسی خەڵکی ڕەسەنی برازیل دەکات کەجەستەیان هەردەم ڕووت بووە، دواتریش دەڵێت: "هەندێکیان ئەمڕۆ پۆشاك دەپۆشن، بەڵام زۆر ڕێزی لێناگرن، تەنانەت زیاتر وەك جۆرێك لەداهێنان لەبەریان دەکەن نەك وەك پۆشتەیی، یان چونکە فەرمانیان پێدەکەن بۆیە لەبەریان دەکەن، ئەم ڕاستییە لەو کەسانەدا بەدی دەکەیت کەلەماڵ دەردەچن‌و هیچ شتێك لەبەر ناکەن خوار ناوکیان دابپۆشێت، یان کڵاوێك نەکەنە سەریان‌و هەموو جلەکانی تریان لەماڵەوە بەجێ دەهێڵن"[55]، کەپۆشاکیش وەك کەرەستەیەکی جوانکاری زیاتر بوو، بوو بەنیشانەیەك بۆ ژن کەشوویکردووەو بەئەمەکە بۆ مێردەکەی، یان بۆ دەرخستنی لەش‌ولارو جوانیی ژن بەکارهێنرا، لەزۆربەی کاتیشدا دەبینیت ژنانی سەرەتایی وەك ژنانی چاخەکانی دوای خۆیان جلیان دەوێت، واتە نایانەوێ مەبەستەکە داپۆشینی ڕووتی بێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە جوانی جەستەیان زیاتر دەربکەوێ یان جەستەیان جوان دەربکەوێت، هەموو شتێك لەگۆڕاندایە ژن‌و پیاو نەبێت، هەردوو ڕەگەزەکەش هەر لەسەرەتاوە جوانکارییان بەلاوە گرنگتر بووە هەتا خۆداپۆشین، بازرگانیی سەرەتایی زۆر بەکەمی گوێی بەپێداویستییەکان دەدا، بەڵکو لەکەرەستەکانی یاریکردن‌و جوانکاریدا پەنگی خواردبۆوە[56]، بەردە بەنرخەکان کۆنترین توخمەکانی ژیارن، لەمەشدا گوێچکەماسی‌و ددان دۆزراونەتەوە کەپێکەوە گرێدراون‌و کراون بەکەرەستەی جوانکاری، لەگۆڕستانێکدا دۆزراونەتەوە بیست هەزار ساڵ بەسەریاندا تێپەڕیوە[57]، دواییش هەر لەو سەرەتا ساویلکانەوە خێرا ئەو خشڵانە گەشەیان کردووەو زۆر مەزن

بوون‌و ڕۆڵێکی گەورەیان لەژیاندا گێڕاوە. هەر ژنێکی هۆزی گالا بەکێشی شەش ڕەتڵ ئەڵقەی لەدەست کردووە، هەندێك ژنی دەنکا-ش نیو (قەنتار) کەرەستەی جوانکاریی لەخۆی ئالآندوە، جارێك شۆخێکی ئەفەریقایی کۆمەڵێك ئەڵقەی مسی لەدەستدا بوو کەبەتیشکی خۆر داغ دەبوون، بۆیە ناچار بوو خزمەتکارێکی تایبەت رابگرێت بۆ ئەوەی سێبەری بۆ دروست بکات، شاژنی وابۆنیاس-یش لەسەر ڕووباری کۆنگۆ ئەڵقەیەکی مسی لەملی ئالاندبوو بیست ڕەتڵ کێشی بوو، بۆیە ناچار دەبوو ناوە ناوە پاڵ بکەوێت بۆ پشوودان، هەرچی ژنانی هەژاریشە کەبەخت تەنها بەبڕێکی کەم لەبەردی بەنرخ یاوەریان بووە، ئەوە بەڕۆیشتنی وردو لەسەرخۆ لاسایی ئەوانەیان دەکردەوە کەبارێکی قورسی ئەو خشڵە ناشرینانەیان هەڵدەگرت[58].

کەواتە یەکەمین سەرچاوەی هونەر زۆر لەو خۆبادانەی ئاژەڵی نێر دەچێت لەڕۆژانی جووتبووندا، ئیدی بەرەنگەکانییەوە یان بەپەڕەکانییەوە، پاڵنەریش بۆ ئەوە ئارەزووی جوانکردن‌و ئارایشتدانی جەستەیە. وەك چۆن خۆشەویستیی مرۆڤیش، بۆ خۆی یان بۆ خۆشەویستەکەی لەرەگەزەکەی تر، ئەگەر لەرادەی خۆی تێپەڕبکات ئەوەی زیادەیە دەیرێژێت بەسەر سروشتدا، بەهەمان شێوەش پاڵنەرەکانی خۆجوانکردن لەدنیای تایبەتییەوە دەچنە دنیای دەرەوە، ئەوسا ناخی تاك هەوڵ دەدات لەشتگەلێکی بابەتییانەدا گوزارشت لەخۆی بکات، لەوەشدا ئامرازەکانی ڕەنگ‌و شێوە بەکار دەهێنێت، بۆیە هونەر لەڕاستیدا ئەو کاتە دەست پێدەکات کەخەڵك دەست دەکەن بەجوانکردنی شتەکان. ڕەنگیشە یەکەمین بوار کەهونەری جوانکردن هۆگری بوو کووپەڵەدروستکردن بووبێت، چونکە خولخولۆکەکەی کووپەڵەچی وەك نووسین‌و وەك دەوڵەت زادەی چاخە مێژووییەکانە، بەڵام سەرەتاییەکان -یان ڕاستتر ژنانی سەرەتایی- تەنانەت بەر لەداهێنانی ئەو خولخولۆکەیەش کەکووپەڵەچی بەکاری دەهێنێت ئەم پیشەسازییە کۆنەیان گەیاندۆتە ئاستی ئەوەی پێی بگوترێت هونەر، هەر

بــەقورو ئــاوو پەنجــە کارامــەکانی خۆیــان شــێوەی وەهایــان دروســتکردووە کەلەرێکوپێکیـدا مایـەی سەرسـوڕمانە، ئەگـەر گەواهیـشت دەوێـت بڕوانـە ئـەو کووپەڵەیەی هۆزی بارۆنگە دروستیان کردووە لەئەفەریقای باشوور[٥٩]، یان ئـەوەی هۆزی پیۆبلۆی هیندییەکان دروستیان کردووە[٦٠].

کووپەڵەچـی ئـەو کاتـەی ڕووکـاری کووپەڵەکـەی دەسـتکردی بەنەخـشی ڕەنگـاوڕەنگ دەنەخـشێنێت، ئـەوە هونـەری وێنەکێـشان دەخولقێنێـت، چـونکە وێنەکێشان لەسـەر دەسـتی سـەرەتاییەکان نـەبووە هونـەرێکی سـەربەخۆ، بـەڵکو بوونی گرێدراو بوو بەهونەری کووپەڵەو دروستکردنی بت. خەڵکە خۆڕسکەکان ڕەنگەکانی خۆیان لەقوڕ دروست دەکرد، خەڵکی ئندامان بەتێکەڵکردنی خـۆڵی ئاسـنین لەگـەڵ ڕۆن‌و چـەوری ڕەنگیـان ئامـادە دەکـرد[٦١]، ئـەو ڕەنگانەشـیان لەنەخـشاندنی چەك‌و کەرەسـتەو قـاپ‌و بیناکانیانـدا بـەکار دەهێنـا، زۆر هـۆزی ڕاوچیش لەئەفەریقاو لەئۆقیانووسیا لەسەر دیواری ئەشکەوتەکانیان یـان لەسـەر گاشەبەردی نزیـك ئـەو ئەشکەوتانە وێنـەی ئـەو ئاژەڵانـەیان دەکێشا کەحـەزیان دەکرد ڕاویان بکەن[٦٢].

هــەروەها دەشــێت کووپەڵــەو پیــشەسازیی کوپەڵــە وەك چــۆن ڕەچــەڵەکی وێنەکێشان بـووە ڕەچەڵەکی پەیکەرتاشیش بووبێت، چونکە کووپەڵەچی بۆی دەرکەوتوە بەتەنها ناتوانێت قاپ‌وقاچاخی تۆکمە دروست بکات، بـەڵکو دەتوانێـت وەك بـت وێنـەی کەسـەکانیش بکـات‌و ئـەو بتانـەش دواتـر وەك بـۆ جادووبـازی بەکەڵك بن، دواتریش ویستی ئەو شتانە تەنها بـۆ ئـەوە دروسـت بکـات کەشـتێکی جـوان بـن، ئەسـکیمۆکان لەشـاخی کـەڵی کێـوی‌و عـاجی فیلـی دەریـا پەیکـەری بـچووکی مــرۆڤ‌و ئاژەڵیــان دادەتاشــی[٦٣]. هــەروەها کەســی ســەرەتایی ویــستی کەپرەکەی خۆی بەنیشانەیەك دیاری بکات، یان ستوونی پەرستگا یـان گـۆڕێکی دیاریکراو بەپەیکەرێکی بچووك دیاری بکات کەئاماژە بێت بـۆ پەرسـتراوەکە یـان بـۆ مردووەکـە، بۆیـە یەکـەم وێنـە کەدایتاشـی وێنـەی دەموچـاوێك بـوو بەسـەر

ستوونێکەوە، پاشان سەرێك و دواتریش هەموو ستوونەکەی کردە پەیکەرێکی داتاشراو، هەر لەوەشەوە کەلەرێی پەیکەری مردووەکانەوە گۆری باووباپیرانی خۆیان دەناسییەوە پەیکەرتاشی بوو بەهونەرێك[64]، بەو شێوەیە خەڵکە کۆنەکەی دورگەی ئایستەر کۆمەڵێکی بێشومار پەیکەریان لەسەر گۆڕی مردووەکانیان دانا، هەر پەیکەرەو بەمردێك بوو، بەدەیان پەیکەرمان لەو پەیکەرانەی ئەوان دۆزیوەتەوە کەبەرزیی هەر دانەیەکیان بیست پێ بووە، هەندێکیشیان ئێستا دەیانبینین لەسەر زەوی تەخت بوونو وردوخاش بوون کەبەرزییەکانیان لەکاتی خۆیدا لەشەست پێ کەمتر نەبووە.

بەڵام ئەی هونەری تەلارسازی چۆن سەری هەڵدا؟ ئێمە لەوانەیە نەتوانین ئەم ناوە گەورەیە لەدروستکردنی کەپرێکی سەرەتایی بنێین، چونکە تەلار تەنها بیناکردن نییە، بەڵکو بینایەکی جوانە، تەلارسازی ئەو دەمە بووە هونەر کەپیاوێك یان ژنێك بیری لەوە کردەوە بینایەکی جوان بۆ ڕواڵەتیش و بۆ قازانجیش دروست بکات، ڕەنگیشە ئەو ئارەزووەی مرۆڤ بۆ جوانکردنو مەزنکردنی بینا یەکەم جار لەگۆڕستانەکاندا بەتاڵ کرابێتەوە بەر لەوەی ڕووی بکاتە ماڵ، جا هەر ئەو کاتەی دنگەی یادکردنەوەی نزیك گۆڕستانەکە بووە هونەری پەیکەرتاشی، هەر ئەو کاتە گۆڕەکە خۆی بووە پەرستگا، ئەمەش چونکە لەلای سەرەتاییەکان مردووەکان گرنگترو بەهێزتر بوون لەزیندووەکان، بێجگە لەوەی مردووەکان لەیەك شوێن ئارامیان گرتووەو ناجووڵێن لەکاتێکدا زیندووەکان هەر ڕۆژەو لەجێگەیەکن و ماڵی هەمیشەیی هیچ کەڵکیان ناگرێت.

مرۆڤ لەسەردەمێکی زۆر کۆنەوە چێژی لەریتم وەرگرتووە، ڕەنگە زۆر پێش ئەوەی بیری لەپەیکەرتاشینو بیناکردنی گۆڕستان ئەو چێژەی لەریتمی مۆسیقی وەرگرتبێت، لەوەوە دەستی کردووە بەگەشەدان بەقیژەی ئاژەڵ و خوێندنی باڵندەکان، هەروەها بازبازێنو تەقەتەقیان، هەتا ئەوانەی کردە گۆرانیو سەما، ڕەنگیشە -وەك ئاژەڵ- بەر لەوەی فێری ئاخافتن بێت گۆرانیی گوتبێت[65]،

کەگۆرانیشی گوتوە سەمای لەگەڵ گردبێت، لەراستیشدا هیچ هونەرێك سەرەتاییەكان جودا ناكاتەوەو گوزارشت لەناخیان ناكات هێندەی سەما دەیكات، هەر بەو گەمژەییە سەرەتاییەی خۆیەوە مرۆڤی سەرەتایی سەمای گەیاندۆتە ئاڵۆزیو جۆرێك لەناوێتەیی، ئەو لەكوێو سەمای خەڵكی مۆدێرن لەكوێ!! چەندین جۆری جیاجیاشی لێ جیاكردەوە كەبەسەدان دەژمێردرێن، جەژنە گەورەكانی هۆزەكان یەكەم شت بەسەما دەگێردران بەهەردوو جۆرەكەیەوە، تاكەكەسیو بەكۆمەڵ، هەروەها جەنگە گەورەكان بەهەنگاونانو بەسرودی سەربازی دەستیان پێدەكرد، كۆبوونەوە ئایینییە گەورەكانیش تێكەڵەیەك بوون لەگۆرانیو شانۆو سەما، ئەوەش كە ئێمە بەجۆرێك لەگەمەی دەزانین رەنگە بۆ مرۆڤی سەرەتایی كاروباری زۆر جیددی بووبن، چونكە ئەوان كاتێك سەمایان دەكرد بەوە نەیاندەویست گوزارشت لەناخی خۆیان بكەن، بگرە بەوە ئاماژەیان بۆ سروشتو خوداوەندەكان دەنارد، ئەگەر بیانویستایە بەرۆكی سروشت بگرن بۆ وەچە زۆربوون ئەوە لەرێی خەواندنێكەوە دەیانكرد كەلەسەماوە دەكەوتەوە، سپنسەر پێی وایە كە"سەما لەرەچەڵەكدا دەگەرێتەوە بۆ توفووسی بەخێرهاتنەوەی سەرۆكێك ئەو كاتەی لەجەنگ دەگەرایەوە"، بەڵام فرۆید بۆچوونی وایە كەرەچەڵەكی سەما "دەربرینی سروشتی شەهوەتی هەستو هونەری بەكۆمەڵی ورووژاندنی ئارەزووی سێكسییە"، جا ئەگەر ئێمەش بتوانین شتێك بڵێین (بەبێ ئەوەی لەكورتبینیدا ئەو بۆچوونانە تێپەرێنین) ئەوە دەڵێین سەما لەتوفووسە پیرۆزەكانو جۆرەكانی سەرسەرێتییەوە سەری هەڵداوەو ئەگەر دوایش هەر سێ تیئۆرەكەی پێشوومان لەیەك تیئۆردا كۆكردەوە ئەوە دەگەینە بیرۆكەیەك لەبارەی سەرهەڵدانی سەماوە كە وردترین تیئۆرە لەرۆژگاری ئەمرۆدا بتوانین بیگەینێ.

دەشتوانین بڵێین ژەنینی مۆسیقا بەئامێرە مۆسیقییەكانو هەروەها شانۆش هەر لەسەماوە كەوتوونەتەوە، ژەنینی مۆسیقا -وەك دەردەكەوێت- لەوەوە هاتووە كەمرۆڤ ئارەزووی ئەوەی كردووە ئەو سەمایەی دەیكات برگە برگەی بكات،

دەنگیشی لەگەڵدا بێت کەبەهێزتری بکات، هەروەها ئارەزووی کردووە لەرێی ڤیژەو هەراو دەنگی هاوسەنگەوە ئەو خرۆشانەی لەگەڵ هەستی نیشتمانی یان هەستی سێکسیدایە زیاتر بیوروژێنێت، ئامێرەکانی ژەنینیش سەرەتا ئاستێکی سنوورداریان هەبوو چ وەك کاریگەریی چ وەك ئەداکردنیان، بەڵام لەرووی جۆرەوە لەژمارە نەهاتوون، چونکە مرۆڤ ئەو زیرەکییەی خۆی خستبووە گەڕ کەسروشت پێی بەخشیبوو بۆ دروستکردنی جۆرەهای جۆری زورناو تەپڵو دەفو زەربو شمشاڵو ئامێری تری مۆسیقا. ئەو ئامێرانەی لەشاخو پێستو ئێسكو عاجی ئاژەڵو هەروەها لەمسو قامیشو تەختە دروست دەکرد، دواتریش مرۆڤ ئەو ئامێرانەی بەرەنگو بەداتاشینی ورد دەنەخشاند. هەر لەژێر کەوانی سەردەمی کۆن بەدەیان ئامێر دروستکران، هەر لەو گیتارە کۆنەیشەوە کەمانچەو پیانۆی ئەم سەردەمە داهێنران. لەناو هۆزەکانیشدا وەك چۆن سەماکەری پرۆفیشناڵ پەیدا بوون هەر بەهەمان شێوە سروودبێژی پرۆفیشناڵ دەرکەوتن، مۆسیقاش پلە پلە لەو ناڕۆشنیو دەنگ کزییەی خۆیەوە گەشەی کرد هەتا گەیشتە ئەم بارەی ئێستای[٦٦].

هەر لەمۆسیقاو گۆرانیو سەماش بەسەر یەکەوە ئەو هەمەجە شانۆو نۆپرای داهێنا، ئەوەش چونکە سەمای سەرەتایی لەزۆر کاتدا لاساییکردنەوەی تێدابوو، لاساییکردنەوەی جووڵەی ئاژەڵو جووڵەی مرۆڤو، ئەو قۆناغەی تێنەدەپەڕاند، دواتر چووە سەر لاساییکردنەوەی کردارو ڕووداوەکان، بۆ نموونە هەندێك هۆزی ئوستڕالیا سەمایەکی سێکسییان لەچواردەوری چاڵێکی سەر زەویدا دەکرد کەچوار دەورەکەیان پڕ دەکرد لەبنەداری بچووك بۆ ئەوەی لەئەندامی مێینە بچێت، پاش ئەوەش کەلەشیان وەك جووڵەی کەسێکی ئالۆشگرتوو دەجووڵاند بە ڕمەکانیان دەکەوتنە ڕمبارانی چاڵەکە، هۆزەکانی باکووری ڕۆژاوای ئوستڕالیاش شانۆی مردنو زیندووبوونەوەیان نمایش دەکرد کەتەنها لەڕووی سادەییەوە جیاوازیی هەبوو لەگەڵ شانۆنامەی (نهێنی)ی چاخەکانی ناوەڕاستو شانۆنامەی سۆزداریی چاخی نوێ، ئەوەبوو سەماکارەکان بەجووڵەی لەسەرخۆ خۆیان دەخست بەزەویداو دەموچاوی

خۆیان بەو چڵەدارانە دادەپۆشی کەپێیان بوو، هەر کە سەرۆکیش ئاماژەیەکی پێ دەدان وەك گوازرشت لەو سەرکەوتنەی بەدەستیان هێناوەو زیندووبوونەوەی ڕۆحیان رادەگەیاند[٦٧]. لەناکاو بەدەم سەماو گۆرانییەکی زۆر توندەوە هەڵدەستانەوە.

بەم شێوەیە، یان بەشێوەیەکی لەم بابەتە، سەدان نمایشی بێدەنگی بارە جیاجیاکانیان دەگرد بەمەبەستی ریزکردنی گرنگترین رووداوەکانی مێژووی هۆزەکەیان یان گرنگترین کارەکانی تاك. هەر کەمۆسیقا یان ریتمیش لەم جۆرە نمایشانەدا بزر بوو، سەما بوو بەشانۆو بەوەش یەکێك لەمەزنترین شێوەکانی هونەر لەدایك بوو.

بەم ئامرازانە خەڵکانی سەرەتایی بەر لەچاخی ژیار شێوەو بناغەکانی شارستانییان بۆ خوڵقاندین، ئەگەر سەیرێکی دواوە بکەین، ئەم وەسفە کورتەی کەلتووری سەرەتایی دەخەینەڕوو، لەو کەلتوورەدا بێجگە لەدوو توخم، هەموو توخمەکانی ژیار دەبینرێن، ئەو دوو توخمەش بریتین لە: نوسینو دەوڵەوت، هەموو رەچەڵەکەکانی ژیانی ئابووری لەو قۆناغەدا هێنرانەئاراوە: ڕاوو ماسیگرتن، ئاژەڵداریو کشتوکاڵ، گواستنەوەو بیناسازی، پیشەسازیو بازرگانیو کاروباری دارایی، هەروەها هەموو سیستمە سیاسییە سادەکان رەگەکانیان لەو قۆناغەدا داکوتراوە: تیرەو خێزان، گوندو گروپو هۆز، هەروەها ئازادیو رێسا، ئەو دوو تەوەرە دژ بەیەکەی سەرجەم ژیاری بەدەوریاندا دەسووڕێتەوە بۆ یەکەمجار لەو قۆناغەدا پێکەوە گونجانو هەڵیانکرد، هەر ئەو کاتەش یاساو دادپەروەری سەریان هەڵدا، بناغەکانی ئیتیکیش داڕێژران: مەشق کردن بەمنداڵانو رێکخستنی دوو رەگەزەکە: گوتنەوەی وانەکانی شەرەفو پۆشتەییو رێساکانی رەفتارو وابەستەیی.. هەروەها بناغەکانی ئاینیش داڕێژران، هیواو ترسەکانی ئاینیش قۆزرانەوە بۆ پشتگیریکردن لەئیتیكو تۆکمەکردنی کۆمەڵگە، ئاخاوتنیش گەشەی کرد بۆ چەندین زمانی ئاڵۆز، نوژداریو پزیشکیش دەرکەوتن، سەرەتایەکی هەژارانەی زانستو ئەدەبو هونەریش هاتەکایەوە،

لەسەرووی هەمووی ئەوانەشەوە ئەو قۆناغە ڕوخساری سەردەمێک بوو کەداهێنانێکی سەیروسەمەرەی تیادا داهێنرا. ئەوەتا لەبێ سەرەوبەرەیی سیستمێک دەخوڵقێت، هەنگاو بەهەنگاویش ئەو سیستمە لەژیانی ئاژەڵێکەوە بەرەو مرۆڤێکی دانا دەڕوات، کەوایە بەبێ ئەو هەمەجانەی سەدهەزار ساڵیان لەتاقیکردنەوەو بەکارهێنانی هەستەکانیاندا بردەسەر، ژیاری سەری هەڵنەدەدا. ئێمە دەکرێ بڵێین لەهەمووی شتێکدا قەرزداری ئەوانین، وەک چۆن تازەهەڵکەوتوویەکی بەخت سپی، یان تۆ بڵێ تازەهەڵکەوتوویەکی ژیر، لەباووباپیرانێکی نەخوێندەوارەوە ڕێگەی خۆی بەرەو ڕۆشنبیریو ئاسایشو ئاسوودەیی دەگرێتەبەر کەئەو باووباپیرانەی هەمووی ڕەنجو کۆششەکانی خۆیان بەمیرات بۆ بەجێ هێشتووە.

# باسی شەشەم

# سەرەتاکانی ژیار لەچاخی بەر لەمێژووەوە

## بابەتی یەکەم

## کەلتووری چاخی بەردینی کۆن

### مەبەست لەتوێژینەوەی بەرلەمێژوو – جادووی توێژینەوەی شوێنەوارەکان

ئێمە لەقسەکانی پێشووماندا زۆر ورد نەبووین، چونکە ئەو کەلتوورە سەرەتاییانەی وەك ئامرازێك بۆ توێژینەوە لەتوخمەکانی ژیار باسمان کردن، مەرج نییە سەد دەر سەد ئەوان لقەکانی ئەو ڕەچەڵەکە بن کەئەم ژیارییەی ئێمەی لێ بۆتەوە. هیچ شتێك ڕێگر نییە لەوەی ئەو کەلتوورانە پاشماوەی شێتەڵبووی کەلتوورێکی لەخۆیان باڵاتر بووبن، ئەو کەلتووورە باڵایەش ئەو کاتە تووشی داڕمان بووبێت کەمرۆڤ لەناوچەی پشتێنەی زەوییەوە بەرەو ناوچە باکوورییەکان دوای بەفری پەیتا پەیتا تواوەی سەر سنگی زەوی کەوتوە. ئێمە هەوڵی ئەوەمانداوە بەگشتی بزانین ژیار چۆن سەرهەڵدەداو چۆن پێکدێ، هێشتاش ماومانە دوای ڕەچەڵەکی ژیارە تایبەتییەکەی خۆمان بکەوین لەپێش دەستپێکردنی مێژووەوە، ئێستاش دەمانەوێ لێکۆڵینەوەیەکی کورت ئەنجام بدەین —چونکە ئەم بوارە زۆر پەیوەندیی بەمەبەستەکانی ئێمەوە نیە مەگەر لەپەراوێزەوە نەبێت- و دوای ئەو هەنگاوانە بکەوین کەمرۆڤی بەر لەمێژوو هەڵی هێناون و لەڕێیانەوە ڕێگەی بۆ ئەو ژیارە خۆشکردووە کەمێژوو پێی

ئاشنایه. چۆن مرۆڤی جەنگەڵ یان مرۆڤی ئەشکەوت بوو بەو تەلارسازە میسرییە، یان بەو گەردوونناسە بابلییە، یان بەو پێغەمبەرە جوولەکەیە، یان بەو ئیمپراتۆرە فارسە، یان بەو شاعیرە گریکییە، یان بەو ئەندازیارە ڕۆمانییە، یان بەو پیاوە پیرۆزە هیندییە، یان بەو هونەرمەندە ژاپۆنییە، یان بەو پیاوە چینییە دانایە، بۆ ئەوەی بگەینە مێژوو پێویستە لەسەرمان لێرەدا —لەڕێی زانستی شوێنەوارناسییەوە- ڕێگەی زانستی ڕەگەزە مرۆییەکان بگرینەبەر.

سەرزەوی پڕە لەو لێکۆڵەرەوانەی هەڵیدەکۆڵن و تیایدا دەگەڕێن. کۆمەڵێك بەدوای ئاڵتووندا دەگەڕێن، کۆمەڵێك بۆ زیو، کۆمەڵێك شەیدای ئاسنن، کۆمەڵێکی تر خەڵووز، زۆریش لەوانە خوازیاری مەعریفەن. جا ئەوە چ کارێکی سەیروسەمەرەیە ئەوانە دەیکەن کەئامرازەکانی چاخی بەردین لەقووڵایی زەوی لەنزیك کەناری ڕووباری (سووم)ەوە دەردەهێنن، یان بەملی شۆڕەوە لەوێنە جوانە کێشراوەکانی بنمیچی ئەشکەوتەکان دەکۆڵنەوە کەهی سەردەمی بەرلەمێژوون، یان کاسەسەری کۆن لەگۆڕستانەکانی نزیك چۆکۆتین دەردەهێنن و گۆڕستانە شاردراوەکانی (مۆهێنگۆدارۆ)و (یەفتان) هەڵدەدەنەوەو داروپەردووەکانیان بەسەبەتەی کاروانچی لەو گۆڕستانانەی میسرەوە دەگوازنەوە کەخاوەنەکانیان نەفرەت لەو کەسە دەکەن هەڵیان دەداتەوە، یان تۆز لەکۆشکی مینۆس و بریام دەتەکێنن و چارشێوەی پێرسۆپۆلس لادەدەن و خاکی ئەفەریقا بەجۆرێك چاڵ دەکەن کەشوێنەواری قرتاجنە دەربکەوێت. پەرستگا مەزنەکانی ئەنگۆر لەچنگی دارستانەکان ڕزگار دەکەن!! جاك پۆشێ دی بێرت لەساڵی ۱۸۲۹دا یەکەم شوێنەواری بەردەستێی چاخی بەردینی کۆنی دۆزییەوە، نۆ ساڵی ڕەبەق هەموو جیهان گاڵتەیان پێکردو پێی پێکەنین، چونکە بەبۆچوونی هەموو دنیا ئەو پیاوە سەری لێ شێوێندرابوو، لەساڵی ۱۸۷۲دا شلیمان بەپارەوپووڵی تایبەتی خۆی —هێندەی نەمابوو بەتەنها پشت بەدەستوپلی خۆی ببەستێت- تۆزی سەر ڕووداوەکانی شارەکانی تەروادەی تەکاند کەڕووداوگەلێکی زۆر زۆر بوون، بەڵام

هەموو جیهان بۆ ئەمیش تەنها زەردەخەنەیەکی گوماناوییان کرد. ڕەنگیشە بەدرێژایی مێژوو خەڵکی هیچ سەدەیەك گرنگییان بەمێژوو نەدابێت هێندەی ئەو سەدەیەی دەکەوێتە دوای گەشتەکەی شامپیلۆن بۆ میسر بەیاوەریی ناپلیۆنی لاو (ساڵی ١٧٩٨)، ناپلیۆن لەو گەشتەدا بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە، بەڵام شامپیلۆن هەموو میسری لەگەڵ خۆیدا بردەوە، ڕابردووی‌و ئێستای، هەر لەو کاتەوە ئەوەکان یەك لەدوای یەك دەستیان کردووە بەدۆزینەوەی ژیار نوێ‌و کەلتووری نوێ‌و بەگێڕانەوەی هەنگاو هەنگاوی سنووری مەعریفەو گەشەی مرۆڤ لەژیانی ئەم جۆرە مرۆڤە خوێنرێژەدا لایەنی تری هێندەی ئەو لایەنەی جوان بێت کەهەڵپەیەکی شەرمەندانەی هەیە بۆ زانینی شت، یان بڵێ ئارەزوویەکی پڕ لەدڵەڕاوکێ‌و سەرکێش لەپێناوی زانیاریدا.

## بابەتی دووهەم

## خەڵکی چاخی بەردینی کۆن

### چینبەندیی جیۆلۆجی – جۆرە مرۆییەکانی ئەو چاخە

نووسەران ژمارەیەکی زۆر کتێبیان بۆ ئەوە نووسیوە کەسنووری زانیاریەکانمان لەمەڕ مرۆڤی سەرەتایی فراوانتر بکەن‌و بۆ ئەوەش کەبێئاگایی خۆمان لەبارەی ئەو مرۆڤەوە بشارنەوە، ئێمەش وەسفکردنی خەڵکی هەردوو چاخی بەردینی کۆن‌و نوێ بۆ ئەو زانستانەی تر بەجێ دەهێڵین کەخەیاڵێکی داهێنەرانەیان تێدایە، لێرەدا بەس خۆمان لەوە دەگلێنین کەمەبەستمانە، ئەویش ئەو زیادەیەیە کەکەلتوورەکانی چاخە بەردینەکان بەکۆن‌و نوێوە خستوویانەتە سەر ژیانی هاوچەرخی ئێمە.

ئەو وێنەیەی کەدەبێت بۆ خۆمانی دروست بکەین وەك ناواخنی ئەو چیرۆکەی دەیگێڕینەوە وێنەی زەوییەکە جیاوازییەکی زۆر ئاشکرای هەیە لەگەڵ

ئەم زەوییەی ئێستا لەم تەمەنە سەرپێییەدا هەڵی گرتووین، وێنەی زەوییەکە ناوبەناو بەفراو وێنەی زەوییەکەی دەلەرزاند، بەفرێك کەبۆ ماوەی هەزاران ساڵ ناوچەی کەشی مام ناوەندیی کردبووە ناوچەیەکی بەستەڵەك، چەندین کێوی بەردینی وەك چیاکانی هیمالایاو ئەلپو برانسی لەسەر یەك کەڵەکە کردبوو، لەسەر ڕێگای ئەو گاسنە بەفرینەوە زەوی ڕێگەی خۆی گرتبوو.

ئەگەر کار بەتیئۆرییەکانی زانستی هاوچەرخ بکەین کەزوو دەگۆڕدرێن، ئەوە دەبێت بڵێین ئەم بوونەوەرەی دواترو پاش فێربوونی قسە بوو بەمرۆڤ یەکێك بووە لەو جۆرانەی توانیوێتی خۆی لەگەڵ ژینگەدا بگونجێنێت، ئەو جۆرانەی کەپاش ئەو هەموو سەدەیە لەبەستەڵەك توانیویانە بمێننەوە، لەو دەمانەشدا کەبەفر لەنێوانی چاخە بەفرینەکاندا پاشەکشەی دەکرد -بگرە زۆر پێش ئەوەش وەك ئێمە بزانین- ئەم بوونەوەرە سەیرە ئاگری دۆزییەوە، گەشەی بەهونەری پەیکەرتاشیی دەدا لەسەر بەردو ئێسكو لەبەرد چەكو ئامێری دروست دەکرد، بەوەش ڕێگەی بۆ هاتنی ژیار خۆشدەکرد.

پاشماوەی زۆری ئەم مرۆڤەی بەرلەمێژوو دۆزراوەتەوە -ئەگەرچی ئەو زانیارییانە زۆر دەستکاری کراونەتەوە-، لەساڵی ١٩٢٩دا لاوێکی چینیی پسپۆڕی هەڵکۆڵراوەکان (حەفریات)و ئاژەڵو ڕووەك کەناوی و.س.بی بوو لەئەشکەوتی چۆکۆتین کەنزیکەی ٣٧ میل لەپیپنگەوە دووره کاسەسەرێکی دۆزییەوەو زاناگەلێکی پسپۆڕی وەك باوکە بریلو ج.ئیلیۆت سمیت گوتیان کاسەسەری مرۆڤە، هەروەها شوێنەواری ئاگریش لەلای کاسەسەرەکەوە دۆزرایەوە، هەروەك چەند بەردێك دۆزرایەوە کەبێگومان وەك کەرەستە بەکارهێنرابوون، ئێسکی ئاژەڵیشیان دۆزییەوە کەئامێتەی ئەو شوێنەوارە بوبوو، ئەوسا بۆچوونی هەموو لایەك وەهابوو ئەو شوێنەوارە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بلیستۆسین-ی یەکەم کەچاخێکە یەك ملیۆن ساڵی بەسەردا ڕشۆیشتوە[٣]، ئەو کاسەسەرەی لەلای پیپنگ دۆزرایەوە بەکۆی بۆچونەکان کۆنترین پارچەئێسکی مرۆییە ئێمە پێی ئاشنا

بین، ئەو کەرەستانەش کەلەلایەوە دۆزرانەوە کۆنترین دروستکراوەکانی مێژوون.
هەروەها داوسنو ودۆرد لەلای بلتداون لەهەرێمی سێسکس لەئینگلتەرا ساڵی ۱۹۱۱ چەند پارچە ئێسکێکیان دۆزییەوە کەدەشێت هی مرۆڤ بن، کەهەر ئەوەیە ئەمرۆ بەمرۆڤی بلتداون یان یۆانترۆپس ناسراوە (واتە مرۆڤی بەرەبەیان)، ئەو مێژووەش کەبۆ ئەو مرۆڤە دانراوە لەنێوان ماوەیەکی زۆردا دێتو دەچێت، لەیەك ملیۆن ساڵەوە هەتا ۱۲۵ هەزار ساڵ، سەبارەت بەو ئێسکی کاسەسەرو ئێسکی ڕانەی ساڵی ۱۸۹۱ لەجاواو ئەو ئێسکی چەناگەیەش کەساڵی ۱۹۰۷ لەنزیك هێدلبۆرگ دۆزرانەوە هەمان خەملاندن دەکرێت، کۆنترین پەرچە ئێسکیش کەگومان لەوە ناکرێ مرۆیی بن لەناوچەی نیاندەرتاڵ لەنزیك دۆسلدۆرڤ لەئەڵمانیا ساڵی ۱۸۵۷ دۆزرایەوەو وەك دەردەکەوێت مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چل هەزار ساڵی بەر لەزایین، هەر لەو پاشماوە مرۆییانەش دەچێت کەلەبەلژیكو فەرەنساو ئیسپانیاو بگرە لەکەنارەکانی دەریای گالیلی دۆزراونەتەوە، تەنانەت زانایان چاخێکی تەواویان لەمرۆڤی نیاندەرتاڵەوە وێناکردووە کەبەر لەچل هەزار ساڵ پێش ئەم چاخەی ئێمە بەسەر ئەورووپادا زاڵ بووە، ئەو خەڵکە کورتەباڵا بوون، بەڵام قەبارەی کاسەسەری هەر یەکێکیان ۱۶۰۰ سەنتیمەتر ۳ جا بووە، واتە ۲۰۰ سنتیمەتر ۳ جا لەکاسەسەری مرۆڤی ئەم سەردەمە گەورەتر بووە[4].

وەها پێدەچێ لەپێش نزیکەی بیست هەزار ساڵەوە ڕەگەزێکی نوێ کەپێی دەڵێن (کرۆ-مانیۆن) جێگەی ئەو دانیشتووانە کۆنانەی کیشوەری ئەورووپایان گرتبێتەوە، ئەو شوێنەوارانەی لەساڵی ۱۸٦۸دا لەئەشکەوتێك بەو ناوە لەناوچەی دورۆدنی لەفەرەنسای باشوور دۆزرانەوە ئەوەمان نیشان دەدەن، پاشماوەیەکی تری زۆر لەهەمان جۆر دەرهێنراون کەبۆ هەمان سەردەم دەگەڕێنەوە، لەشوێنی جیاجیای فەرەنساو سویسراو ئەڵمانیاو ویلز، هەموو پاشماوەکانیش نیشانەی بوونی خەڵکێکی زۆر بەهێزو باڵابەرزن کەباڵایان لەنێوان پێنج پێو ۱۰ قولانج

هەتا شەش پێو چوار فولانج-دایە، کاسەسەری هەریەکێکیشیان لەنێوان ١٥٩٠-١٧١٥ سەنتیمەتری سێ جادایە[٥]، گروپی کرۆمانیۆن-یش وەك گروپی نیاندەرتاڵ بەئەشکەوت نشینان ناسراوە، چونکە شوێنەوارەکانیان لەئەشکەوتدا دۆزراوەتەوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نییە بیسەلمێنێت بێجگە لەئەشکەوت لانەی تریان نەبووبێت. رەنگە لەوەدا زەمەن گاڵتەمان پێ بکات، مەبەستم ئەوەیە کەزانایانی هەڵکۆڵراوەکان هیچ شوێنەوارێکی ئەو خەڵکەیان نەدۆزیوەتەوە هی ئەوانەیان نەبێت کەئەشکەوت نشین بوون یان لەئەشکەوت سەریان ناوەتەوە، تیئۆری زانستی باوی ئەمڕۆش ئەوەیە کەئەو گروپە مەزنە لەئاسیای ناوەڕاستەوەو بەڕێی ئەفەریقادا ڕێی ئەورووپایان گرتۆتەبەر، ڕێگەکەشیان بەسەر چەند پردێکی وشکانیدا بووە کەدەڵێن ئەو سەردەمە ئەفەریقای داوەتەوە لەئیتاڵیاو ئیسپانیا[٦]، شێوەی بڵاوەکردنی ئەو ئێسكوپروسکە مرۆییانەش گومانی ئەوەمان لەلا دروست دەکەن کەدەیان ساڵو بگرە چەندین سەدە ئەو مرۆڤانە لەپێناوی زەوتکردنی ئەورووپا دژی نیاندەرتاڵەکان زۆر بەسەختی جەنگابن. بەو شێوەیەش دەبینین ململانێی نێوان فەرەنساو ئەڵمانیا زۆر کۆنە، هەرچۆنێك بێت مرۆڤی نیاندەرتاڵ لەسەر زەوی لەبن هاتو مرۆڤی کرۆ مانیۆن زەویی ئاوەدانکردەوە کەدەکاتە باووباپیرانی بنەڕەتیی ئەم ئەورووپای ڕۆژاوایەی کەئێستا هەیە، هەر ئەویش بناغەی بۆ ئەم ژیارە داناوە کەئەمرۆ لەبەردەستی ئێمەدایە.

شوێنەوارە کەلتوورییەکانی ئەو جۆرە مرۆییانەی لەچاخی بەردینی کۆنەوە لەئەورووپادا ماونەتەوە دەبنە حەوت بەشی سەرەکییەوە کەبەپێی شوێنەکانی کۆنترین یان گرنگترین شوێنەوارە دۆزراوەکانی فەرەنسا ئەو حەوت بەشە لەیەك جودا دەکرێنەوە، هەمووشیان بەوە جیادەکرێنەوە کەئامرازی سواغ نەدراویان بەکارهێناوە، سێ بەشی یەکەمیان لەو سەردەمی پشێوییەدا کەڵاڵەبوون کەدەکەوێتە نێوان هەردوو چاخی بەستەڵەکی سێهەمو چوارەمەوە.

١ـ کەلتوور (یان پیشەسازیی) بەر لەسەردەمی چیللی، ئەو سەردەمەش مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ١٢٥٠٠٠ ساڵ بەر لەئێستا، زۆربەی ئەو بەردەستێیانەی کە لەچینە زۆر نزمەکانی زەوی دەرهێنراون نابنە بەڵگەیەکی بەهێز بۆ ئەوەی خەڵکی ئەو سەردەمە خۆیان کەرەستەکانیان دروست کردبێت، پێدەچێت خۆیان لەسروشتدا هەبووبن و چۆن ڕێیان لێ کەوتوون هەر ئاوا بەکاریان هێنابن (ئەگەر هەر لەبنەڕەتەوە بەکاریشیان هێنابن)، بەڵام هەبوونی بەردێکی زۆر گەدەسکی وەهایان هەیە بۆ شوێن دەست دەشێت و لای تیژو لای تریان هەبێت، ئەوە پاڵمان پێوە دەنێت ئەو شەرەفە بدەینە مرۆڤی بەر لەسەردەمی چیللی، شەرەفی دروستکردنی یەکەمین ئامرازی بەکارهێنراوی ئەوروپاییەکان، دروستکردنی چەقۆی بەرد.

٢ـ کەلتووری چیللی و مێژووەکەی دەکەوێتە نزیکەی ١٠٠٠٠٠ پ.ز، لەو سەردەمەدا بەهۆی ناسککردنەوەی لاکانیان ئەگەر کەمێکیش بەناقۆڵایی بێت ئامرازەکان پێشکەوتن ، هەروەها بەچەماندنەوەیان بەجۆرێك شێوەی بادام وەرگرن و دواجاریش بەئامادەکردنیان بۆ ئەوەی بۆ مشتی مرۆڤ خۆشتر بێنەوە.

٣ـ کەلتووری ئەچولی و مێژووەکەی دەکەوێتە نزیکەی ٧٥٠٠٠ پ.زو شوێنەوارێکی زۆری لێ بەجێماوە لەئەوروپاو لەگرینلەنداو وڵاتەیەکگرتووەکان و مەکسیك و ئەفەریقاو ڕۆژهەڵاتی نزیك و هیندو چین، لەم قۆناغەدا بەتەنها چەقۆی بەردین چاك نەکراوە بەجۆرێك کەتەناسوقی زیاتری هەبێت و تیژتر بێت، بگرە لەپاڵ ئەوەدا چەندین ئامرازی تری تایبەت دروست کراون وەك چەکوش و مێخ و پیك و پلێت و سەرەتیرو نووکی ڕم و چەقۆ، دەتوانین لەم قۆناغەدا وێنەیەك بەدی بکەین کەنیشانەیە بۆ قۆناغێکی چوست و چالاکی پیشەسازیی مرۆیی.

٤ـ کەلتووری مۆستیری و شوێنەوارەکانی لەهەموو کیشوەرەکاندا هەیە، هەروەك پەیوەندییەکی سەرنجڕاکێشی هەیە بەپاشماوەکانی مرۆڤی

نیاندەرتاڵەوە، دەکەوێتە مێژوویەکیشەوە کەدەکاتە نزیکەی چل هەزار ساڵ بەر لەئێستا، چەقۆی بەردین لەم قۆناغەدا شتێکی تاڕادەیەك دەگمەنە، وەك ئەوەی بووبێتە شتێك کاتی بەسەر چووبێت‌و شتێکی نوێ جێگەی گرتبێتەوە، ئەم کەرەستە نوێیانەش هەر دانەیەکیان بەردێکی تەنکە کەلەچەقۆکەی پێشوو سووکترەو ناسکترەو جوانترەو دەستگەلێك دروستیان کردوون لەپیشەسازیدا قاڵ بوونەتەوە، ئەگەر چینێکیش بچیتە سەرووی چینەکانی سەردەمی بلیستۆسینییەوە لەباشووری فەرەنسا ئەوە پاشماوەکانی ئەم کەلتوورەی تر دەبینیت.

٥- کەلتووری ئۆریگناسی‌و دەکەوێتە دەوروبەری ۲۵۰۰۰ پ.ز، یەکەمین قۆناغی پیشەسازیی دوای چاخی بەستەڵەکە، یەکەمین کەلتووری ناسراوی مرۆڤی کرۆمانیۆن-یشە، لەم قۆناغەدایە کەبێجگە لەکەرەستە بەردینەکان کەرەستەی ئێسکیش داهات –بێزنگ‌و بزمارو ماڵەو..تاد- هونەریش لەچەند نەخشێکی ناقۆڵای داتاشراوی سەر بەرددا سەری هەڵدا، یان لەوێنەی ساویلکانەی زۆر دیاردا کەبەشی زۆری وێنەی ژنی ڕووت بووە[٧]، لەقۆناغی پێشکەوتووتری گەشەی مرۆڤی کرۆمانیۆن-یشدا کەلتوورێکی تر سەری هەڵدا کەئەویش بریتییە لە:

٦-کەلتووری سۆلوتری کەلەدەوروبەری ۲۰۰۰۰پ.ز لەفەرەنساو ئیسپانیاو چیکۆسلۆڤاکیاو پۆڵەندا دەرکەوتن، لەم قۆناغەدا چەندین چەقۆو پلێت‌و درەوشەو مشارو ڕم‌و حەربە چوونە سەر چەك‌و کەرەستەکانی چاخی ئۆریگناسی، هەروەها دەرزیی زۆر وردیش لەئێسك دروست کرا، کەرەستەی زۆریش لەشاخی کەڵ داتاشرا، هەروەك دەبینیت شاخی کەڵ لەم چاخەدا بەوێنەی جەستەی ئاژەڵ بەجۆرێك داتاشراوە کە زۆر بالاتر، لەو هونەرەی لەچاخی ئۆریگناسیدا هەبوو، لەکۆتاییشدا کەمرۆڤی کرۆمانیۆن گەیشتە چڵەپۆپەی گەشەکردنی ئەم کەلتوورە هاتەئاراوە:

٧. کەلتووری مەجدەلی کەلەدەوروبەری ١٦٠٠٠ پ.ز لەسەرتاسەری ئەوروپادا دەردەکەوێت، ئەم قۆناغەش بەکۆمەڵێکی زۆرو هەمەجۆر لەقاپو قاچاخی ناسک جیادەکرێتەوە کە لەعاجو ئێسکو شاخی ئاژەڵ دروستکراون، لوتکەی ئەو پیشەسازییانەش لەتۆرو دەرزییەکدا دەردەکەون کەسادەیە، بەڵام لەکارامەییدا دەگاتە ڕادەی کامڵی، هەر ئەم قۆناغەشە لەبواری هونەردا بەوێنەکانی ئەلتامێرا جیا دەکرێتەوە کەوردترینو ناسکترین دەستکردی مرۆڤی کرۆمانیۆنن.

مرۆڤی بەر لەمێژوو لەو کەلتوورانەی چاخی بەردینی کۆندا بناغەی ئەو پیشەسازییانەی دارشتوە کەلەچارەیان نوسراوە هەتا شۆڕشی پیشەسازیش وەك بەشێکی کەلتووری ئەوروپا بمێننەوە، ئەوەش کەگواستنەوەی ئەو پیشەسازییانەی ئاسان.کرد بۆ هەردوو ژیاری کلاسیكو مۆدێرن بریتییە لەبەربڵاویی پیشەسازییەکانی چاخی بەردینی کۆن. کاسەسەرو وێنەکانی ئەو ئەشکەوتانەی ساڵی ١٩٢١ لەرۆسیا دۆزرانەوەو، ئەو بەردەستێیانەی دی مۆرگان ساڵی ١٨٩٦ لەمیسر دۆزینییەوەو ئەو شوێنەوارانەی چاخی بەردینی کۆن کە ستن کار لەسۆماڵ دۆزینییەوەو عەمبارەکانی چاخی بەردینی کۆن کە لەنشێوی فەییوم دۆزرانەوەو کەلتووری گلیك ستل لەباشووری ئەفەریقا، هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کیشوەرە تاریکەکەش تاڕادەیەك هەمان ئەو قۆناغانەی بڕیوە کەلەیارەی ئەوروپای بەر لەمێژوو بەکورتی باسمان کردن. ئەوەش لەڕووی پیشەسازیی بەردە زۆر تەنکەکانەوە[٨]، بگرە ڕەنگە ئەو شوێنەوارانەی لەجەزایرو تونس دۆزراونەتەوە کەلەشوێنەوارەکانی چاخی ئۆریگناسی دەچن، ڕەنگە ببنە پشتیوان بۆ ئەو تیئۆرەی دەڵێت ئەفەریقا ڕەچەڵەکی ئەو کەلتوورەیە، یان ئەو سنوورەیە کەمرۆڤی کرۆمانیۆنو دواتر (مرۆڤی ئەوروپایی) تیایدا راوەستاوە[٩]، چەندین کەرەستەی چاخی بەردینی کۆن لەسوریاو هیندو چینو سیبیریاو شوێنی تری ئاسیاش دەرهێنراون[١٠]، هەروەك ئەندرۆو ئەوانەی پێش ئەویش لەناوچەی جزۆیت لەمەنگۆلیا دەریان هێناون[١١]، بەهەمان شێوە پەیکەری ئێسکی

مرۆڤی نیاندەرتاڵو بەردەستێی زۆری هەردوو چاخی مۆستێری‌و ئۆریگناسی لەفەلەستین دۆزراونەتەوە، ئەوەشمان بینی چۆن بەم دواییانە لەپیپنگ کۆنترین پاشماوەی مرۆڤو کەرەستەکانی دۆزرانەوە، کەرەستەی لەئێسك دروستکراویش لەنبراسکا دۆزرایەوە کەهەندێك زانای خاوەنی هەستی نیشتمانی ویستیان بیگێڕنەوە بۆ ٥٠٠٠٠٠ساڵ پێش ئێستا، هەروەها هەندێك سەرەتیر دۆزرایەوە کەهی ٢٥٠٠٠٠ ساڵ پێش ئێستان، بەو جۆرە پردێکی پان هەست پێدەکەین کەمرۆڤی بەر لەمێژوو بەسەر ئەو پردەدا بناغەکانی ژیاری گەیاندە دەستی هاوڕێکەی، مرۆڤی چاخەکانی مێژوو.

### بابەتی سێهەم

## هونەرەکانی چاخی بەردینی کۆن

## کەرەستەکان – ئاگر – وێنەکێشان – پەیکەرتاشی

ئەگەر لێرەدا کورتەباسێکی ئەو کەرەستانە بکەین کەمرۆڤی چاخی بەردینی کۆن دروستی کردوون، ئەوە وێنەیەکی ڕوونتر لەبارەی ژیانی ئەو مرۆڤەوە بۆ خۆمان وێنا دەکەین بەبەراورد لەگەڵ ئەوەدا کەجڵەوی خەیاڵمان بەرەڵلا بکەین، ئاساییشە کەیەکەمین کەرەستەی دەستی مرۆڤ بەرد بێت، چونکە چەندین ئاژەڵ هەبوون دەیانتوانی ئەم کەرەستەیە فێری مرۆڤ بکەن. کەواتە ئەو چەقۆ بەردینەی کەلەسەرێکییەوە قۆقز کرابوو و لەسەرەکەی تریەوە سووڕێندرابوو هەتا بۆ مشت بشێت، ئەو چەقۆ بەردینەی مرۆڤی سەرەتایی بوو بەچەکوش‌و بوو بەپاچ‌و بەبێڵ‌و ماڵەو تیغ‌و مشار، هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆش ئەو وشە ئینگلیزییەی بۆ چەکوش بەکاری دەهێنین (hammer) لەڕەچەڵەکە زمانەوانیەکەیدا بەمانای بەرد دێت[١٣]، دواتر پێ بەپێی ڕۆژگار ئەو کەرەستانە هەمەجۆرتر بوون لەڕووی شکڵ‌وشێوەیانەوە تا وای لێهات لەڕەچەڵەکە

وێکهاتوەکەی خۆیان دوورکەوتنەوە، بۆ دروستکردنی کونکرایە کەرەستەکان، ددان بەکارهێنرا بۆ ئەوەی کەرەستەکە ببێتە مشار، تەلاش چەقێنرایە کەرەستەکە بۆ ئەوەی ببێتە ڕم یان تیر یان خەنجەر، هەروەك ئەو بەردە ماڵەیەی کەلەشێوەی چەماوەدا بوو بوو بەخاکەنازو بەبێڵ. بەردی زبریش بوو بەبربەن، بەردەپیکیش بووە ئەو ئامرازە جەنگییەی مرۆڤ خودی چاخی شارستێنی گلاسیکیشی پێ تێپەڕاند، کاتێکیش مرۆڤ بێ لەبەرد ئێسكو تەختەو عاجیشی چنگ کەوت، کۆمەڵێکی هەمەجۆر چەكو کەرەستەی بۆ خۆی دروستکرد: ماڵەو دەسکاوەنو پاچو سوپێرو خاکەنازو درەوشەو چراو چەقۆو بێڵو کێردو خەنجەرو مێخو، هەروەها کانزابڕو ماسیگرو چەقۆی ڕاوو تیغو تۆڕو بێگومان زۆر شتی تریش[14]، هەموو ڕۆژێك زانیارییەکی نوێی دەست دەکەوت، بایی ئەوەندەش هێزی ژیریی هەبوو کەجارجارە دۆزراوە ڕێکەوتییەکانی دەگۆڕی بۆ داهێنانی ئەنقەست.

بەڵام ئایەتی هەرەگەورەی ئەو مرۆڤە ئاگر بوو، لەوەدا داروین ئاماژە بەگڕی گەڕمی گڕکانەکان دەدات، کەدەشێت ئەو گڕە مرۆڤی فێری ئەوە کردبێت ئاگر چییە، ئەسخیلۆس-یش پێمان دەڵێت پرۆمیسیۆس بەگرتێبەردانی پارچە کۆتەرەیەك لەدەمی گڕکانێکی گڕگرتووی دورگەی لیمنۆس ئاگری دروستکرد[15]، لەناو شوێنەوارەکانی مرۆڤی نیاندەرتاڵدا چەند پارچە خەڵووزو پارچە ئێسکی سووتێندراو دۆزراونەتەوە، کەواتە ئەو ئاگرەی مرۆڤ ئامادەی کردووە کۆنییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش چل هەزار ساڵ بەر لەئێستا[16]، کرۆمانیۆن-یش قاپێکی بۆ خۆی دروست کردبوو بۆ هەڵگرتنی ئەو پشکۆیەی بۆ ڕووناکی بەکاری دەهێنا، کەواتە چراش هەمان ئەو تەمەنە درێژەی هەیە، بەلای زۆریشەوە مرۆڤ لەڕێی ئاگرەوە توانیوێتی بەرگەی ئەو بەستەڵەکە بگرێت کەشالاوی بۆ هێناوە، ئاگریش خەوێکی بێ مەترسیی پێ بەخشیوە دوور لەمەترسییەکانی ئەو ئاژەڵەی لەو شتە سەیرو سەمەرەیە ترساوە وەك چۆن مرۆڤی سەرەتایی کڕنۆشی بۆ بردوە،

هەر ئەویش دژی بەتاریکیی داوەو بەوە بۆتە یەکەمین فاکتەری کەمبوونەوەی ترس، کەمبوونەوەی ترسیش یەکێکە لەتاڵە ئاڵتوونییەکانی چنراوەی مێژوو کەهەموو تاڵەکانی ئاڵتوونی نین، دواجاریش هەر ئاگر بووە کانزاکانی تواندۆتەوەو ئاوێتەی یەکتری کردوون. تاکە هەنگاوی ڕاستەقینەشە لەهونەرەکانی پیشەسازیدا کەمرۆڤی سەردەمی کرۆمانیۆن بەرەو سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی ناوێتی[٧].

لێرەدا شتێکی سەیرو سەمەرە دەگێڕینەوە -وەك ئەوەی مەبەستمان لەم گێڕانەوەیە ڕوونکردنەوەی هۆنراوەکەی گۆتە بێت کە لەبارەی ئەو هونەرە بەجەبەڕووتەوە نووسیویەتی گوایا دوای ڕووخانی ئیمپراتۆرەکانو نەمانی دەوڵەتەکانیش هەر دەمێنێتەوە-، شتێکی سەیر دەگێڕینەوە کەدەڵێین ڕوونترین شوێنەوارێك مرۆڤی چاخی بەردینی کۆن بۆ ئێمەی بەجێ هێشتبێت چەند پارچەیەکە لەهونەرەکەی، ڕووداوەکەش ئەوەیە کەبەر لەشەست ساڵ پێش ئێستا سەنیۆر مارسیلینۆ دی سۆتۆلا لایدایە ئەشکەوتێکی فراوان لەنزیك کێڵگەکەی خۆی لەئەلتامێرا لەباکووری ئیسپانیا، ئەو ئەشکەوتە هەزاران ساڵ بوو وەك خەڵوەتگای ڕاهیبێك دەرگای قفڵ بوو، ئەو تاوێرانە دایانخستبوو کەبەسەریدا دارمابوونو سروشتیش لەلای خۆیەوە بەخۆڵو پەردووی نیشتوو چەندین دنگەی بۆ دروست کردبوو و دەیانپاراست. ئینجا مرۆڤ هاتو کەوتە لێدانی ئەو شوێنە بۆ ئەوەی شوێنێکی نوێ بۆ خۆی پێکەوە بنێت، ئەوەبوو بەو لێدانانەو بەڕێکەوت دەمی ئەشکەوتێکی دۆزییەوە، سێ ساڵ بەسەر ئەوەدا تێپەڕیو سۆتۆلا هات بۆ سەیر کردنی ئەشکەوتەکە، ئەوسا چەند نیشانەیەکی سەیری بەسەر دیوارەکانییەوە بینی، ڕۆژێکیش کچە بچووکەکەی لەگەڵ خۆیدا برد، لەبەرئەوەش کەئەم باڵای وەك باوکی بەرز نەبوو پێویستی بەچەمینەوە بێت بۆیە چاوی بڕییە بنمیچەکە بۆ نیگاکردنو ئەوەی بینی بینی، هێڵکارییەکی ناڕۆشنی بیزۆنێکی بینی (بیزۆن واتە گای کێوی)، هەموو وێنەکەش ڕەنگی زەق

بوو، دواتر کەبنمیچەکەو دیوارەکان بەوردی پشکنران وێنەگەلێکی تری زۆر دۆزرانەوە، ساڵی ١٨٨٠ سۆتۆلا ڕاپۆرتێکی لەبارەی ئەو شتانەوە بڵاوکردەوە کەبینیبوونی، زانایانی شوێنەوارناس وەك خووی هەمیشەییان بەگومانەوە پێشوازییان لەراپۆرتەکەی کرد. هەندێکیش لەو زانایانە ماریفەتی ئەوەیان نواند کەسەرادنێکی ئەشکەوتەکەی بکەن بۆ پشکنینی ئەو وێنانەو سەردانەکەش بەڕاگەیاندنێك کۆتایی هات گوایا وێنەکان ساختەن‌و دەستێکی فێڵباز دروستی کردوون، ئەم گومانە -کەگەس بۆی نییە نارەزایی دەربرێت بەرامبەری- ماوەی سی ساڵی خایاند، دواتر وێنەی تر لەئەشکەوتی تردا دۆزرانەوەو هەموو بۆچوونەکان هاتنە سەر ئەوەی ئەو وێنانە هی چاخی بەر لەمێژوون، بەهۆی ئەو کەرەستە سواغ نەدراوانەی بەردەستیۆ ئەو ئێسك‌و عاجە سواغ دراوانەی تیایاندا بوون، ئەو وێنانە بوونە پشتیوانی لەو دەرەنجامانەی سۆتۆلا پێیان گەیشتبوو، بەڵام ئەو کاتە سۆتۆلا لەژیاندا نەمابوو.

پاشان زانایانی جیۆلۆجی هاتنە ئەڵتامێراو بەکۆی دەنگ گەیشتنە ڕاستی، بەڵام پاش چی. گەیشتنە ئەوەی نیشتووەکانی سەر هەندێك لەوێنەکان دەگەڕێنەوە بۆ چاخی بەردینی یەکەم[١٨]، بۆچوونی زاڵیش ئێستا ئەوەیە کەوێنەکانی ئەڵتامێراو بەشی زۆری هونەرەکانی تری سەردەمی بەر لەمێژوو کەبۆ ئێمە ماونەتەوە دەگەڕێنەوە بۆ کەلتووری ماگداڵی، واتە بۆ دەوروبەری ١٦٠٠٠ پ.ز[١٩]. هەروەها هەندێك وێنەی کەمێك لەوانەش لەزۆر ئەشکەوتی فەرەنسادا تازەتر دۆزراونەتەوە، بەڵام هێشتا هەر بەپاشماوەی چاخی بەردینی کۆن دادەنرێن.

وێنەکان لەزۆرینەی حاڵەتەکاندا جۆرەکانی ئاژەڵن: کەڵ‌و ماموت‌و ئەسپو بەرازو ورچو ..تاد، ڕەنگیشە ئەو جۆرانە بۆ مرۆڤی ئەو سەردەمە خواردنی بەتام بووبن، بۆیە لەڕاودا بایەخی پێ دەدان، هەندێك جاریش وێنەی ئاژەڵێك دەبینین تیری بەرکەوتوە، بەبۆچوونی (فرایزەر)و (ریناخ) ئەو جۆرە وێنانە

بەمەبەستی جادووگەری کێشراون هەتا ئاژەڵەکە بەکێش بکەن بۆ ژێر دەستی هونەرمەند یان راوچییەکەو ئەوسا بۆ ناوسکی[٢٠]، ڕەنگیشە وێنەگەلێك بێ هیچ مەبەستێکیان لەپشت نەبێت هونەری ڕووت نەبێت. پاڵنەریان داهێنانی هونەریو ئەو چێژە هونەرییە بێت کەلەگەڵ داهێناندا دێت. چونکە ناقۆڵاترین وێنە بەس بوون بۆ مەبەستی جادوویی، لەکاتێکدا دەبینیت ئەو وێنانە لەزۆر حاڵەتدا هێندە ناسكو بەهێزو کارامانە کێشراون بەڕادەیەك ئەو شتەت نیشان دەدەن کەدڵتەنگت دەکات ئەویش ئەوەیە کەهونەر -لانی کەم لەم بارەیەوە- گەشەیەکی زۆری نەکردووە لەهەموو ئەو قۆناغە درێژانەدا کەمرۆڤ بڕیونی، ئەوەتا ئەوە ژیانو جووڵەو مەزنی بەهێڵێك یان دوو هێڵی بوێر زۆر بەبەهێزی گوزارشتیان لێکراوە، ئەوەتا هێڵێك وێنەی ئاژەڵێکی زیندووی هێرشبەری کێشاوە (یا دەشێت هێڵەکانی تر بەدەستی زەمەن سڕابنەوە؟)، بڵێی تابلۆی (دواشێو)ی داڤنشی یان تابلۆی (ئیدیعا)ی ئەلگریکۆ وەك ئەو وێنانەی کرۆمانیۆن بمێننەوەو هێڵو ڕەنگەکانیان پاش بیست هەزار ساڵی تر دەربکەون؟!.

وێنەکێشان هونەرێکی کات بەسەربردنە، تەنها پاش سەدان ساڵی گەشەی ژیریو هونەری دەردەکەوێت، ئەگەر بەتیئۆری باوی ئەم سەردەمەیش بڕوا بکەین (کەکارکردن بەتیئۆرە باوەکان کارێکی پڕمەترسییە)، ئەوە دەڵێین وێنەکێشان لەپیشەسازیی پەیکەرەوە سەری هەڵداوە، کەئەم پیشەسازییە بەدورستکردنی پەیکەری تەواو دەستی پێکردو دواتر گەشەی کردو بوو بەداتاشینی پەیکەری دەرکەوتوو لەسەر پلێتی هەڵکۆڵراو. لەمەشەوە هەنگاوی کێشانی وێنە بەهێڵو ڕەنگ هاتەئاراوە، کەواتە وێنەکێشان بریتییە لەپەیکەرێك کەلەلاکانییەوە بڕدراوەتەوە، هەنگاوی میانەی هونەری بەر لەمێژوو دەبینیت زۆر بەجوانی لەو هەڵکۆڵینانەدا بەرجەستە دەبێت کەزۆر بەجوانییەکی سەرسامکەرەوە دیارن بەسەر تابلۆکانەوە، هەڵکۆڵراوەکان پەیکەری پیاوێکن تیرێك یان ڕمێك دەهاوێتو لەسەر تاوێرە ئۆریگناسییەکان لەناوچەی بلۆسیل

لەفەرەنسا هەڵگەندراون، لوی بیگۆن لەئەشکەوتی باربیگ لەفەرەنسا لەنێو چەندین پاشماوەی تری مەگدەلییەکاندا چەند دەسکێکی نەخشێندراوی دۆزییەوە کەلەشاخی کەڵ دروستکراون، یەکێکیش لەو مشتوانە هونەرێکی کامڵی زۆر چاکمان نیشان دەدات، وەك ئەوەی لەو دەمەدا هونەر چەندین ئەوەی لەمەشق و گەشەکردن بڕیبێت، هەروەها لەهەموو ناوچەکانی سەر دەریای ناوەڕاستیشدا —لەمیسرو کریت و ئیتالیاو فەرەنساو ئیسپانیا- ژمارەیەکی بێکۆتا وێنەی ژنانی قەڵەوی کورتەبالای سەردەمی بەر لەمێژوو دەبینین کەیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو خەڵکی دایکایەتییان پەرستوە، یان وێناکردنی ئەو کاتەی ئەفەریقاییەکانن بۆ جوانی، لەچیکۆسلۆڤاکیاش لەژێر زەوی چەند پەیکەرێکی بەردینی ئەسپی کێوی کەڵ و ماموت دەرکراوە، ئەو پەیکەرانە لەنێو چەند پاشماوەیەکدا بوون کەمەزەندە دەکرێت بگەڕێنەوە بۆ ٣٠٠٠٠پ.ز[٣٢].

ئەو لێکدانەوەیەی ئێمە بۆ مێژوو کەدەڵێت مێژوو بەرەو پێشەوە دەڕوات، ئەو لێکدانەوەیە لەپایەکانییەوە هەڵدەتەکێت ئەگەر گومان لەوە بکەین ئەو پەیکەرو نەخشە دیارو وێنە زۆرانە تەنها بەشێکی زۆر کەمی هونەرێکن مرۆڤی سەرەتایی خۆی پێ ناساندوە، یان لەرێیەوە جوانکاریی لەژیانی خۆیدا کردووە. ئەوەی بۆ ئێمە ماوەتەوە هەمووی لەئەشکەوتەکاندایە، چونکە فاکتەرە سروشتییەکان نەیانتوانیوە بگەنە ئەو ئەشکەوتانەو ئەو شتانەش بفەوتێنن، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەمرۆڤی بەر لەمێژوو تەنها کاتێك هونەرمەند بووە کەپەنای بۆ ئەشکەوت بردوە، ڕەنگە پەیکەریان لەهەموو جێگەیەك داتاشیبێت وەك ئەوەی ژاپۆنییەکان دەیکەن، ڕەنگیشە پەیکەریان زۆر داتاشیبێت وەك گریکەکان، ڕەنگیشە تەنها لەدیواری ئەشکەوتەکاندا وێنەیان نەکێشابێت، بەڵکو وێنەکانیان لەسەر کوتاڵ و تەختەو هەموو شتێکی تردا کێشابێت، بەجەستەی خۆشیانەوە، ڕەنگە داهێنانی هونەری ئەوتۆیان هەبێت زۆر بالاتر لەوەی بەدەست ئێمە گەیشتوە، لەیەکێك لەئەشکەوتەکاندا بۆرییەکمان

دۆزیوەتـەوە لەئێسکی کـەڵ دروسـتکراوەو پرکـراوە لەکەرەسـتەیەکی ڕەنگکردنـی پێـستی مـرۆڤ[٣٣]، لەئەشـکەوتێکی تـردا تـابلۆی هونەرمەنـدێکی نیگارکێـشمان دۆزیوەتـەوە لـەو تابلۆیانـەی کەلـەکاتی وێنەکێـشاندا ڕەنگـەکانی دەخرێتەسـەر، کەدۆزیـشمانەوە هێـشتا ڕەنگـی مـەغرە (خـۆڵی ئاسـنین)ی سـووری بەسـەرەوەبوو ئەگەرچی دووسـەد سـەدەی بەسـەردا تێپـەڕیبوو[٣٤]، ئاشـکرایە هونـەر گەیـشتۆتە ئاستێکی زۆر پێشکەوتوو، سنووریشی لەناو خەڵکدا بـەر لەهەژدەهـەزار سـاڵ زۆر فراوان بووە، دەشێت خـەڵکانێك هـەبووبن ئـەو سـەردەمە هەمـەجیو دواکـەوتوو بووبنو لەبرساندا سکی خۆیان هەڵگوشێبێتو لەئەشکەوتە پیسەکاندا نیشەجێ بووبن، ئەو خەڵکە ڕقیان لەچینە بازرگانە دەوڵەمەندەکان بووبێتـەوەو پیلانیـان بـۆ کوشـتنی گروپـە زانـستخوازەکان گێڕابێـتو بەدەسـتی خۆیـان کەرەسـتەیان دروست کردبێتو ئـەو کەرەستانە بـن کـە ئێـستا گەیـشتوونەتە دەستی ئێمـەو بوونەتە شتی ئەنتیکە.

## بابەتی چوارەم

## کەلتووری چاخی بەردینی نوێ

**پاشماوەکانی ئاشپەزخانە – دانیشتووانی دەریاچە – دەرکەوتنی کشتوکاڵ –ماڵیکردنی ئاژەڵ – شێوازە هونەرییەکان – چنین لـەچاخی بەردینی نوێدا – کووپەڵە دروستکردن – بیناسـازی – گواسـتنەوە – ئـایین – زانـست – کورتەیەکی ئەو ڕووداوانەی کە بەر لەمێژوو ڕێگەیان بۆ شارستانی خۆشکرد**

لەچـەند ماوەیـەکی جیاجیـای ئـەم سـەدەیەدا چـەندین کەڵەکـە بـووی زۆر دۆزراوەتــەوە کەبــەلای زۆرەوە پاشمــاوەی خــواردنی بــەر لەمێــژوون. ئەمــە لەفەرەنـساو سـاردینیاو پۆرتوگـالو برازیـلو ژاپـۆنو مەنـشوریا دۆزراونەتـەوە،

لەسەرووی هەمووی ئەوانەشەوە لەدانیمارکدا دۆزراونەتەوەو ئەو ناوە سەیرەیان بەسەردابڕاوە (پەشماوەکانی ئاشپەزی)، ئەم کەڵەکەی پاشماوانە بریتین لەگوێچکەماسیو خورمای ئاویو هێلکەشەیتانۆکەی دەریاو هەروەها لەئێسکو پروسکی ژمارەیەك ئاژەڵی کێویو دەریاییو لەکەرەستەو چەکی لەئێسكو شاخو بەرد دورستکراوو لەپاشماووە ئەرزی وەك خەلوزو خۆڵەمێشو کووپەڵەی شکاو، دیارە ئەو پاشماوانە کەنەوەندەش جوان نین ئاوی چاو ببەن، بەڵگەی روونن لەسەر کەلتوورێك کەلەمێژوویەکدا گەلاڵە بووە کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٨٠٠٠پ.ز، واتە مێژوویەکە ئەگەر بەچاوێکی وردبینانەوە سەیری بکەین نوێترە لەچاخی بەردینی کۆن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێندە نوێ نییە ناوی چاخی بەردینی نوێی لێ بنرێ، چونکە هێشتا نەگەیشتبووە ئەوەی بەردی سواغ دراوی تێدا بەکاربهێنرێ. لەوانەشە هیچ لەبارەی ئەو خەڵکەوە نەزانین کەئەو شوێنەوارانەیان بۆ بەجێ هێشتووین، ئەوەندە نەبێت کەزەوقێکی تارادەیەك ڕەسەنیان هەبووە. دەکرێت پاشماوەکانی ئاشپەزیو کەلتوری مادزیل لەفەرەنسا کەکۆنترینی ئەو پاشماوانەیە، نوێنەری چاخێکی بەردینی میانە بن، کەکەوتۆتە نێوان هەردوو چاخی بەردینی کۆنو نوێوە.

لەساڵی ١٨٥٤یشدا زستانێکی وشکەساڵی نائاسایی تێپەڕی، ئەو ساڵە ئاستی ئاوی دەریاچەکانی سویسرا هێندە نزم بۆوە کەچاخێکی تری چاخەکانی بەر لەمێژووی بۆ دەرخستین، ئەوەبوو لەپتر لەدووسەد جێگەی ئەو دەریاچانەدا چەندین خەرمانی لەو بابەتە دۆزرانەوە، ئەوەش زانرا کەئەو خەرمانانە لەماوەی نێوان سی هەتا حەفتە سەدەدا لەژێر ئەو ئاوەدا ماونەتەوە، خەرمانەکان بەشێوەیەکیش ڕیز بوبوون کەپێدەچێت گوندی بچووکیان بەسەرەوە بووبێت، ڕەنگیشە وەك ئارەزوویەکی گۆشەگیری یان بۆ بەرگری ئەو گوندانە لەوێدا ئاوەدان کرابنەوە، هەر گوندێکیش لەوانە بەپردێکی تەسك بەوشکانییەوە بەسترابۆوە کەهێشتا پایەی هەندێك لەو پردانە لەشوێنی خۆیاندا

ماونەتــەوە، دنگــەی مالّــەکانیش هێــشتا لێــرەو لــەوێ مابوونــەوە، شــەپۆلەکان لەناویان نەبردبوون، لەنێو ئەو کەلاوانەشدا کەمابوونەوە چەندین کەرەستە کە لەئێسك‌و لەبــەردی ســواغدراو دروســت کرابــوون دۆزرانــەوەو ئــەو کەرەســتانە بەبۆچوونی زانایــان نیشانەیەکی دیــاری چاخی بــەردینی نــوێن کەلەدەوروبــەری ۱۰۰۰۰پ.ز لەئاســیاداو دەوروبــەری ۵۰۰۰پ.ز لەئــەوروپادا گەشــەی کــردووە[28]، ئــەو شوێنەوارانەش زۆر لــەو شوێنەوارە مــەزن‌و زۆرانــە دەچن کەرەگەزێکی مرۆیــی ســەیری ناســراو بــە(کێــو بیناکــەر) لەســەر میسیسپی‌و لقــەکانی ئــەو ڕووبــارە بەجێیان هێشتووە، خۆ هیچ لەبارەی ئەو ڕەگەزە مرۆییــەوە نــازانین تــەنها ئــەوە نــەبێت کەلــەو کێوانــەی لەشــێوەی شــوێنی قوربــانی یــان لەشــێوەی ئەنــدازەیی جیاجیــا یــان لەشــێوەی ئاژەڵــە پەرســتراوەکان بــەجێیان هێــشتوون بۆمــان، لــەو کێوانــەدا چــەند شــتێك دۆزراونەتــەوە لەبــەردو گوێچکەماسی‌و ئێسك‌و کــانزای کوتراو دروست کراون، ئەمەش ئەو خەڵکە تەلیسماوییە دەخاتــە کۆتــایی چاخی بەردینی نوێوە.

ئەگەر بمانــەوێ وێنەیــەك لــەو پاشمــاوە پــەرت‌وبڵاوەی چــاخی بــەردینی نــوێ هــەڵهێنجین، ئــەوە دەســتبەجێ وێنــەی هــەنگاوێکی نــوێی مرۆڤمــان بەرچــاو دەکــەوێت کەلــەکاتی بینینیــدا سەرســامت دەکــات، ئــەویش کــشتوکاڵە. دەتوانیــت بڵێیت سەرجەم مێژووی مرۆڤایــەتی بەمانایــەك لــەماناکان لــەدەوری دوو شــۆڕش دەسووڕێتەوە، ئەو شۆڕشەی لەچاخی بەردینی نوێدا ڕوویداوەو مرۆڤی لــەڕاوەوە گواستۆتــەوە بــۆ کــشتوکاڵ، ئــەو شۆڕشــەش کــەبــەم دواییــە ڕوویــداو لەکشتوکاڵەوە گواستییەوە بۆ پیشەسازی. لەهەموو جۆرەکانی ئەو شۆڕشانەدا کەمرۆڤ بینیــونی هیــچیان وەك ئــەو دوو شۆڕشــە ڕاســتەقینە نــین، شــوێنەوارەکان پێمــان دەڵــێن کەدانیشتوانی ئەو ناوچەیە گەنم‌و گەنمەشامی‌و جۆو هەرزنیان دەخوارد، بێجگــە لەسەدوبیست جۆری میوەو چەندین جۆری بادەم[29]، لــەو شــوێنەوارانەدا گاســنمان بەرچاو نەکەوتوە، ڕەنگیشە لێکدانەوەی ئەم حاڵەتە ئەوە بێت کەدانی گاسنەکان

بەتەختــە دروســت کــرابن، کۆتەرەکــە بــەمێخێکی بەردەســتیێ درابێــت لەهــەر تەلاشــەدار یــان لقێــك کــەپێوەی کــراوە، بــەلام نەخــشێکی هەڵکەنــدراوی ســەر بــەردێکی چــاخی بــەردینی نــوێ بەڵگەیــەکی حاشــاهەڵنەگرە لەســەر ئــەوەی کەتابلۆکە وێنەی جوتیارێکە گاسنێك پالْ پێوە دەنێت کەدوو گا ڕایدەکێشن[٣٠]، ئەمــەش داهێنانێکمــان بــۆ دیــاری دەکــات کەدەبێتــە ســەرەتای چــاخێکی نــوێ لەچــاخەکانی مێــژوو. زەوی بــەر لــەوەی کــشتوکاڵی تێــدا بکرێــت دەیتــوانی هۆکارەکــانی ژیــان بــۆ نزیکــەی بیــست ملیــۆن کــەس دابــین بکــات (ئەمــە بەخەملاندنی سێر ئارسەر کەخەملاندنێکی زۆر ورد نییــە)، ژیانی ئــەو بیست ملیۆنــەش بــەهۆی ڕاوو کوشــتارەوە[٣١] هەمیــشە لەبــەردەم مردنێکــی خێــرادا ڕاوەستابوو ، بەلام پاش کشتوکالْ خەڵك کەوتنە زۆربوونێك کەبووە پشتیوان بۆ زاڵبوونی بێ ئەمسەرو ئەوسەری مرۆڤ بەسەر زەویدا.

لەهەمان کاتدا خەڵکی چاخی بەردینی نوێ بناغەیەکی تریان لەبناغەکانی ژیــار دادەڕشت، ئــەویش مــاڵیکردن و بــەخێوکردنی ئــاژەڵ بــوو، گومــانیش لــەوەدا نییە کەئەو کارە سەردەمانێکی زۆری بردوە، کەڕەنگە سەرەتاکەی بگەڕێتــەوە بۆ سەردەمێکی کۆنتر لەچاخی بەردینی نوێ، چونکە حەزی غەریزییانەی مــرۆڤ بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ شتی تر بێجگە لــەمرۆڤ ڕەنگــە فاکتــەرێکی یاریــدەدەر بێــت بــۆ پەیوەندیکردنی بەئاژەڵەوە، نیشانەی ئــەو قــسەیە بــەڕوونی لــەوەدا دەردەکــەوێت کەخەڵکــە ســەرەتاییەکان هێــشتا زۆر خۆشــحالْ دەبــن بەدەســتەمۆکردنی ئاژەڵــە دڕنــدەکان، یــان بــەوەی کوخــەکانیان پــڕ بکــەن لەمــەیموون و تــووتی و هاوشــێوەو هاوەڵــەکانی تریــان[٣٢]. کــۆنترین ئێــسکیش لــەناو شــوێنەوارەکانی چــاخی بــەردینی نوێــدا (دەوروبــەری ٨٠٠٠پ.ز) ئێــسکی ســەگە، کــەدێرینترین هــاوەڵی ڕەگــەزی مرۆییــەو هــەروەها خــاوەنی شــەرەفمەندانەترین ئیتیکیــشە لــەنێو هاوەڵــەکانی مرۆڤــدا. دوای ســەگیش لەدەوروبــەری ٦٠٠٠ پ.ز بــزن و بــەرخ و بــەرازو گــا دێــن[٣٣]، دواجاریش ئەسپ دێت کەئەگەر وێنــەکانی نــاو ئەشکەوتەکان بکەینــە سەرپشك

ئەوە لەلای خەڵکی چاخی بەردینی کۆن ئاژەڵێك بوو تەنها ڕاو دەکرا، بەڵام لەم چاخە بەردینە نوێیەدا خەڵك بردیانە ماڵەکانی خۆیان و ماڵییان کردو کردیانە کۆیلەیەك دڵیانی پێ بکرێتەوە[34]، چونکە بەدرێژایی سەردەمەکان بەکاریان دەهێناو سامانی مرۆڤو رزق و هەروەها ماوەی دەستبەتاڵیشی پێ زۆرتر بوو، بەم جۆرە ئەو مرۆڤەی لەدواجاردا بەتەواوی زەویی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، سەرچاوەکانی خۆراکی خۆی لاپەسا زیاتر کرد بەوەی بێجگە لەڕاوی ئاژەڵ ماڵیشی کرد، ڕەنگیشە مرۆڤ هەر لەو چاخە بەردینە نوێیەدا فێری خواردنی شیری مانگا بووبێت.

داهێنەرانی چاخی بەردینی نوێ وردە وردە کەوتنە فراوانکردن و چاکردنی کەرەستەو چەکەکانیان، ئەوەتا لەنێو پاشماوەکانیاندا خولخولۆکەو نوێڵ و بڕبەن و درەوشەو مەقاش و پاچ و بێڵ و پەیژەو خاکەناز و تەشوێ و تەون و داس و مشارو قولاپی ماسی و کەوشی خلیسکێنەی سەر بەفرو دەرزی و تۆڕو سوژن دەبینین[35]، هەروەها هەر لێرەدا تایە دەبینین، کەئەویش یەکێکی ترە لەداهێنانە بنەڕەتییەکانی مرۆڤو زەڕوورەتێکی هەزارانەی پیشەسازی و ژیارییە، تایە لەم قۆناغەدا گەشەی کردو شێوەیەکی خڕی تەواوی وەرگرت و بوو بەچەندین جۆری تایەی تیرەدار، هەروەها لەم قۆناغەدا هەموو جۆرەکانی بەرد بەکارهێنران، تەنانەت ئەوانەش کەخۆیان بەدەستەوە نادەن وەك بەردی شووشەیی رەش، ئیدی بەردیان دەهاڕی و کونیان دەکردو سواغیان دەدا، بەردەستێکانیش بەشێوەیەکی بەرفراوان لەزەوی دەرهێنران، لەیەکێکیش لەشوێنە هەڵکۆڵراوەکانی چاخی بەردینی نوێدا، لەشاری براندن لەئینگلتەرا، هەشت زەوی‌بڕ دۆزرانەوە کەلەشاخی ئاسك دروست کراون، لەسەر ڕووتەختەکانیشیان مۆری ئەو کرێکارانە دیاربوو کەبەر لەدەهەزار ساڵ لەسەریان دانابوون. لەبەلژیکیش پەیکەری ئێسکی کرێکارێکی کانگای سەردەمی چاخی بەردینی نوێ دۆزرایەوە کەبەردێك بەر سەری کەوتبوو کوشتبووی، ئەو کاتەی دۆزرایەوە

هێشتا زەویبڕەکە لەمشتیدا بوو[٣٦]، وێڕای ئەو سەد سەدەیەی دەکەوێتە نێوان ئێمەو ئەوەوە، وەها هەست دەکەین یەکێك بێت لەخۆمان، بەم خەیاڵە لاوازەی خۆمانەوە هاوبەشی غەم‌و ئازارەکانی دەکەین، ئای مرۆڤ چەند هەزار ساڵی لەهەڵکۆڵینی ناخی زەویدا بەسەربرد بۆ دەرهێنانی ئەو بناغە کانزاییەی ژیاری لەسەر دامەزرا. کەمرۆڤ دەرزی‌و سوژنی دروستکرد کەوتە چنین، حەز دەکەیت بڵێ کەکەوتە چنین زەڕوورەتی ئەو کارە پاڵی پێوەنا دەرزی‌و سوژن دروست بکات، چونکە چیدی مرۆڤ بەوە قایل نەدەبوو خۆی بەتووك‌و پێستی ئاژەڵ داپۆشێت، ئەوە بوو خوریی بەرخەکانی خۆی‌و تاڵەکانی ڕووەکی چنی‌و کردنیە پۆشاکێك کەبنەڕەتی پۆشاکی ئێستای هندۆسەکانە، هەروەها کردنیە ئەو کوتەکەی گریکەکان لەبەریان دەکرد. کردنییە ئەو جلەی بەشی خوارەوەی لەش دادەپۆشێت کەمیسرییەکان دەیانپۆشی. هەروەها هەموو جۆرەکانی تری پۆشاك کەلەلای مرۆڤ دەیانبینی. دواتر خەڵك بۆیەیەکیان لەچەند تێکەڵەیەکی دۆشاوی میوە یان لەناخی زەوی دەرهێناو پۆشاکەکانیان پێ ڕەنگ کرد تا ئەو ڕەنگانە ببنە خۆش ڕابواردنێکی تایبەت بەشاکان، لەوەش دەچێت مرۆڤ سەرەتای چنین تاڵەکانی وەك چنین پووش‌و قامیش چنیبێت بەوەی تاڵێکی لەتاڵێکی تر ئاڵاندبێت، دواتر چوە قۆناغێکی باڵاتر کەبریتییە لەکون کونکردنی پێستی ئاژەڵ‌و ڕاپیکردنی تاڵی ناقۆڵا لەو کونانەوە بۆ بەستنەوەی پێستەکە، وەك ئەو گوریسانەی ژنان تا ئەم دواییە بەکاریان دەهێنان، وەك ئەو پێڵاوانەی ئێستاش بەکاریان دەهێنین، ئینجا تاڵەکان وردە وردە ناسکتر بوونەوە تا بوونە بەن، ئەوسا ڕستن بوو بەگرنگترین هونەرەکانی ژنان، ئەو تەشوێیانەی نێو شوێنەوارەکانی شاخی بەردینی نوێ ڕەچەڵەکێکی زۆر مەزنی پیشەسازیی مرۆڤ دەردەخەن، بگرە لەو شوێنەوارانەدا تەنانەت ئاوێنەش دەبینرێت[٣٧]، کەواتە هەموو شتێك بۆ چوونە ناو ژیاری ئامادە بوبوو.

هـیچ شـوێنەوارێکی کووپەڵـەی بەشـی یەکـەمی چـاخی بـەردینی مـەزنمان نەدۆزیوەتـەوە، بـەڵکو چـەند پارچـەیەکی کووپەڵـەکان گەرێندراونەتـەوە سـەر شوێنەوارەکانی کەلتووری مەگدەلی لەبەلژیک[٣٨]، بەڵام لەچاخی بـەردینی نوێدا کەچـەند پاشماوەیـەکی زیـادەی ئاشـپەزی بـۆ بـەجێ هێـشتووین، لـەم چـاخەدا پاشماوەیەکی کووپەڵە بـەدی دەکـەین کەتاڕادەیـەك پیـشەسازییەکی گەشـەکردوو نیـشان دەدات، دیـارە ئاشـزانین ئـەم پیـشەسازییە چـۆن سـەری هەڵـداوە، دەشـێت مرۆڤی سـەرەتایی سـەرنجی ئـەوەی دابێـت کەشوێن پێیەکـەی خـۆی لەسـەر قـوڕ ئاوی تێ دەڕژێتو ئاوەکـەش لێـی ناچـێت[٣٩]، هـەروەك دەشـێت بەرێکـەوت پارچـە قوڕێـك کەوتبێتـە لای ئاگرێکـەوەو وشـك بووبێتـەوە، بـەو وشـکبوونەش ئـەو بیرۆکەیـەی لەشـێوەی ئیلـهام گەیاندبێتـە مـرۆڤ کـەداهێنانی کووپەڵـەی لێکەوتۆتەوە، ئەو بوارانـەی بـۆ دەرخستبێت کـەدەکرێت ئـەو کەرەستەیەی تێـدا بەکاربهێنرێ کەزۆروزەوەندەو کەدەست چۆنیشی بوێت دەیسووڕێنێتو بـەئاگرو بەتیشکی خۆریش بەئاسانیش وشـك دەکرێتـەوە ، بێگومـان مـرۆڤ هـەزارەها ساڵ لەقاپی سروشتی لەو بابەتەدا خواردنو خواردنەوەی خـۆی هـەڵگرتووە، هـەروەها لـەجامی کاڵـەكو گـوێزی هینـدیو گوێچکە ماسیی دەریـادا، دواتـریش پـەرداخو کـەوگیری لەتەختـەو دار بـۆ خـۆی دروسـت کـرد، هەرچـۆن سەبەتەشـی لـەتاڵو لەپووش دروستکرد، دواجاریش قاپێکی تری بۆ خۆی دروستکرد کـەزۆر لـەقوڕی وشـککراوە تەمـەنی زیـاتر بـوو، بـەوەش داهێنـانێکی نـوێی هێنایـە ئـاراوە کەبەیەکێك لەمەزنترین پیشەسازییەکانی مرۆڤ دادەنرێت، بـەڵام مرۆڤی چاخی بەردینی نوێ خولخولۆکەی کووپەڵەچیی لـەلا نـەبوو، وەك ئـەوەی پاشماوەکـانی بەردەسـتمان پێمـان دەڵـێن، بـەڵکو بەدەسـتی خـۆی چـەندین شـێوەی جـوانو بەکـەڵکی دروسـت دەکـرد، هـەروەها کووپەڵەکەشـی بەنەخـشێکی سـاویلکانە دەنەخـشاند[٤٠]، بـەوەش پیـشەسازیی کووپەڵـەی هـەر لەسـەرەتایەوە تێپەڕانـد کەبەتەنها پیشەسازی بێتو کردیە هونەریش.

هەر لێرەشدا نیشانەکانی یەکێك لەمەزنترین پیشەسازییە بەراییەکان دەبینین، پیشەسازیی بیناسازی، مرۆڤی چاخی بەردینی کۆن هیچ شوێنەوارێکی خەڵکانێکی بۆ بەجێ نەهێشتووین کەنیشتەجێی دەرەوەی ئەشکەوت بن. تا کاتێك دەگەینە چاخی بەردینی نوێ کەئیدی هەندێك ئامرازو کەرەستەی بیناسازی دەبینین، وەك پەیژەی تەختەو خولخولۆکەو نوێڵو خشتبڕ[١]، دانیشتوانی دەریاچە دارتاشی لێهاتوو بوونو دنگەی تەختەیان بەتەلاشی تەختەی جێگیر بەبناغەی خانووەوە دەبەستەوە، یان سەری داری دنگەکەیان لەگەڵ سەری بناغەکە دەگەیاندەوە یەكو بۆ بەهێزتر کردنی دنگەکەش تەختەیان لەملاو ئەولای دەدا، ئەرزی ژوورەکانیشیان لەقوڕ بوو، دیوارەکانیش لەلقی لێك ئاڵێندراو دروست دەکردو بەقوڕ سواغیان دەدا، بنمیچەکەشیان لەپووشو پەلاشو قامیشو چڵەدار دروست دەکرد، دواتریش لەرێی خولخولۆکەو تایەوە مرۆڤ توانی کەرەستەکانی بیناسازی لەملا ببات بۆ ئەولا، کەوتە بەردی زل زل وەك بناغە بۆ گوندەکانی، هەروەك خودی گواستنەوەش بوو بەیەکێك لەپیشەسازییەکان. ئیدی ئەو بەلەمانە دروستکران کەبێگومان دەبێت ئەو دەریاچانەیان پڕ کردبێت لەجموجووڵ، بازرگانیش گەیەندرایە ئەودیوی چیاکانو کەوتە نێوان کیشوەرەکانەوە[٢]، ئەوروپاش کەوتە هاوردەکردنی بەردە دەگمەنەکانی وەك (عەنبر)و (بەشەم)و (مەرمەری ڕەش)[٣]. ئەگەر بگەڕێیت لێکچوونێکی زۆر دەبینیت لەنێوان شوێنە جیاجیاکانی زەویدا لەڕووی وشەو پیتو ئەفسانەو ئیشی قوڕو وێنەکانەوە، ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە کە بەر لەمێژوو جۆرێك لەپەیوەندیی کەلتووری لەنێوان گروپەکاندا هەبووە[٤].

بەبێ کاری قوڕکاریو کووپەڵەدروستکردنیش، چاخی بەردینی نوێ هیچ هونەرێکی تری بۆ بەجێ نەهێشتووین بتوانین لەگەڵ مرۆڤی چاخی بەردینی کۆندا بەراوردی بکەین وەك وێنەکێشانو دروستکردنی پەیکەر، ئەوەتا لێرەو لەوێ لەنێو دیمەنەکانی ئەو چاخە بەردینە نوێیەدا، لەئینگلتەراوە تادەگاتە

چین، چەندین کەڵەکە بەردی خڕ دەبینین، یان چەندین دنگەو شوێنەواری زەبەلاحی بیناسازی دەبینین کەنازانین مەبەست لەبیناکردنیان چی بووە، وەك ئەو شوێنەوارانەی لەستۆنهێنگ یان مۆربهان هەن. بەلای زۆریشەوە مانای ئەو شوێنەوارە بیناسازییانەو ئەرکەکانیان هەرگیز نازانین، ڕەنگە پاشماوەی شوێنی سەربڕینی قوربانی بن یان پەرستگا[45]، چونکە گومان لەوەدا نییە کەدەبێت مرۆڤی چاخی بەردینی نوێ ئایین و ئەفسانەی خۆی هەبووبێت کەسەرکەوتن و شکستی ڕۆژانەی خۆری پێ وێنا بکات، یان مردن و زیندووبوونەوەی بەردەوامی خاك، یان ئەو کاریگەرییە سەیرانەی پێ وێنا بکات کەمانگ بەسەر زەوییەوە بەجێیان دەهێڵێت. مەحاڵە لەبیروباوەڕەکانی مرۆڤی چاخەکانی مێژوو بگەین بەبێ گریمانە کردنی ئەوەی ئەو بیروباوەڕانە ڕەگیان لەقۆناغی بەر لەمێژوودا داکوتابێت[46]، دەشێت ڕێزکردنی بەرد لەو بینایانەدا لەئەنجامی چەند ئیعتبارێکی گەردوونی بووبێت، بەڵگەش بێت بۆ ئەوەی ئەوانە سالژمێریان هەبووە —وەك شنایدەر بۆی دەچێت-[47]، خەڵکی ئەو سەردەمە بڕێك مەعریفەی زانستیشیان هەبوو، چونکە هەندێك کاسەسەری چاخی بەردینی نوێ دۆزراونەتەوە کەشوێنەواری نەشتەرگەرییان پێوە دیاربووە، هەندێك پەیکەری ئێسکیش دۆزراونەتەوە کەوەها دیارە ئەندامێکیان شکابێت و گیرابێتەوە[48].

ئێمە توانای ئەوەمان نییە بەتەواوی ئەو کارانە بخەملێنین کەمرۆڤ بەر لەدەست پێکردنی مێژوو ئەنجامی داون، چونکە لەلایەکەوە ناکرێت دوای خەیاڵی خۆمان بکەوین لەوێناکردنی ژیانی ئەو مرۆڤانەدا بەڕادەیەك کەبەڵگەو پاساوی نیشانەکان ڕەت بکەینەوە، بەڵام لەلایەکی تریشەوە ڕەنگە گومانی ئەوەمان لەلا دروست ببێت کەچەرخی زەمانە شوێنەوارگەلێکی لەناو بردبێت کەئەگەر لەناو نەچوونایە ماوەی نێوان مرۆڤی سەرەتایی و مرۆڤی سەردەمی بەتەواوی بەرتەسکتر دەکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەڵگانەی لەبەردەستماندان لەسەر هەنگاوەکانی پێشکەوتنی مرۆڤی چاخە بەردینەکان، هەر ئەو بەڵگانە

بەسن بۆ خەملاندنی ئەو مرۆڤە، بەسمانە ئەو پیشەسازییانە بزانین گەلەچاخی بەردینی کۆندا دەرکەوتوون لەگەرەستەسازیو دۆزینەوەی ئاگرو گەشەسەندنی هونەرەکان، بەسیشمانە ئەوە بزانین کەلەچاخی بەردینی نوێدا دەرکەوتوە لەکشتوکاڵو بەخێوکردنی ئاژەڵو چنینو ئیشی قورکاریو بیناسازیو گواستنەوەو هونەرو هەروەها زاڵبوونی بێ گرێوگۆڵی مرۆڤ بەسەر زەویداو بەردەوام ئاوەدانکردنەوە بەتوخمی مرۆیی. بەو شێوەیەش هەموو بناغەکانی ژیار دارێژرا. هەموو شتێك بۆ ژیارەگان ئامادە گران تەنها (بەمەزەندەی ئێمە) کانزاکانو نووسینو دەوڵەت نەبێت، مرۆڤ رێگەیەکی کەوتە بەردەم بۆ تۆمارکردنی بیروڕاو کردارەکانی بەجۆرێك کەبکرێت بەتەواوی بەئەمانەتەوە نەوە بەنەوە بگوازرێتەوەو ژیاری پێ دەست پێ بکات.

## بابەتی پێنجەم
## قۆناغی گواستنەوە بۆ چاخەکانی مێژوو

### ١ـ دەرکەوتنی کانزاکان

### مس – برۆنز – ئاسن

کەیو چۆن مرۆڤ دەستی بەبەکارهێنانی کانزاکان کرد؟ ئێمە ئەوە نازانین، لێرەدا جارێکی تر ئەو قسەیە دەکەینەوە، تەنها دەتوانین بڵێین (ئەویش وەك گومان)کە لەرێی رێکەوتەوە ئەوە روویداوە، بەگریمانەش دەڵێین رەنگە سەرەتای ئەم پرۆسەیە بگەرێتەوە بۆ چاخی بەردینی نوێ. ئەو راستیەش پشتی ئەم گریمانەیەمان دەگرێت کەهیچ نیشانەیەکی بەکارهێنانی کانزامان لەشوێنەوارەکانی چاخەکانی پێش ئەو مێژوەدا نەبینیوە، جا ئەگەر ئەو مێژوەش بە٤٠٠٠ پ.ز یان ئەو دەوروبەرە دابنێین، ئەوە وێنەیەکی چاخی

کانزایی‌و (نووسین‌و ژیار) دەبینین کەلەشەش هەزار ساڵ تێناپەڕێت، ئەو وێنەیەك وەك کلکێکی بچووکی پاش چاخێکی بەردین دەبینین کەبەلای کەمەوە چل هەزار ساڵی خایاندوە، یان پاش تەمەنێکی درێژی مرۆڤ بووە کەماوەی یەك ملیۆن ساڵی خایاندوە، دە بزانە ئەو چاخەی مێژوو بۆی تۆمار کردووین چەندە تازەیە.

مس یەکەمین کانزا بووە کەبەنەرمی بەدەستی مرۆڤەوە هاتبێت بۆ بەکارهێنان، ئەوەندەی ئێمە بزانین، ئەوەتا لەماڵێکی (ماڵەکانی دەریاچەدا) لەنزیك رۆیتهاوزن لەسویسرا ئەوە دەبینین. ئەو بەکارهێنانەش دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری شەش هەزار ساڵ پ.ز[49]، هەروەها لەخاکی میزۆپۆتامیادا (لەنێوان دیجلەو فورات) شوێنەوارێکی تری دەبینین دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ٤٥٠٠ پ.ز. دواتریش لەگۆڕستانەکانی بەداری لەمیسر بەرچاومان دەکەوێت‌و دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٤٠٠٠ پ.ز. هەروەها لەشوێنەواری نور دەیبینینەوەو دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ٣١٠٠ پ.ز. لەشوێنەوارەکانی (بیناکارانی کێو) لەئەمریکای باکوور دەیبینین کەدەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێك بەئێمە دیاری ناکرێت. سەرەتای چاخی کانزاییش ناگەڕێتەوە بۆ ئەو مێژووەی کەتیایدا کانزا دۆزراوەتەوە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی تیایدا لەرێی ئاگرو گوتانەوە ئەو کانزایانە وەها نەرم کراون کەبەکەڵکی مرۆڤ بێن. زانایانی کانزا پێیان وایە یەکەمین بەکارهێنانی مس لەکانە بەردەکاندا بەرێکەوت بووە، ئەویش ئەو کاتە بووە کەبەرێکەوت ئاگرێك بۆ گەرمبوونەوە کراوەتەوەو ئەو ئاگرە مسی ڕووکاری بەردەکانی نزیکی ئاگرەکەی تواندۆتەوە، ئەو رێکەوتە زۆر جاری تر تووشی گردبوونەوەکانی خەڵکانی سەرەتایی بۆتەوە بەدەوری ئاگرەکانیاندا، جا ڕەنگە ئەو ڕووداوە سەرپێییە دواجارو پاش چەندین جار دووبارە بوونەوەی پاڵی بەمرۆڤی سەرەتاییەوە نابێت ئەو کەرەستە نەرمە بۆ کەرەستەو چەکەکانی بەکار بهێنێت دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورو درێژ بەبێ هیچ بیرکردنەوەو

دوودڵییەك بەردی ڕەقو تەقی بەکاردەهێنا، چونکە ئەو مادەیە لەبەرد نەرمتر بەکار دەهاتو زۆرتریش بەرگەی دەگرت، بەلای زۆریشەوە سەرەتا کانزا وەك جۆن لەسروشتدا هەبوو وەك خۆی بەکار دەهێنرایەوەو جارجارە بێخەوش‌و جارجارە پڕ لەخڵتە دەبوو، پاش ئەوە بەماوەیەکی زۆر –کەڕەنگە ئەمە لەدەوروبەری ٣٥٠٠ پ.زدا بوبێت- لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاستدا خەڵك بەسەر هونەری تواندنەوەی کانزادا کەوتن‌و فێربوون لەکانگاکانی خۆیان دەریان بهێنن، دواتریش لەنزیکەی ١٥٠٠ پ.ز کەوتنە لەقاڵبدانی ئەو کانزایانە بەپێی ئەو نەخشە دەرکەوتووانەی لەگۆڕستانی ڕەخ مارا لەمیسر دۆزراونەتەوە. ئەوەبوو مسی تواوەیان دەخستە قاپێکی فورێن یان ناو لم‌و وازیان لێ دەهێنا هەتا بەو شێوەیە سارد بێتەوە کەدەمیانویست، ئیدی وەك سەرەڕم یان وەکو پاچ، هەرئەوەندەش خەڵك فێری ئەو کردەوەیە بوون لەگەڵ مسدا بۆ کۆمەڵە کانزایەکی تریش کەوتنە بەکارهێنانی. بەو جۆرە مرۆڤ چەندین توخمی بەهێزی کەوتە بەردەست کەمەزنترین پیشەسازییەکانی پێ دابمەزرێنێت، ڕێگەشی بۆ خۆش بوو هەتا پەلاماری زەمین‌و دەریاو ئاسمان بدات، خۆ دەشێت زۆری توخمی مس لەخاکەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاستدا بووبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی چەند کەلتوورێکی تۆکمەو بەهێز لەهەزارەی چوارەمی بەر لەزاییندا، لە(ئیلام)و (میزۆپۆتامیا)و میسردا، ئەوسا لەو ناوچانەوە ئەو کەلتوورانە پەلیان بۆ هەموو ئاوەدانییەکی سەر زەوی هاویشت.

بەڵام مس بەتەنها نەرمە، وێڕای ئەوەی زۆر بەباشی کاری لەسەر دەکرێت بۆ دروستکردنی کۆمەڵێك لەپێداویستییەکانمان (ئەگەر مس نەبووایە لەم چاخی کارەبایەی ئێمەدا چیمان بکردایە؟) بەڵام لاوازترە لەوەی بۆ ئەرکەکانی شەڕیش‌و ئاشتیش بەکار بهێنرێت کەکانزایەکی بەهێزتریان دەوێت، بۆیە دەبوو توخمێکی تر بدۆزرێتەوەو بخرێتە سەر مس بۆ ڕەقتر کردنی، ئەگەرچی سروشتیش خۆی ڕێگەی پیشانی مرۆڤ دا بەرەو ئەو توخمانەی دەکرێت بیانخاتە

سەر مس بۆ ئەو مەبەستە. بگرە خودی سروشت زۆر جار مسێکی دەدایە کەبەفیعلی لەگەڵ توخمی تردا تێکەڵ بووبوو و بووبووە توخمێکی زۆر رەقو بەهێز، وەك قەسدیرو زنك. ئیدی مسەکە گۆڕابوو بۆ برۆنزێکی سروشتی یان بۆ مسی زەرد، وێڕای ئەو هاوکارییەی سروشت بەڵام –وەك ئێمە بزانین- مرۆڤ چەندین سەدەی ویست تا هەنگاوی دووهەمی لەوبارەیەوە نا، مەبەستم تێکەڵکردنێکی دەست ئەنقەستی کانزایەك لەگەڵ کانزایەکی تر بۆ ئامادەکردنی ئاوێتەی باشتر لەبەکارهێناندا، بەهەرحاڵ مرۆڤ لانی کەم بەر لەپێنج هەزار ساڵ رێی بردەوە سەر ئەم دۆزینەوەیە، چونکە لەپاشماوەکانی کریت کەدەگەرێنەوە بۆ ٣٠٠٠ پ.زو لەشوێنەوارەکانی میسر کەدەگەرێنەوە بۆ ٢٨٨ پ.زو لەدووهەمین شاری تەروادەکاندا کەدەگەرێتەوە بۆ ٢٠٠٠ پ.ز برۆنزمان دۆزیوەتەوە. کەوابێت چاخێکمان نییە بەمانای چاخی برۆنز ئەگەر بمانەوێت وشەکە بەرامبەر مانای راستەقینەی خۆی بەکار بهێنین، چونکە ئەو کانزایە لای چەند گەلێکی جیاجیاو لەچەند ماوەیەکی جیاجیادا دەرکەوتوە، دەستەواژەی چاخی برۆنزیش بەو پێیە مانایەکی زەمەنی بەدەستەوە نادات ، بێجگە لەوەی هەندێك کەلتووری مرۆیی بەسەر چاخی برۆنزدا تێپەڕیون بۆ چاخی دوای ئەو، واتە لەچاخی بەردینەوە یەکسەر پێیان ناوەتە چاخی ئاسنەوە، وەك کەلتوورەکانی فینلەنداو باگووری روسیاو پۆلینیزیاو ئەفەریقای ناوەڕاستو باشووری هیندو ئەمریکاو ئوسترالیاو ژاپۆن[٥٦]. بگرە ئەو کەلتوورانەش کەقۆناغی برۆنزیان بینیوە، ئەم کانزایە تەنها پێگەیەکی لاوەکیی هەبووە لەناویانداو وەها سەیر کراوە کەکەرەستەی رابواردنی تایبەتە بەکاهینو شاو چینە باڵاکەی خەڵك، لەکاتێکدا چینی رەشوڕووتی خەڵك هەر لەچاخە بەردینەکەی خۆیاندا مابوونەوەو رەتیان نەدەکرد[٥٧]، خۆ هەتا ئەو دوو دەستەواژەیەی چاخی بەردینی کۆنو چاخی بەردینی نوێ، تا رادەیەکی زۆر رێژەییینو چەند شێوەیەکی ژیان وەسف دەکەن زیاتر لەوەی چاخو سەردەمانێکی دیاریکراو وەسف بکەن، چونکە هەتا ئەم سەردەمەی ئێمەش زۆر

گەلی سەرەتایی هەن هێشتا لەچاخی بەردینی خۆیاندا دەژین، وەك ئەسکیمۆکان‌و دانیشتووانی دورگەکانی پۆلینیزیا کەئاسن نەچۆتە ژیانیانەوەو وەك کەرەستەیەکی ڕابواردن سەیری ئاسن دەکەن کەگەڕیدە بیانییەکان لەگەڵ خۆیان هەڵیدەگرن. کاتێك کاپتن کۆك پاپۆڕەکەی لەسالی ١٧٧٨دا لەنیوزیلەندا راگرت، چەند بەرازێکی بەبزمارێك کڕی کەنرخەکەی تەنها شەش پنس بوو (دوو قرش‌و نیو). گەڕیدەیەکی تریش وەها باسی دانیشتووانی دورگەی سەگ دەکات کەبەرامبەر ئاسن زۆر نەوسنن، بەڕادەیەك لەدڵەوە تەماع دەیانگرێت هەموو بزماری پاپۆڕەکان دەربهێنن[٥٨].

ئەگەر برۆنزیش زۆر بەهێزو پتەو بووبێت، بەڵام مس‌و قەسدیر کەبۆ ئامادەکردنی پێویستن ئەوەندە بەبڕی زۆر دەست نەدەکەوتن، یان ئەوەندە نزیکە دەست نەبوون کەبەشی مرۆڤ بکەن بۆ کاروبارەکانی پیشەسازی‌و جەنگ، بۆیە دەبوو زوو بێت یان درەنگ ئاسن بێتە ئاراوە. یەکێکیش لەشتە ئاوەژووەکانی مێژوو ئەوەیە کەئاسن -کەچەندیش زۆرە لەسروشتدا- کەچی پاش مس‌و برۆنز دۆزراوەتەوە!، ڕەنگە یەکەم بەکارهێنانی ئاسن لەلایەن خەڵکەوە بەکارهێنانی ئاسنی نەیزەکەکان بووبێت، وەکو (بیناکارانی کێو)و هەندێك لەسەرەتاییەکان هەتا ڕۆژی ئەمڕۆش —وەك پێدەچێت- دەیکەن. ڕەنگیشە دوای ئەوە بەئاگر کانزاکەیان هەر لەکانگاکەی خۆیدا تواندبێتەوە، ئەوسا بەچەکوش لێیان داوە هەتا هاتۆتە بەردەست، لەگۆڕستانەکانی میسردا شتێکمان دۆزیوەتەوە کەلەئاسنی نەیزەك دەچێت‌و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بەر لەخانەوادەی شاکانی ئەوێ.. نەخشە بابلییەکانیش وەك کالایەکی دەگمەن‌و گرانبەهای پایتەختەکەی حامورابی (٢١٠٠پ.ز) باسی ئاسن دەکەن، لەرۆدیسیای باکووریش قاڵبێکی ئاسن دۆزراوەتەوە کەدەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ٤٠٠٠ ساڵ بەر لەئێستا، هەرچۆن دەرهێنانی ئاسن لەباشووری ئەفەریقاش شتێکی تازە نییە، کۆنترین ئاسنی کارکردووش کەبیزانین بریتییە لەکۆمەڵێك چەقۆ کەلەجیرار لەفەلەستین

دۆزراونەتەوە، بوترا مێژووەکەیان دەگێڕێتەوە بۆ نزیکەی ١٣٥٠ پ.ز. ئینجا بەسەدەیەکی تەواو پاش ئەوە ئاسن لەمیسر لەسەردەمی شای مەزن رەمسیس-ی دووهەمدا دەرکەوتوە، دوای سەدەیەکیش لەوێ لەدورگەکانی دەریای ئیجە دەرکەوتۆتەوە، بەلام لەرۆژاوای ئەوروپادا، ئەوە لەهۆلستات لەنەمسا لەدەوروبەری ٩٠٠ پ.ز دا دەرکەوتوە. لەشاری لاتین لەسویسراش لەدەوروبەری ٥٠٠ پ.زدا دەرکەوتۆتەوە، هیندیش ئەو کاتە بەم پیشەسازییە ئاشنا بوو کەئەسکەندەر لەگەڵ خۆی بردی بۆ ئەوێ، ئەمریکاش لەرێی کۆلۆمبسەوە پێی ئاشنا بووە، ئۆقیانووسیاش لەرێی کۆک-ەوە[59]، بەو خێراییو هەنگاوە قورسانەوە ئاسن سەدە لەدوای سەدە کەوتە گەڕان بەجیهانداو هەموو جیهانی گرتەوە.

## ٢- نووسین

## ڕەچەڵەکە قوڕییەکانی – هێماکانی نووسینی دەریای ناوەڕاست – نووسینی هێرۆگلیفی – پیتەکانی هیجا

گەورەترین هەنگاوی مرۆڤ بەرەو ژیار بریتییە لەنووسین. لەچەند پارچە قوڕێکی شێلراوی چاخی بەردینی دوهەمەدا کەبۆمان ماونەتەوە هەندێك هێلی ڕەنگاوڕەنگ هەن کەمزۆر لەلێکۆڵەرەوەکان وەك هێمای نووسین لێیان دەڕوانن[60]، ڕەنگە ئەم قسەیە جێی گومان بێت، بەلام ڕەنگە نوسین –بەمانا فراوانەکەی کەبریتییە لەکۆمەڵێك هێمای وێنەیی بیروڕای مرۆڤ دەردەبڕێت- بەو نیشانانە دەستی پێکردبێت کەبەنینۆك یان بەبزمار لەسەر قوڕی نەرم هەڵکەندراون، چ بۆ نەخشاندن بووبێت یان بۆ جیاکردنەوەی پاش ئەوەی دەبێتە کووپەڵە، ئەوەتا لەکۆنترین نووسینی هێرۆگلیفیدا شێوەی باڵندە لێکچوونێکی هەیە لەگەڵ ئەو نەخشاندانەی شێوەی باڵندە کەلەکۆنترین پاشماوە قوڕکارییەکانی سۆزای (ئیلام)دا هەن. هەروەها کۆنترین وێنەکانی دەغڵیش کەلەنووسینی وێنەییدا بەکارهاتوون

ڕاست لەو نەخشە ئەندازەییانەی دەغڵەوە وەرگیراون کەلەسۆزاو سۆمەردا هەبوون. پیتە ڕاستەهێڵەکانیش کەپێدەچێت سەرەتا  لە نزیکەی ٣٦٠٠پ.ز دا لەوڵاتی سۆمەردا سەریان هەڵدا بێت، ج نین بێجگە لەوێنەیەکی کورتکراوەی هێماو وێنەی کێشراو یان چاپکراوەکانی سەر کووپەڵەی سەرەتایی بەشە نزیکەکەی وڵاتی میزۆپۆتامیا یان ئیلام[٤٦٠]. کەوابێت نووسینیش —وەك وێنەکێشان‌و پەیکەرتاشی- ڕەنگە ڕەچەڵەکی بچێتەوە سەر هونەری کووپەڵە دروستکردن، چونکە وەك جۆرێك لەنەخش‌و وێنە سەری هەڵداوە، بەو پێیەش هەمان ئەو هەوێنەی لەدەستی فورکاردا بوو بەکووپەڵەو لەدەستی پەیکەرتاشدا بوو بەبت‌و لەدەستی بیناسازدا بوو بەخشتی فوڕ، هەر ئەو بوو بەو کەرەستەیەی کە نووسەر بۆ نووسین بەکاری هێنا، ڕێچکەی گەشەکردنیش لەم سەرەتایەوە بەرەو نووسینی بزماریی وڵاتی میزۆپۆتامیا ڕێچکەیەکی لۆژیکییەو قۆناغەکانی زانراون.

کۆنترین هێما وێنەییەکان کەنێمە بیانزانین ئەوانەن کەفلیندەر پیترا لەسەر چەند پارچە فەخفوری‌و کووپەڵەیەك‌و لەسەر چەند پارچە بەردێك دۆزینییەوە، ئەوانیش لەنێو چەند پاشماوەیەکی گۆڕستانەکانی بەر لەمێژوودا بوون، لەمیسرو ئیسپانیاو ڕۆژهەڵاتی نزیك، تەمەنیشی (بەو بەخشندەییەوە کەهەیبووە لەخەملاندنی تەمەندا) گەڕاندۆتەوە بۆ حەوت هەزار ساڵ. ئەم هێمایانەی نووسین کەلەحەوزی دەریای سپیی ناوەڕاستدا دۆزرانەوە لەنزیکەی ٣٠٠ هێما پێکدێن کەزۆربەیان لەهەموو شوێنەکاندا لەیەك دەچن. بەوەش دەبنە بەڵگە لەسەر هەبوونی پەیوەندیی بازرگانی لەنێوان هەردوو کەناری دەریای سپی لە٥٠٠٠ پ.ز ەوە، ئەم هێمایانە وێنەش نین، بەڵکو زۆربەیان نیشانەی بازرگانین —چەند نیشانەیەکن بۆ موڵکداری‌و بڕو زانیاریی تری پێویست بۆ ئاڵوگۆڕی بازرگانی- جا ئەگەر ئەو ڕەچەڵەکە سادەیە ئازارێکی تێدا بێت بۆ چینی مام ناوەنجیی دەوڵەمەندەکان، ئەوە دڵنەواییەك بۆ ئەوان لەوەدایە کەئەدەبیش بەرەچەڵەك دەگەڕێتەوە بۆ وەسڵی حیسابات‌و باری کەشتییەکان. ئەو نیشانانە پیتیش نەبوون،

چونکە هەر نیشانەیەك وشەیەك یان بیرۆکەیەکی تەواو بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەیان زۆر لەپیتەکانی هیجای فینیقییەکان دەچن. پیترا لێرەوە دەگاتە ئەوەی کە "کۆمەڵە هێمایەکی زۆر لەسەرەتادا بۆ زۆر مەبەست بەکار دەهاتن، ئەوسا لەگەڵ بازرگانیدا ئاڵوگۆڕی ئەو هێمایانەش کراو لەوڵاتێکەوە پەڕینەوە بۆ وڵاتێکی تر، تا ئەو کاتەی نزیکەی شەش هێمایان سەرکەوتنیان بەدەست هێناو بوونە موڵکی هاوبەشی گرووپێك لەدەستەکانی بازرگانیکردن، لەکاتێکدا هێماکانی تر کەتەنها لەیەك وڵاتدا بەکار دەهاتن وردە وردە لەبەر گۆشەگیرییان مردن‌و پووکانەوە"[٦١]، ئەو تیئۆرییەش کەدەڵێت ئەو نیشانە هێماییانە ڕەچەڵەکی پیتی هیجائین، بەڕاستی تیئۆرییەکە شایستەی بایەخ پێدانە"، ئەو تیئۆرییەی مامۆستا پیترا تاکە زانایە باوەڕی پێی بێت[٦٢].

ئەم هێما بازرگانییە سەرەتاییانە هەرچۆن گەشەیان کردبێت، ئەوە جۆرێك لەنووسین وەك لقێکی وێنەکێشان شانبەشانی لەبرەودا بووە، لەو سەردەمانەدا بەوێنە گوزارشت لەبیرۆکەیەکی بەردەوام دەکرا، هەتا ئێستاش چەند تاوێرێکی دەریاچەی سەروو (دەریاچەی سۆبیرێر) چەند شوێنەوارێکی وێنەی ناقۆڵای هەڵگرتووە کەهیندییەکانی ئەمریکا بۆ گێڕانەوەی چۆنێتیی پەڕینەوەیان لەدەریاچە مەزنەکە بەکاریان هێناون‌و ئەوەشیان بۆ نەوەکانی دوای خۆیان یان بۆ هاوڕێکانی خۆیان گێڕاوەتەوە، گێڕانەوەیەك جۆرێك لەشانازیکردنی تێدایە بەو کارەوە کەئەنجامیان داوە[٦٣]، هەر پێشکەوتنێکی لەو بابەتە وێنەی لە سەرلەبەری حەوزی دەریای سپیی ناوەڕاستدا لەکۆتاییەکانی چاخی بەردینی نوێدا گۆڕیوە بۆ نووسین بەدڵنیایی تەواویشەوە لەگەڵ هاتنی ساڵی ٣٦٠٠ پ.زدا (ڕەنگیشە بەر لەو مێژووە بەماوەیەکی زۆر ئەمە ڕوویدابێت) ئیلام‌و سۆمەرو میسر کۆمەڵێك وێنەیان بەجۆرێك دەستکاری کردووە کەلەڕێیەوە بیروڕاکانی خۆیان دەربڕن، ناویشیان لێناوە نووسینی هێرۆگلیفی، چونکە زۆربەی ئەوانەی بەکاریاندەهێنان کاهینەکان بوون[٦٤]، کۆمەڵێکی تری لەو جۆرە وێنانەش لەدەوروبەری ٢٥٠٠ پ.زدا لەکرێت

دەرکەوتن، دواتریش دەبینین چۆن ئەو نووسینە هێرۆگلێفییەی هەر وێنەیەك تیایدا بیرۆکەیەکی هەڵدەگرت بەهۆی بەکارهێنانی هەڵەوەو پاشانیش بەهۆی ئەو تەناسوقو ڕێکخستنە نەریتگەرییەوەی کە هەیبوو بوو بەبڕگە بڕگە، واتە کۆمەڵێك هێما کەهەر یەکێکیان ئاماژەیە بۆ بڕگەیەکی دەنگی، دواجاریش کۆمەڵێك هێمای تر بەکارهێنراون بۆ ئەوەنا کەئاماژە بن بەهەموو بڕگەکە، بەڵکو وەك ئاماژە بەدەنگی سەرەتای بڕگە. بەوەش بوونە پیت. ڕەنگیشە مێژووی ئەم نووسینە هێرۆگلێفییە بگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۳۰۰۰ پ.ز[٦٥] و لەمیسر سەری هەڵدابێت، هەرچی کرێت-یشە ئەوە لەساڵی ۱٦۰۰ پ.ز دا ئەو گۆڕانەی بەخۆیەوە بینی[٦٦]. لەڕاستیدا فینیقییەکان پیتەکانی هیجایان دانەهێناوە، بەڵام وەك کاڵایەك کڕینو فرۆشیان پێوە کردووە، بەپێی زانیارییەکانی ئێمە لەگەڵ خۆیان بردوویانە بۆ میسرو کرێتو بەش بەش گەیاندوویانەتە سورو سەیداو بایبلۆس، دواتریش بەرەو هەموو شارەکانی دەریای سپیی ناوەڕاست، هەناردەیانکردووە بەو جۆرە ئەو فینیقییانە بازرگانی پیت بوونو لەخاوەنە ڕاستەقینەکانی خۆیان وەردەگرتو بڵاویان دەکردەوە. ئەوان داهێنەری نەبوون، ئیدی کاتێك سەردەمی هۆمەر-یش هاتە پێشێ، گریکەکان ئەو پیتە فینیقییانەیان وەرگرت، یان بابڵێین ئەو پیتانەی هەموو ئارامییەکان لەدروستکردنیاندا بەشدار بوون، گریکەکان ئەو دوو ناوە سامییەشیان لەپیتەکان دەنا کەلەیەکەمین دوو پیت پێکدەهات (ئەلفا-بیتا) بەزمانی عیبریش (ئەلف-بیت)[٦٧].

وەك دەردەکەوێت نووسین لەئەنجامی بازرگانییەوە کەوتەوە، بووە ئامرازێکی ئاسانکاریش بۆ بازرگانی، بۆیە لێرەشدا دەبینین چۆن کەلتوور قەرزداری بازرگانییە، چونکە کاتێك کاهینەکان چەند وێنەیەکیان بۆ خۆیان دروستکرد کەدەستەواژە جادوویيو توفووسگەریو پزیشکییەکانی خۆیانی پێ بنوسنەوە، ئەو کاتە دوو گروپ یەکیان گرت: دنیاییو ئایینی، ئەو دوو گروپەی لەکاتی ئاساییدا هەمیشە لەململانێدان، ئەو دوو گروپە بەشێوەیەکی کاتی یەکیان گرت بۆ ئەوەی مەزنترین داهێنانی مرۆیی بهێننە ئاراوە، لەو کاتەوە کەمرۆڤ فێری ئاخافتن بووە.

دەتوانین بڵێین نووسین ئەو شتەیە کەبەخەڵق کردن ژیاری خەڵق دەکات، چونکە نووسین ڕێگەی نووسینەوەو تۆمارکردنی مەعریفەو گواستنەوەی بوو. هەروەك ئامرازی گەشەکردنی زانستو ئەدەبیش بوو، ئامرازی بڵاوبوونەوەی ئاشتیو سیستمیش بوو لەنێوان هۆزە دژ بەیەکەکاندا، کەوێڕای دژایەتییان پێکەوە گرێ درابوونەوە، چونکە بەکارهێنانی یەك زمان وای لێدەکردن ملکەچی یەك دەوڵەتیش بن، سەرەتای دەرکەوتنی نووسین لەخۆیدا ئەو سنوورەیە کەسەرەتای مێژوو دیاری دەکات، ئەو سەرەتایەش تاچەندە مەعریفەی مرۆڤ لەبارەی پاشماوەکانی پێشینانەوە فراوانتر بێت ئەویش ئەوەندە بەرەو دواوە دەکشێتەوە.

## ٣ـ سەرەتا بزرەکان

## پۆلینیزیا – ئەتلانتس

مادام ئێستا خەریکە لەمێژووی نەتەوە شارستێنەکان نزیك دەبینەوە، دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کەلەکەلتووری هەر یەکێك لەو نەتەوانەدا تەنها بەشێکی کەم باس دەکەین کەخۆمان هەڵی دەبژێرین، نەك هەر ئەوە، بەڵکو ڕەنگە ژمارەیەکی کەمیش لەو ژیارانە بخەینە بەر باس کەڕەنگە ڕۆژێك لەڕۆژان پایەیان لەسەر زەوی داکوتابێت، چونکە ناتوانین گوێی خۆمان بنووقێنینو ئەو ئەفسانانە نەبیستین کەبەدرێژایی مێژوو لەبارەی کۆمەڵێك ژیار دەگێڕدرێنەوە کەڕۆژێك لەڕۆژان مەزن بوونەو کەلتوورێکی مەزنیان هەبووە، پاشان کارەساتێکی سروشتی یان جەنگێك هاتووەو تێکوپێکی داوەو هیچی لێ بەجێ نەماوە، چونکە ئەو هەڵکۆڵینە نوێیانەمان لەژیارەکانی کریتو سۆمەرو یەقتان هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەگەری ڕاستگۆیی ئەو ئەفسانانە.

لەزەریای ئارامدا لانی کەم شوێنەواری یەکێك لەو ژیارتییە بزربووانە هەیە، چونکە ئەو پەیکەرە مەزنانەی دورگەی ئەبیستەرو ئەوەی خەڵکی پۆلینیزیا

لەبارەی نەتەوەگەلێکی بەهێزو جەنگاوەرانێکی قارەمان دەیگێڕنەوە کەرۆژێك لەرۆژان سەروەرییان بۆ ساماو تاهیتی تۆمار دەکرد، دواتریش توانا هونەری و هەستە شاعیرییەکانی دانیشتووانی ئەو شوێنانە، هەموو ئەوانە بەلگەن لەسەر سەروەرییەکی لەناوچوو، بەلگەن لەسەر هەبوونی گەلێك کەنێستا لەقۆناغی دەستپێکردنی رابوونی ژیاردا نییە، بەڵکو لەقۆناغی دارمانێکدایە لەژیارتییەکی مەزنەوە بەرەو دواوە. لەبنی زەریای ئەتڵەنتیکیشدا بەرزاییەك لەژێر ئاوەوە لەنزیکی ئایسلەنداوە بەرەو ژوور دەبێتەوە هەتا نزیك قوتبی خوارووی زەوی، ئەویش دەبێتە بەڵگەیەکی تر لەسەر ئەو ئەفسانەیەی کە ئەفلاتوون لەوێنەیەکی جواندا بۆمان باس دەکات[68]، وێنەیەك لەمەڕ ژیارێك کەرۆژێك لەرۆژان لەکیشوەرێکدا گەشەی کردووە کە چواردەوری ئاو بووەو کەوتۆتە نێوان هەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەورووپاوە، پاشان لەنێوان شەوو رۆژێکدا ئەو کیشوەرە سەرەنجامی لەرینەوەیەکی زەوی لەناوچووە پاش ئەوەی دەریا هەموو کیشوەرەکەی بەلووشدان لووشداوە. شلێمان (کەتەرەوادەی لەپاش مردنی زیندوو کردەوە) پێی وایە کیشوەری ئەتلانتس ئەڵقەیەکی پەیوەندی بووە لەنێوان هەردوو کەلتووری ئەورووپاو یەفتاندا، میسری کۆنیش ژیاری خۆی لەو ئەتلانتسەوە وەرگرتبێت[69]، ڕەنگیشە خودی ئەمریکا ئەو ئەتلانتسە بێت و ئەم ئەمریکایە رۆژێك لەرۆژان خاوەنی ژیارێکی کۆن بووبێت کەلەچاخی بەردینی نوێدا بەژیارەکانی ئەفەریقاو ئەورووپاوە گرێدرابێتەوە. ڕەنگیشە هەموو دۆزینەوە تازەکانی مرۆڤ بۆ جاری دووهەم بێت کەدەدۆزرێنەوەو دۆزینەوەیەکی تر لەپێشدا هەبووبێت.

بێگومان ڕەنگە —وەك ئەریستۆش بۆی چوە- جیهان گەلێك ژیاری بەخۆیەوە بینیبێت، ژیاری وەها کەگەیشتبنە داهێنانی مەزن و ئامرازەکانی خۆشگوزەرانی،

پاشان ئەو ژیارانە خاپوور بووبن‌و لەیادەوەریی[1] مرۆڤەکانیشدا سڕدرابنەوە، بیکن دەڵێت مێژوو داروپەردووی پاپۆڕێکی تێکشکاوە، چونکە ئەوەی لەڕابردووماندا بزرە زۆرترە لەوەی دەیزانین. دڵنەواییشمان لەم هەموو شتە کەلێمان بزر بووە ئەو بۆچوونەیە کەدەڵێت: وەك چۆن مرۆڤی تاك بەشێکی زۆری ڕووداوەکانی ژیانی خۆی لەبیر دەچێتەوە بۆ ئەوەی هێزی ژیریی لەدەست نەدات، بەهەمان شێوە ڕەگەزی مرۆڤ لەهەموو کەلەپووری خۆی تەنها ئەوانە لەیادەوەریی خۆیدا دەهێڵێتەوە کەپتەوترین‌و جوانترینی ئەزموونە کەلتوورییەکانی پێکدەهێنن.

ئەو کەلەپوورەی دەیزانین هەرچۆن بێت‌و ئەگەر ئەوەی دەیزانین لە دە بەش بەشێکی ئەزموونەکانی مرۆڤیش نەبێت، دواجار مرۆڤ هەر ئەو توانایەی نابێت کەدوای هەموو شتەکان بکەوێت، وێڕای هەموو ئەو بزربووانە دەبینین هێشتا سەرگوزەشتەی مرۆڤ پڕو ئاخنراوەو بەشمان دەکات.

## ٤ـ لانکەکانی ژیار

### ئاسیای ناوەڕاست – ئەناو – هێڵەکانی بڵاوبوونەوە

جێی خۆیەتی ئەم بابەتەی کە بەپرسیار ئاخنیومانە هەر بەکۆمەڵێك پرسیار کۆتایی پێ بهێنین کەوەڵامیان نییە، ژیار لەکوێوە دەستی پێکرد؟ ئەمە پرسیارێکە وەڵامی ئاسان نییە، ئەگەر بەبۆچوونی جیۆلۆجیکەکان بێت کەلێکۆڵینەوەکانیان لەمەڕ چاخی بەر لەمێژوو، بەجۆرێك تەمومژاوییە تەمی میتافیزیکیان تێپەڕاندوە، بەقسەی ئەوان دەبێت بڵێین ناوچە وشکو بیرینگەکانی ئاسیای ناوەڕاست ڕابردوویەکیان هەیە پڕ ئاوو پڕ هەوای میانە (نەسارد نەگەرم)، هەروەها پڕ لەدەریاچەی مەزن‌و ڕووباری زۆر[20]، کەهەموو ئەو

---

[1]

ئاوانه لەدواهەمین شەپۆلەکانی بەستەڵەکدا پاشەکشەیان کردووەو پەیتا پەیتا وشك بوونەتەوە، هەتا وای لێهاتووە ئێستا ئەوەندە باران بەسەر ئەو ناوچانەدا نابارێت بەشی دروستبوونی شارو دەوڵەت بکات. وای لێهاتوە شارەکان یەکە یەکە پاڵ بەخەڵکەکانیانەوە دەنێن، بەجۆرێك خەڵکەکانیان بەرەو ڕۆژاواو ڕۆژهەڵاتو باکوورو باشوور بەدوای ئاودا هەڵدێن، هێشتا داروپەردووی هەندێك شاری وەك بەکترا دەبینین گەنیوەی ڕۆچۆتە ناو لمی بیابانەوە. گومانیش لەوەدا نییە کەدەبێت باکترا زۆر فەرەباڵغ بووبێت لەدانیشتواندا بەپێی ئەو پانتاییەی داگیری کردووەو گەتیرەی ڕووبەری شارەکە خۆی دەدات لەبیستو دوو میل، لەسەردەمێکی زۆر نزیکیشدا (ساڵی ١٨٦٨) ئەوە ڕوویداوەتەوە کەبەشێك لەخەڵکی تورکمانستانی ڕۆژاوا، نزیکەی ٨٠٠٠٠ کەس، بەپەلە لەناوچەکانی خۆیان کۆچیان کردووە چونکە لمی بیابان شاڵاوی بۆ ناوچەکانیان هێناوە[٧١]. زۆر کەس بڕوایان وەهایە کەئەو ناوچانەی ئەمڕۆ ڕوو لەنەمانو پووکانەوە دەکەن، یەکەمین هەنگاوە بنەڕەتییەکانی پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە بینیوە، واتە ئەو تێکەڵە پێکهاتووە لەسیستەمو خۆراكو نەریتو ئیتیكو خۆشڕابواردنو کەلتور کەژیاریان لێ پێکدێت[٧٢].

بامبلی لەساڵی ١٩٠٧دا لەئەناو (باشووری تورکمانستان) هەندێك ئاسەواری کووپەڵەی تری دۆزییەوە کەبەڵگەن لەسەر کەلتوورێکی زۆر کۆن کە ئەو گەڕاندیەوە بۆ ٩٠٠٠ پ.ز. ڕەنگە لەو مەزەندەیەیدا هەندێك زیادەڕەویی کردبێت، بەڵام ئەگەر کردبێتی چوار هەزار ساڵی پێوەناوە[٧٣]، ئەوەتا لێرە کشتوکاڵی گەنمو جۆو گەنمەشامی دەبینین، بەکارهێنانی خەڵكوماڵیکردنی ئاژەڵ دەبینین، نەخشاندنی کووپەڵە دەبینین بەشێوەیەك کەجۆرێك لەلێکچوون هەیە لەنێوانیاندا وەك ئەوەی چەند بنەمایەکی هونەریی دیاریکراو هەبووبێتو ئەوەش بەڵگەیە لەسەر خڕبوونەوەی کۆمەڵێك نەریتو ئەزموونی هونەری لەماوەی چەندین سەدەی پێش مێژووی ئەو دۆزراوانەدا[٧٤]، پێدەچێت کەلتووری

تورکستانی ساڵی ٥٠٠٠ پ.ز چەند قۆناغێکی تێپەڕاندبێت، ڕەنگیشە ئەو کاتە ئەوان مێژوونووسی وەهایان هەبووبێت کەلەڕابردووی خۆیان کۆڵیبێتەوە بۆ ئاشکراکردنی ڕەچەڵەکەکانی ژیارو، فەیلەسووفی وەهایان هەبووبێت ڕاشکاوانە شینی ئەو کارەساتانەیان گێڕابێت کەبەسەر رەگەزی مرۆییدا دێن‌و لەناوی دەبەن.

ئەگەر لەو کاتانەدا کەزانیاریی دروست خۆیان بەدەستەوە نادەن دوای خەیاڵی خۆمان بکەوین، ئەوە دەڵێین لەم مەڵبەندەوە خەڵك کۆچیان کردووە —لەدەست ئەو وشکییە رایانکردووە کەتووشی خاکەکەیان بووەو لەدەست بێبارانی‌و وشکهەڵاتنی زەوییەکانیان باریان کردووە- ئەوسا بەسێ ئاڕاستەدا ڕۆیشتوون، هەرچی هونەرو دابی ژیارتیش هەیە لەگەڵ خۆیان هەڵیانگرتووە، جا ئەگەر چاکەکانیشان نەگەشتبێت، هونەرەکەیان گەیشتۆتە چین‌و مەنشوریاو ئەمریکای باکوور لەڕۆژهەڵاتەوە، لەباشووریشەوە گەیشتۆتە باکووری هیند، دواتریش لەڕۆژاواوە گەیشتۆتە وڵاتی ئیلام‌و سۆمەرو میسر، بگرە ئیسپانیاو ئیتاڵیاش[٧٥]، لەسۆزا (ئیلامی کۆن‌و فارسی نوێ) چەند شوێنەوارێك دۆزراونەتەوە کەلەشێوەدا لەشوێنەوارەکانی ئەناو دەچن، لێکچوونێك کەدەبێتە پاساو بۆ خەیاڵی مرۆڤ گریمانەی ئەوە بکات پەیوەندیی کەلتووریی لەبەرەبەیانی ژیاردا (واتە دەوروبەری ٤٠٠٠ پ.ز)[٧٦] لەنێوان سۆزاو ئەناودا هەبوبێت، هەروەها لەهونەرو بەرهەمە کۆنەکاندا لێکچوونێکی لەو بابەتە لەنێوان وڵاتی میزۆپۆتامیاو میسری بەر لەمێژوودا دەبینرێ کەئەویش ئەگەری هەبوونی پەیوەندیی لێدەکەوێتەوە لەنێوان ئەو دوو هەرێمەدا، هەبوونی پەیوەندیش بەڵگەیە لەسەر گرێدرانەوەی ڕەوتی گەشەی ژیاری بەقۆناغەکانی بەر لەمێژووەوە.

خۆ مەحاڵە تەواو لەوە دڵنیا بین کام لەو کەلتوورانە یەکەم جار سەریان هەڵداوە، ئەوەش زۆر گرنگ نییە، چونکە هەموو ئەو کەلتوورانە لەبنەڕەتدا ئەندامانی یەك خێزانن‌و سەر بەیەك جۆرن. جا ئەگەر بۆمان هەبێت

پێچەوانەی بۆچوونی زاڵ ڕابووەستین کەلەبەر کۆنییەکەی ڕێزێکی پەیداکردووە، بەجۆرێك کە ئیلام و سۆمەر بخەینە پێش میسرەوە، ئەوە کارێکی بێهوودە ناکەین تەنها بە مەبەستی دژایەتیکردنی شتی زانراو، بەڵکو لەوەدا پشت بەڕاستییەك دەبەستین کەتەمەنی ئەو زیارتییانەی ئاسیا ئەگەر لەگەڵ ئەوانەی ئەفەریقاو ئەوروپادا بەراورد بکرێت، تا زانیاریمان لەبارەیانەوە زیاتر بێت دەبینین ڕیشەیان زیاتر بەرەو قووڵایی چاخەکان دەچێت. خاکەنازەکانی زانایانی شوێنەوارناسی پاش سەدەیەك خۆڵ هەڵدانەوە لەکەنارەکانی نیلدا وردە وردە لەڕێی سویسەوە ملیان بەرەو دورگەی عەرەب و لەوێوە بۆ فەلەستین و میزۆپۆتامیاو وڵاتی فارس نا، لەگەڵ هەر هەنگاوێکی ئەو ڕێگەیەشداو شانبەشانی زۆربوونی ئەو مەعریفەیەی لەلێکۆڵینەوەکانەوە دەستمان دەکەوێت، ئەگەری ئەوەمان لەلا زۆرتر دەبێت کەخاکە بەپیتەکەی ناوچەی جزیرە لەنێوان هەردوو زێکەدا (میزۆپۆتامیا) ئەوەندەی ئێمە بزانین شوێنی یەکەمین دیمەنەکانی شانۆی مێژوویی ژیاری مرۆڤن.

# THE STORY OF CIVILIZATION

**ئەم کتێبە**

زێدەڕۆیی نییە گەر بڵێین کتێبی "مێژووی شارستانێتی" گەورەترین گەشتە بەناو ژیار و شارستانێتیی مرۆییدا، هەر لە ژیارە سەرەتاییەکانی مرۆڤەوە تا ژیاری گریك و ڕۆمان و سەدەکانی ناوەڕاست و چاخی ڕینسانس و سەردەمی ڕۆشنگەری و تا دەگاتە سەدەی بیستەم.

ئەم کتێبە بەتەنها بریتی نییە لە تۆمارێکی مێژوویی بۆ ژیار و شارستانێتی، بەڵکو گەشتێکە بە نێو دونیای ئایین و فەلسەفەو زانست و ئەدەب و هونەریشدا.

کتێبێکە تائێستا بۆ زۆربەی زمانەکانی دونیا وەرگێڕراوە و سەرچاوەیەکی ڕۆشنبیریی گرنگە و دەکرێ بڵێین ئینسایکلۆپیدیایەکی گشتیی مێژووی مرۆڤایەتییە و پێویستە لە هەموو کتێبخانەیەکدا هەبێت.

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بەدوای یەکدا بەرگەکانی تری ئەم کتێبە دەخاتە بەرچاوی خوێنەران.

بەرگسازی: قادر میرخان




لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم